# ئــــەمــن
# چراكان دەكوژێنمەوە

**زۆیا پیرزاد**

**وەرگێڕانی**

**ڕەسووڵ وەیسی**

**پێداچوونەوەی**

**ڕەهبەر مەحموودزادە**

وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی
گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **ئەمن چراکان دەکوژێنمەوە**


- **نووسینی: زۆیا پیرزاد**
- **وەرگێڕانی لە فارسییەوە:** رەسوول وەیسی
- **پێداچوونەوەی:** رەهبەر مەحموودزادە
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** جێگر عەبدولجەبار
- **نرخ:** ٣٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠١١
- **تیراژ:** ١٠٠٠دانە
- **چاپخانە:** وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٦٩٢)ی ساڵی (٢٠١١) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٦٤٣)**

**ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی**
**رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە**
**www .Kurdchap.com**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

**پێشکەش:**

**بە کاکە «رەهبەری مەحموودزادە» جێگری بە ئەمەک و بە توانای شاعیر و نووسەری جوانەمەرگ «مارف ئاغایی.»**

# ١

دەنگی ئیستاپی پاسی قوتابخانە بەرز بۆوە. پاشـان سـیڕەی دەرگـە ئاسـنەکەی حەوشـە و ترپەی راکردن لە رێگە بەرتەسکەکەی جەرگەی* چیمەنەوە. پێویستی بەوە نەبوو لە کاتژمێرە دیوارییەکەی چێشتخانە ورد ببمەوە. چوار سەعات و چارەگێك لە نیوەڕۆ لای دابوو.دەرگـەی ماڵ کەوتە سەر پشت. دەستێکم بە بەرەڵبێنەکەمدا هێنا و بـەرز گـوتم «سـەر* دڕ داکەنـدن، دەست و چاو شوردن. جانتا تـووڕ نادەینـە جەرگـەی دالآن.» قوتـووی دەسمـاڵ کاغەزییەکـەم کێشایە جەرگەی مێزەکە و بە مەبەستی شیرئانین زۆڕیامە لای بەفرگر، دیم چوار کەس لەبـەر دەرگەی چێشتخانە وێستاون. گوتم «سلاو. نەتانگوتبوو میوانتان هەیە، هـەتا سـەردڕەکانتان دادەکەنن بەرشێوی* دۆستەکەشتان حازر دەبێ.» گوتم خوایە زۆر شوکر کە هەر میوانێکیـان لەگەڵ بوو. چاوم لەو کیژە بوو کە لەنێوان ئارمینە و ئارسینەدا دانەدەسەکنی. لـە دوانـەکان باخۆشتر بوو. لە نێوان دوو رووومەتی سوور و چەرموو و گۆشتندا، لەڕ و رەنگزەرد دەینوانـد. ئارمەن چەند هەنگاو لەولاتری وێستابوو. جاجکی* دەجاوی و دە قژە درێژەکانی کیـژە رامـا بوو. کراسە چەرمووەکەی لە شـالۆاری هـاتبووە دەر و سـێ پشـکۆژی* سـەرەوەی والآببـوو. پێدەچوو رۆژان ئاسا ئاوقـای یـەکێك بووبـێ. قـاپ و شـەربەی چـوارەمم نایـە سـەر مێـز و لەبەرخۆمەوە گوتم هیوادارم دیسان بانگ نەکرێمە قوتابخانە.

ئارمینە هەستایە سەر پەنجە و دەستی خستە سەرشانی کیژەکە. «لـە نێـو پاسـدا لەگـەڵ ئێمیلی ئاشنابووین».

ئارسینە دەستێکی بە قژی ئێمیلی دا هێنا. «تازە هاتوونەتە جی چوار.»

ڕۆلێکی ترم لە قاپی نانەکە دەرێنا. چۆنە شرە و برەیـان گواسـتۆتەوە و ئـەمن ئاگـاداری نەبوومە؟ جی چوار ماڵێك بوو لەوبەر شەقام، هەمبەر ماڵەکەی ئێمە.

ئارمینە بیرمی خوێندەوە «ماڵیان دوێنێ هاتووە.»

ئارسینە گوتی «هەر ئەوکاتەی کە ئێمە لە یانەدا بووین.» ئـەوجار هـەرتك لـە کیژەکـە وردبوونەوە.

خوا هەر بۆخۆی دەزانێ قەراخ گیرفانی ئارمینە ئـەوە چـەند جـار بـدڕێ. «ماڵـە سـووفی دەپێشدا لە جی چوار بوو.»

نەمدیبوو، بەڵام دەمزانی قەراخ گیرفانی ئارسینەش هەڵوەشاوە. « دایکی سـووفی پـووری نینایە.»

بەندی پێسیرە* چەرمووەکەی ئارمینە واڵا ببۆوە. «ئاپۆ گارنیك باوکی سووفی ـــــ »

ئارسینە بەندی پێسیری خۆی کردەوە. «ئەی چەندە خۆشە. وەنییە ئارمینە؟»

ئارمینە سەری توند راوەشاند «هێندە پێدەکەنین ئاخری لە دەستانی دیق دەکەین.»

پێسیری هەر دوویانم کردەوە و چاوم لە کیژەکە بوو کە هێندە هۆشی لای دوانەکان نـەبوو. هەر دوو دەستی لە پشتەوە تێك خستبۆوە و سیلەی چاوی دابووە دەور و بەری لێوی. رەنگـی پەمەیی بەخۆوە گرتبوو. دەتگوت سووراوی تێ سووە. چوارەمم لە نێـوە راسـتەوە دوو قـاش کرد و گوتم «دەست و ـــ چاو ـــ شوردن .»

کە وەدەر کەوتن لایەنی رەشبینی زەینم پـەڵپی پێگـرتم. کیـژە بـەو وردبینییـەوە لەچـی دەڕوانی؟ نەکا شوێنێ پیس و پۆخڵ بێ؟ نەکا چێشتخانەی لە لا کرێت یا سەیر بووبێ؟ لایەنی گەش بین دە هانامەوە هات. پێدەچێ چێشتخانەکەت فرە بێسەرە و بەرە بێ بەڵام قەت پیس و پۆخڵ نییە، سەرەڕای ئەوە رای کیژۆڵەیەك ناشێ گرینگییەکی ئەوتۆی بـێ. پـەنیرم لـە کـەرە هەڵسوو، بابۆڵەکەم خستە نێو قاپی چوارەم و دە دوورەوە روانیم. چاوم بڕییە گوڵە وشك کـراو و گۆزەڵە زەردە گلینی یەکانی سەر قەفەزەکان و ئاڵقەگەلی بیبەری سوور و سـیرێکی کـە بـە دیوارەوە هەڵمواسیبوون. لایەنی گەشبین دڵی دەدامەوە. هەموو ئەوانە و تەواوی ئەو شـتانەی کە لە چێشتخانەی دیتراندا دەسناکەوێ و لە چێشتخانەکەی تۆدا بەرچاو دێ، بۆخۆت جوانە و تەنانەت ئەگەر دایك و خوشك و دۆست و ناسیاو بکەنن و بێژن چێشتخانەی کلاریس هـەروەك کۆلیتی* جادووگەرەکەی چیرۆکی «هێنزێل» و «گێرتێل»ی لێهاتووە، نابێ لەبەر وتەی دیتران سەلیقەکەت بگۆڕی و نابێ لە وتەی خـەڵك دڵمەنـد بـی و نابـێ — چـاوم وە گوڵـدانی سـەر قەڕنیزەکەی* بەر پەنجەرە کەوت. دەبووا گڵەکەییم گۆڕیبا.

ئارمەن بە دەست و چاوی شۆراوە زووتر لە کیژەکان زۆریاوە چێشتخانە. سەری تەڕ کردبوو و نواندبوویەوە سەر سەری. قژەکانی پێشەوەشی داهێشتبووە نێوچاوانی. کراسە رەشە کەشخەکەی کە وێنەی بەرانێکی شاخ درێژی بەسەر سینگییەوە بوو لەبەر کردبوو. دەتگوت بیرئانینەکانی رۆژانە وردە وردە کاری خۆی دەکرد و کوڕە پازدە ساڵانەکەم فێر دەبوو پاك و خاوێن و رێکوپێك بێ. خۆزیا دایکم لێرە بووایە و دیبای.

شیرم دە شەربە کرد و گوتم «خۆزیا «نانی» لێرە بووایە و دیبای.»

شەربەکەی راکرد. «چی دیبا؟»

لە هەمبەری دانیشتم، دەستم خستە ژێر چەناگەم و تێی رامام. «دیبای کە نەوەکەی هەر بۆ یانە و چوونە میوانی نییە کە قژی دادێنێ و بەرگی پاك و خاوێن دەپۆشی. گوێ رایەڵ بووە و لە ماڵەوەشدا رێکوپێکە.» هەتا دەستم راداشت کولمەی بلاوێنم، زووەکی سەری کێشاوە دواوە. «مەکە! قژم شیوا» بۆ ماوەیەك دەستم هەروا لە حەوادا ماوە. پاشان خوێدانەکەم لەسەر مێز راکرد کە پێویستیم پێی نەبوو.

ئارسینە و ئارمینە دەستی ئێمیلیان گرتبوو و رایاندەکێشا.

«وەرە! شەرمێ مەکە. وەرە!»

ئێمیلی لەمن راما، چاوە گەورەکانی لە دوو هەڵماتی* رەش و درەوشاوە دەچوو. بە دەم بزەوە خولقم کردە ژوور. ئارمەن لە پشت مێز رابوو و ئەسکەملەکەی* بۆ ئێمیلی کێشا دواوە واقم وڕما ئەم ئیشە یەکێك لەو بیر ئانینانەی رۆژانە نەبوو.

ئارمینە و ئارسینە وەك هەمیشە نێو بە نێوە دەدوان.

«ئێمیلی هاوڕێی باوك و دایە گەورەی هاتۆتە ئابادان.»

«خۆزیا قژی ئێمەش وەك قژی ئێمیلی لێك و لووس بووایە.»

«ئێمیلی سێ ساڵ لە ئێمە بە تەمەنترە.»

«ئێمیلی جاران دەچووە قوتابخانەی مەسجد سولێمان.»

« لە لەندەنیش چۆتە قوتابخانە.»

« لە کەکلەتەش هەر وەتر.»

ئارمەن دایە پێکەنین، «گێژی خودای کەکلەتە نا، کەلکەتە.»

دوانەکان وەرووی خۆیان نەهێنا.

« دایە، چاچاو دەستی ئێمیلی چەند سپی و سۆڵە.»

«شێوەی دەستی راپۆنزێلە.»

ئارمەن کە خێسەی لە ئێمیلی دەکرد، دیسان دایە پێکەنین و دوانەکان ئەمجارە گەشـانەوە. بەر لەوەی قسە و باسێك بێتە گۆڕێ گوتم «راپۆنزێل بووکڵەی ئارسینەیە.»

ئارمینە گوتی «خۆمان لە پاسدا ئەوەمان گوت.» دوایین قـومی لـە شـیرەکەدا و شـەربە بەتاڵەکەی بۆ لای من راداشت.

ئارسینە قەپاڵێکی لە بابۆڵەکە داگرت و بە دەمـی تەژییـەوە گـوتی «بۆیـە هـاتووە کـە ــــــــ»

ئارمینە گوتی «کەمۆکەیەك چاوی بە راپۆنزێل بکەوێ و زوو بگەڕێتەوە. تکایە شیر.»

شیرم بۆ ئارمینە تێکرد و بە ئارسینەم گوت «بە زاری تەژییەوە قسە ناکەین.»

ئارمینە قومێکی شیر خواردەوە. «ئەگینا ئێمیلی بە بێ ئیزن ناچێتە ــــــــ »

ئارسینە گوتی «دایە گەورە شەڕی ــــــــ »

هەردوو بە یەکەوە قیژاندیان «وە ە ە ی!» و دە ئێمیلی رامان. دەور و بەری لێوی ئارمینە سپی هەڵگەڕا بوو.

دەسماڵ کاغەزییەکم لە قوتووەکە دەرکێشا، وە دەستی ئارمینەم دا و گوتم «دەور و بـەری لێو.» ئەوجار رووم لە کیژەکە کرد. « بە دایە گەورەت گوتووە کە ــــــ » لە زەنگیاندا.

ئێمیلی تێکڕا بوو.

لە جەرگەی دالانەکەدا بووم کە دووبارە زەنگیان لێدا. کیفی منـدالان لـە گـۆڕێ بـوو بـە سەریاندا بازم دا و دەرگەم کردەوە.

لەو بەرزاییەی کـە چـاوەڕێ بـووم کەسـێ ببیـنم کەسـم بەرچـاو نـەهات. سـەرم زۆرتـر داهێشتەخوار هەتا بینیم. کورتەبالا بوو. زۆر کورت، تا ئانیشکم دەهـات. جـل و بـەرگێکی سەردڕئاسای گوڵداری لەبەردابوو و پڕۆێنێکی دەسچنی رەشی لە پشتی بەستبوو. ملوانکـەی مرواری سێ ریزی لەمل کردبوو. بۆقێك لە ناو چیمەنەکە دا قیڕانـدی و ئافرەتـە کورتەبالاکـە هاواری کرد «ئێمیلی لێرەیە؟»

هەراسان بووم. «ئەی لەچنگ ئەو مندالانە. قەت گوێ نادەن بە قسان.»

چنگی لە ملوانکەکە داگرت. «لێرە نییە؟»

گەڕاوە کە بڕوا گوتم «لێرەیە! هەنووکە تێگـەییم بـە بـێ ئیزنـی ئێـوە هـاتووە. بێشـك نیگەرانیش بوون.»

ملوانکەکەی بەرداو چاوی لێك نا «منداڵی بێ ئاوەز »

گوتم « هەقتان پێدەدەم. ئەمنیش بوومایە بە پەرۆش دەبووم. کەرەمکە وەرە ژووری.»

چاوی هەڵێنا، سەری بەرز کردەوە و هەر وەك تازە دیبمی زەق چاوی تێبڕیم. پاشان تونـد دەستی بە قژی داهێنا کە لە پشت سەرییەوە گرێیـدا بـوو. « ببـوورە. ئـەو منداڵـە گەوجـە هۆشمی شێواند.» سەر لەبەری قژی چەرموو بوو.

دەستی راداشت « ئێلمیرا سیمونیانم. دایە گەورەی ئێمیلی.»

بۆقەی نادیار دووبارە قیڕاندی و ئەوجار بۆقێکی تـر بـە قـیڕەی بـەرزتر لەبـەری گێـڕاوە. پەشۆکام. رەنگبێ هۆیەکەشی هەر بەژن کورتی دایە گەورەی ئێمیلی بوو یا ملوانکەی مرواری لە سەعات چواری دوا نیوەڕۆیان لێچکەی پەشمی لەو هەوا گەرمەدا یا ئاخاوتنی زۆر یاسایی. یان بەڵکو دەنگی بۆقە نەعلەتییەکە کە بە دوای ئەو هەموو ساڵ مانەوە لە ئابادان نە خـووم بەسەر و سەکوتیان گرتبوو نە بە دەنگیان. دەستێکم بە پژوێندا هێناو بردمە پێش. «کلاریسم ـــــــ ئایوازیان.» ئەی من بۆچی وەك ئەم بوونەوەرە کورتە دەئاخۆتم؟

دەستمی وەها کوشی کە ئاڵقەی دەزگیرانیم پەنجەی ئێشاند. چاوەکانی چکۆڵە کردەوە. «لە ئایوازییانەکانی جۆلفا؟» چین و چرووکی دەور و بەری چاوی یەك رادە و یەك چەشن بـوون وەك ئەوەی یەکێك زۆر بە سەرنجەوە زاخاویدا بێ. دایکم دەیگوت « بۆچی وەك هـەموو تافرەتێـك ئاڵقەکەت دە دەستی چۆپەت ناکەی؟»

گوتم « ئایوازیان خزمی شووەکەمە. لە ئایوازییانەکانی تەورێزە.»

دایکم لە ئیسفەهان لە دایك بووە. ئارشالووس وسکانیان. دەیناسی؟» خوشکم پێدەکەنی. « ئەدی خەڵك لەچی را بزانن کلاریس خاتوون وەئافرەتانی تر ناچێ؟»

دیسان دەستی بە قژیدا هێنا. « ئەگەر نازناوەکەی بزانم رەنگبێ بیناسم. گەلێك سـاڵ لـە جولفا دا نەماومەوە.»

وە منگە منگ کەوتم ، ئەو نازناوانەی هەرمەنیەکانی جولفای ئیسفەهان لەیەکتریان دەنا زۆریشی لە رووی رەسەن خاسییەوە نەبوو. بە باوە گەورەی دایکمیان دەگـوت «میـاك»ی دەم بە هاوار کە دیارە پێم خـۆش نـەبوو هـەموو ئـەوە تێبگـەن. بـە خۆشـییەوە هاوسـێ بـەژن کورتەکەشم هێندە چاوەڕوانی وەڵام نەمایەوە. پێدەچوو وازی بەسەر چووبێ. «تکایە ئێمیلـیم بۆ بانگ بکەن، کارم زۆرە.»

رێگەم بۆ کردەوە. « تکایە کەرەمکە ژوور. لەگەڵ منداڵان بەرشێو دەخوا.»

جـارێـکی تر چنگی لە مـلـوانـکـە مـرواریـیـەکە داگرت. «بەرشێو؟»
ئەمجارە ئیدی هیچ بۆقێك نەیقیڕاند بەڵام دیسان هەر پەشۆکام. بابۆڵەی بـە کـەرە و پـەنیر لەگەڵ شیر.» بۆچی باسم لێوە دەکرد؟
چاوی شۆڕ کردەوە و دە خاچە چکۆڵەکەی ملم راما. «پەنیری پێخۆش نییـە. شیرەکەشـی بێشك دەبێ گەرم بێ، لەگەڵ دوو کەوچکە هەنگوین.» دیسان خەریك بوو هاواری دەکرد.
هەستم کرد دەرمانم بە سەهوو داوە بە نەخۆشێك. بەر لەوەی قسەیەك بکـەم هاتـە ژوور، سێ جار بەسەر کیفەکاندا بازیدا و خۆی گەیاندە چێشتخانە، جانتاکانم بە لاقی وەلا نـا و بـە دوایدا چووم.
ئێمیلی بـە دیـوارەوە مـەڵاس ببـوو زەخـتی* لەشـە شـۆخ و شـەنگەکەی خـەریك بـوو وێنەگەرییەکەی "سایات نوا"ی دەدڕاند لایەکی دەم و چـاوی شـاعیرەکە دە لای ئێمیلـی دا بوو. ئەوەم بە زەین گەیی کە ئەوینەکەی سایات نوا کە لە هەڵبەستەکاندا بە «گۆزەل» نـاوی دەبا، بێشك شێوەی چۆتەوە سەر ئێمیلی. دایە گەورە ئەوجارە ئیدی هەر بە راست هاواری کرد «ئەگەر لە پەنجـەرە را نەمـدیبا هاتوویـە ئێـرە دەبووایـە دیسـان بـە دەور و بـەری شـاریدا خولابامەوە؟»
دوانەکان دەم ئاوەڵا چاویان لێدەکرد و ئارمەن وا دە ئافرەتـە کورتـە باڵاکـە رامـابوو کـە دڵنیا بووم هەنووکـە پێدەکـەنێ. بـۆ ئـەوەی سـەرنجی ئارمـەن بـۆ شـتێکی تـر رابکێشـم و قسەیەکیشم کردبێ گوتم « ئێمیلی ، ئەی بۆ نەتگوت پەنیر و شیری ساردت پێخوش نییـە؟» سەرنجی هەموو لایەك بەرەو دەوری و ئاوخۆری بەتاڵ راکێشرا. بێ دەرەتان چـاوێکم لـە دایـە گەورە کرد. « ئەگەر منداڵەکان بە یەکەوەبن ______»
بێ ئەوە سەرنجێك وە قسەکەم بدا رووی دە ئێمیلی کرد و گۆڕانـدی « وەپێشـم کـەوە!» و کێژۆڵەکە وەك کەروێشکێکی کە پێو شوێنیان هەڵگرتبێ دەلینگانی وەرێنا و لـە چێشـتخانە دەرکەوت.
دەرگەی ماڵم داخست و لەو لایەی پشت دەرگە تۆڕییەکەوە چاوم لێیان بوو. دایـە گـەورە لەو سەری رێگە باریکەکەی جەرگەی چیمەنەکە، نزیك ئەو پەڵە باغچەیەی کە گوڵە نمرەییمان تێدا چاندبوو، دەستی هەڵێنا و زللەیەکی توندی خێواندە* پشت ملـی نەوەکـەی، گنجـەکانی تۆڕەکەم راس و ریس کرد، بە دالاندا تێپەڕیم و بـیرم لـەوە دەکـردەوە خۆزگـا منداڵـەکان لـە پەنجەرەی چێشتخانەوە نەیاندیبا کە دۆستەکەیان وێی دەکەوێ.

ئارمینە وەسەر ئەسکەملی چێشتخانە کـەوتبوو و سـگی رەپـێش خسـتبوو. رووی دەلای ئارسینە کرد و دەنگی لێهەڵێنا «وەپێشم کەوە!» هـەر سـێکییان  دایانـە پێکـەنین، هەرچـی حەولم دا نەکرا پێنەکەنم. بەژنی زۆر لە خاتوون سیمۆنیان کورتتر نەبوو و لاسـایی کردنەوەشـی وەك هەمیشە شاکار بوو.

# ٢

ژووری خەوی دوانەکان بۆی هەمیشەیی لێدەهات. بۆییێکی شیرین. بۆییێکی خـەو هێنـەر. ئارتووش دەیگوت « بۆی میزی منداڵ.» ژووری ئارمەن لەمێژ ساڵ بوو بۆی میـزی منـداڵی لێنەدەهات.

ورچە تووکنەکەی ئارمینەم کە هەر خوا دەزانێ بۆ ناوی "ئیشی" بوو و شەوانە هـەتا لـە باوەشی نەگرتبا نەدەخەوت و شەو نا شەویك ون دەبوو، لەژێر دەرگەی پیانۆکـەدا دۆزییـەوە و بردم دەباوەشیم هاویشت. دەست و پێی درێژ و لەڕی راپۆنزێلی قژ بۆرم کە هاو ناوی قارەمانی چیرۆکەکانی شازادەی قژ زێرین بوو راست کردەوە دام بە ئارسینە. دەچووم پەردەکە دادەمـەوە کە لەسەر فەرشەکەدا لاقم وەشتێك کەوت. داهاتمەوە "یۆیۆ"یە دارینەکەم راکرد. دوانەکان کە دەیانگوت «حەقایەت حەقایەت» پێم گوتن شەکەتم و وازی حەقایەت گوتنم نییە. لە جێگای ئەوە سبەی دەشێن لە حەساریێ گوڵ برِنن و بۆ مامۆستا خۆشەویستەکەتان خاتوون "مانیا"ی ببەن ، بەو مەرجە گوڵەکانی تر پێشیل نەکەن، یۆیۆکەم دانایە نێو قەفەسـەی لەیسـتۆکەکان، پەردەم کێشا، ماچم کردن، شەو باشم پێگوتن و چوومە ژووری ئارمەن. لەسەر قەرەوێڵەکەی* خەریکی هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی گۆڤارێك بوو.

شـەلواری سـوورمەیی و کراسـی چـەرمووی قوتابخانـەم لەسـەر عـەرزی هـەلگرت و لـە دۆلابەکەدا هەلمواسی. هەتا ویستم مێزی نووسین راستە و پاستە بکەم خۆی گرژ کرد. لەسەر لێوی قەرەوێڵەکە دانیشتم و چاوم بـە وێنـەی مـەزن و رەنگییـەکانی ئـالێن دێلـۆن و رێمـی ئیشنایدێر داگێڕا کە بە پۆنیس لە دیواریدا بوو. لە ژێرەوەی وێنەکە بە خـەتتی نەسـتەعلیقی درشت نووسـرابوو: دەسـگیرانە نـەمرەکان. دیـاری نـەورۆزی تـاران مسـەوەر. چـاوی رێمـی

ئیشنایدێر کەم ڕەنگ و نیگا و پێکەنینەکەی سارد و سڕ بوو. گەرەکم بوو دەس درێژکەم و قژی ئالێن دیلۆن کە وەخت بوو بچنە چاوی وەلا بنێم. کەوتمەوە بیر "قژەکانم شێوا" و لە خۆمەوە بزەم هاتێ. پاشان بۆ هەزارەمین جار بە بن گوێی ئارمەنم گوت شاردنەوەی لەیستۆکەکانی دوانەکان ئیشێکی باش نییە و سەرەڕای ئەوەش نابێ لای خەڵك بە خوشکی بڵێ "گێژی خوای" هێندە لەگەڵی پێداچووم هەتا سەرچەفەکەی کێشایە سەر خۆی و گوتی «باشە، باشە، باشە.»

دەرگەی ژووری ئارمەنم پێوەدا، دوانە بانگیان لێکردم "دا ا ا ا یە." گەڕامەوە لایان. بەو دەرپێ چوارخانە زەرد و سوورانەی کە چەند حەوتوو لەمەو بەر لە بازاڕی کوێتییەکانم کڕیبوو، لەسەر چۆك دانیشتبوون.

ئارمینە گوتی « بۆچی دایە گەورەی ئێمیلی ـــــ » ئیشییەکەی بەبەر چاوییەوە گرت.

ئارسینە ڕستەکەی خوشکی تەواو کرد. « بەژنی ئەو هێندە کورتە؟»

هەموو شەوێ بۆ درەنگ نووستنیان بیانووێکیان دەدۆزییەوە، گوتم « سبەی شەو، سبەی شەو چیتان گەرەك بوو بۆتانی دەگێڕمەوە، ئێستا لا لا.»

ئارمینە ئیشییەکەی لەبەر چاوی وەلانا. « دەنا هەر نەبێ حەقایەتمان بۆ بڵێ.» دەستم لەسەر کلیلی کارەبا بوو. «نەمگوت شەکەتم؟ سبەی شەو.»

ئارسینە سەری خوار کردەوە « هەر حەقایەتێکی چکۆڵە.»

ئارمینەش سەری خوار کردەوە، « زۆر زۆر چکۆڵە.»

چاوم لێکردن. دەنێو قەرەوێڵەی یەك چەشن، بە سەرچەف و رووباڵنج و دەرپێگەلی وەکو یەك. وەك هەمیشە ئیدی تابم نەهێنا بە گاڵتە خۆم گرژ کرد و گوتم « زۆر زۆر چکۆڵە. باشە؟» هەردوو گوتیان « ئەی گیان!» خزینە ژێر سەرچەف و بە جۆش و خرۆشەوە چاوەنواڕ مانەوە.

دەستم پێکرد: « هەبوو نەبوو. دوو خوشك بوون کە هەموو شتێکیان وەك یەك بوو. چاو و برۆ، دەم و لووت، جانتای قوتابخانە، خواردەمەنی زەنگەکانی پشوو دان. ئەو دوو خوشکە رۆژێك ـــــ » دوانەکان هۆگری بیستنی حەقایەتگەلێك بوون کە لەخۆمەوە دروستم دەکردن و قارەمانەکانیشان خۆیان بوون. هێشتا خەریکی لێك دروونی زەوی و ئاسمان بووم کە پێلکەکانیان داهاتەوە. کۆتایی هەمیشەیی حەقایەتەکانم دووپات کردەوە.«سێ دانە سێو لە ئاسمانەوە بەربوونەوە ـــــ » ئارمینەی خەواڵوو گوتی « یەکێك بۆ وێژەر.» ئارسینە بە دەم

باوێشکەوە درێژەی پێدا «یەکێك بۆ گوێگر.» ماچم کردن و گوتم «یەکیش بۆ ـــــ » هەرسێ بە یەکەوە گوتمان « هەموو منداڵە گوێڕایەڵەکانی دنیا.»

چراکەم کوژاندەوە و لە ژوورەکە وەدەرکەوتم. لەنێو داڵان گوڵدۆزییەکەی سەر مێزم راستە و پاستە کرد. بێشك دوانـەکانیش هـەتا یـەك دوو سـاڵی تـر لـە کـۆڵ گێڕانـەوەی حەقایـەتی شەوانەیان دەکردمەوە. وەك ئارمەن کە لەمێژ ساڵ بوو چاوەڕوانی حەقایەتی لێم نـەبوو. پـێم وابوو کاتی ئەوەم دەبێ بەو کارگەلەی کە خۆم گەرەکمـە رابگـەم. لایـەنی رەخنـەگری زەیـنم پرسی «چ کارگەلێك؟» دەرگەی ژووری دانیشتنم کردەوە و گوتم « نازانم » و دڵم گیرا.

تەلەفزێون فیلمێکی دێکۆمێنتی لە پاڵاوتگە پێشان دەدا. ئارتووش لەنێو راحەتییـە سـێ کەسییەکەڕا، لاقی درێژ کردبووە سـەر مێزەکـەی پـێش راحـەتی و رۆژنامـەی دەخوێنـدەوە. لەپاڵی دانیشتم  و چەند چرکەسات سەیری لوولە و ئەستوون و ئەو کرێکارانەم کرد کە کـڵاوی پارێزەرییان لەسەر بوو. رۆژنامە هەڵدرایەوە و لاپەڕەی خوێندراوە کەوتە خـوار. چـەمامەوە، هەڵمگرتەوە و گوتم « چاوی لێناکەی ؟ شوێنی کارەکەت پێشان دەدەن.»

لەژێر لێوەوە گوتی « لە بەیانییەوە تا ئێوارە هەر شوێنی کارەکەم دەبینم. »

سەر دێڕە درشتەکانی هەواڵەکانی رۆژنامەم خوێندەوە: چـاوپێکەوتنی چـاوەڕوان نـەکراوی بالوێزی یەکیەتی سۆڤیەت لـە ئابـادان. هەڵبـژاردنی پاڕلمـان و پلانگـەلی شـەش بڕگـەیی. چێکردنی ماڵگەلی کرێکاری لە پیروز ئاوا. کردنەوەی ئەستێرکی* نـوێ لـە گـەڕەکی « سـێ گووشی بڕەیم » لاپەڕەکەم نوشتاندەوە. کام شتی ئەم هەواڵە نەخۆشی هێنەرانە بـۆ ئـارتووش دڵڕفێن بوو؟ لایەنی رەخنەگر حەڵاڵ حازر گوتی «پێوەندی بە کارەکەیەوەیـە ئـەوە یـەك، لـە هەولەوەش دەتزانی ئەوە دوو»، کەوتمەوە بیر ئەو سەردەمەی کە لە تـاران پێکـەوە دەسـگیران بووین. چەند جار لەسەر پێداگری ئارتووش بەشداری کۆبوونەوەکانی کۆڕی ئێـران و یەکیـەتی سۆڤیەت یا بە وتەی خەڵك وۆکس بوو بووم و هەموو جارێکیش وازم بەسەرچووبوو.

هەستام تەلەفزێونەکەم کوژاندەوە، چووم لە پاڵ پەنجەرە وەستام. سەیری شمشـادەکانم کـرد کە لە ژێر تریفەی مانگەشەو دا لێك و رێك و یەکـدەس بـە دەوری حەوشـە دا خولیـان دەدا. ئاغا مورتەزا رۆژی پێشتر رێکوپێکی کردبوون. کە چیمەنی حەوشەی درووییەوە شەربەتی ئاڵوو باڵووم بۆ برد. سوپاسی کردم و پاشان نووکاندی کە شـەش مـانگ لـەکاتی یاسـایی بـەڵێنی پێدانی پلەی سـەرتری تێپـەڕیوە، بـەڵام کارپێـدەری شـەریکەی نـەوت هێشـتا حوکمەکـەی پێنەداوە. لێمی ویست بـە ئـارتووش بڵـێم رای بسـپێرێ. «هـەر نـەبێ ئاغـای موهەنـدیس

سینیۆرە. خۆ قسەی ئێمەی کرێکاران پووشێك ناهێنێ.» ئەوجار نۆبە گەیشتە پرسیارەکەی هەمیشەیی «بۆچی موهەندیس لە بڕەیم ماڵ ناگرێ؟ ئاغای هاکووپیان کە مووچەی کەمتریش وەردەگرێ لە بڕەیم ماڵی گرتووە.» ئەو قسەیەی کە لەمێژ ساڵ بوو بە هەمووانم دەگوت — لە دایکم و خوشکم و دۆست و ناسیاوەوە بگرە هەتا ئاغا مورتەزا — دووپاتم کردەوە کە پلەی سەر و ژێر واتایەکی نییە و گەڕەك لەگەڵ گەڕەك هیچ جیاوازی نییە و ئێمە لەم ماڵەدا ئاسوودەین — و ئاغا مورتەزا وەك هەموو جارێ هەر گوێی هەڵخست، سەری راوەشاند و هەردوو لێوی مقەستە باغەوانییەکەی بە شاڵوارە فرەوانەکەی تایبەتی کارێیدا هێنا. دەستێکم بە پەردەی پەنجەرەکاند کێشا و هەوڵم دا وەبیرم بێتەوە دوایین جار کەی بووە پەردەکانم شوردووە. دوایی بیرم هاتەوە بە ئارتووش بڵێم « ئاغا مورتەزا تکای کرد - »

لاپەڕەی رۆژنامە هەڵدرایەوە. « هەق بەوە. لە زۆربەی سینیۆرەکانی کۆمپانیا گەلێ فرەتر شەکەت دەبێ.» وەك هەمیشە بە خەست و خۆڵی و گاڵتەجاڕانە ناوی سینیۆری هێنا. «سبەی وەبیرم بێنەوە بە خاتوون نووروڵڵایی بڵێم وەبیرم بێنێتەوە تەلەفۆن لە کار بەڕێوەبەر بکەم.»

تایەکی پەنجەرەم کردەوە و لە دڵی خۆمدا گوتم «ئاغاکەی ئێمە نۆکەرێکی بوو، نۆکەرەکەی ئەو خزمەتکارێکی بوو.» خاتوون نووروڵڵایی میرزای ئارتووش بوو.

لەو بەر شەقامەوە چراییەکی لە ژوورەکانی جی چوار هەڵبوو. لەو مەوداوە بە چاکی نەمدەدی، بەڵام چون ماڵەکانی بواردەی باکوور هەموو شێوەی یەکیان دەدا، دەمزانی ژووری دانیشتنە، جگە لە وێکچوونی ماڵەکان گەلی جار چووبوومە جی چوار لەو سەردەمانەدا کە نینا و شووەکەی گارنیك دانیشتووی جی چوار بوون، ئارتووش زۆر کەیفی بە گارنیك نەدەهات و زۆریش سەیر نەبوو، چونکە ئارتووش هەر کەیفی بە کەس نەدەهات، سەیرەکەی لەوە دابوو کە دایکم و زاواکەی هاوڕا بوون.

یەکەمجار کە ئارتووش و گارنیك دوو سەعات لە بابەت سیاسەتەوە دوان، بە دوای رۆیشتنی گارنیکدا ئارتووش گوتی «حیزبی داشناکسیۆن سەردەمێك پێشڕەو بوو. ئێستا هەلومەرج تووشی ئاڵوگۆڕ هاتووە. گارنیك بۆچی ئێستاش هەر بەردی داشناکەکان لە سنگ دەدا، نازانم.» دایکم گوتی «ئەمن کە زۆر چاك دەزانم. باوك و مامی گارنیك لە جولفا دا بە گاڵتەچی ناویان دەرکردبوو. بە مامیان دەگوت. ئارشاکە دەم هەراش » ئارتووش ئەم بە ئاکام گەیشتنە بێ جێیەی لە لا سەیر بوو بەڵام خۆی بە سەرەوە نەبرد. دوای رۆیشتنی دایکم گوتم گەلێك ساڵ بەر لە ئێستا باوکم دۆستێکی بوو کە ئەندامی حیزبی داشناکسیۆن بوو، گەلێك

بە دەماخ و قسە خۆشیش بوو. دایکم کەیفی بەو دۆستەی باوکم نەدەهات، زۆریش سەیر نەبوو دایکم کەیفی بە هیچکام لە دۆستەکانی باوکم نەدەهات.

سەیری پەنجەرەی جی چوارم کرد. تا شەش مانگ بەر لەمە کە نینا و گارنیك هێشتا نیشتەجێی جی چوار بوون هێندێ بەیانی یان یا ئەمن دەچوومە لای نینا یا ئەو دەهاتە لای من. قاوەمان دەخواردەوە و دەمە تەقێمان دەکرد. یەکێك هات لەبەر پەنجەرە وەستا. تەنیا هەر نسێیەکەیم دەدی، بەڵام لە بەرزی بەژنەکەی را پێ حەسیام ئێمیلی نییە، بێشك دایە گەورەشی نەبوو، کەواتە باوکی بوو.

ئەو شەوەم بیر هاتەوە کە هەر لەم ژووره میوان بووین و نینا لەکنەخۆ شێوی ئامادەی بۆ دانابووین. دایکم گوتی «خواردنی پاسترمە و کاڵباس و زبڵ و زاڵی زۆر بۆ لەش ساغی باش نییە.» گارنیك پێکەنی. «خاتوون وسکانیان چێشتی باش و خراپ یانی چی؟ رووی خۆش و قەست و نییەتی پاك و چیتر! ژنەکەی من نان و پەنیریشمان وا دەرخوارد دەدا کە پێمان وایە پلاو و کەباب دەخۆین. نییەت ئەگەر پاك بوو و دەم بە پێکەنین، ڤیتامینیش بە لەشی مرۆڤ دەگا.» قاقایەکی لێدا و دەستی خستە سەر شانە گۆشتنەکەی نینا کە لە پێکەنینان لەخۆ ببۆوە. دایکیشم خۆی گرژ کرد و بۆ رۆژی دوایە گوتی سەرسەری و بێ فکرینە! خوا دەرگە و تەختەی چاك رێکخستووە.»

زۆرم پێ گرنگ نەبوو ئەگەر گارنیك لایەنگری نەتەوەخوازانی هەرمەنی بێ و ئارتووش گوتەنی — ئەو سەردەمانەی کە دەکەوتە جۆش و خرۆش - « تێناگا بەرژەوەندی هەرمەنییەکانیش هەروەك زۆربەی دنیا تێکەڵاوییان لەگەڵ بەرەی گەلدایە.» ئەمەشیان گرنگ نەبوو کە نینا شڵەپەتەیە و دایکم گوتەنی وشتر بە بارەوە لە ماڵەکەیدا ون دەبێ. گرنگ ئەوە بوو کە نینا و گارنیك گشت ساتێ لەگەڵ یەکتر باش و بە دەماخ بوون و هیچکات نەمدیبوو دڵ ئێشیان لە یەکتر بووبێ. جارێکیان لەکاتی خواردنەوەی قاوە دا باس هاتە سەر ئارتووش و گارنیك، نینا گوتی « ئەوەت لەبیر نەچێ کە هی هەر دوویان هەر هاتەران پاتەرانە. بەڵام ئەمن هەموو دەمێ بە گارنیك دەڵێم خۆشەویستەکەم هەق بە تۆیە. ئەتۆش ئەشێ بێژییە ئارتۆش خۆشەویستەکەم بێشك هەق بە تۆیە.» قاقا پێکەنی، قومێکی قاوە خواردەوە و پاڵی وە پاڵگەی کورسیەکەدا. « پیاوەکان لایان وایە ئەگەر لەمەڕ سیاسەتەوە نەدوێن پیاوی پیاو نین.»

پشتم وەشیپانەی پەنجەرەوە دا و هەستم دەکرد دڵم بۆ پێکەنینەکانی نینا تەنگ بووە، سۆزی تەلەفۆنی لێدەکەم سۆراغێکی بگرم. چرای ژووری دانیشتنی جی چوار کوژایەوە. کەوتمەوە بیر، ئێوارە و رواڵەتی جارزو لەبەر دڵانی ئێمیلیم هاتە بەرچاو. کیژۆڵە لەو ماوە دوور و درێژە دا قسەیەکیشی نەکردبوو.

بەرەو پەنجەرە گوتم « هاوسێی تازە هاتوونە جێی نینا و گارنیك.»

رۆژنامە خشە خشی لێ پەیدا بوو « م م م.»

ویستم بچم چیمەن و باغچەکان ئاو بدەم، یەگجێ وەبیرم هاتەوە چراکانی حەوشە نایسێن. لە ترسی ئەوە نەوەکوو پێ لە مارمیلکەکان بنێم وازم لێ هێنا. دەبوو تەلەفۆنم بۆ خزمەتگوزاری کۆمپانیا کردبا یەکێك رێبکەن چراکان ساغ بکەنەوە. پەردەکەم کێشا و دیسان چووم لە پاڵ ئارتووش دانیشتم. « سیمۆنیان دەناسی؟ رۆژنامە گوتی «ئێمیل سیمۆنیان؟» پێوە گۆرەوییەکی چڵکنم لە ژێر یەکێ لە دۆشەگچەکانی راحەتیکەدا کێشا دەرێ. هی ئارمەن بوو. «ناوە چکۆڵەکەی نازانم.» پاشان بیرم کەوتەوە «رەنگە خۆشی بێ. ناوی کیژەکەی ئێمیلییە.» لاپەرەی رۆژنامە هەڵدرایەوە. « لە مەسجدسولێمانەوە گوێزراوەتە بەشەکەی ئێمەوە، ژنەکەی مردووە. لەگەڵ دایك و کیژەکەی دەژی. دوای گارنیك چاومان بەمەیان روون بۆوە.» سەیری رۆژنامەکەم کرد. چاوەڕێ بووم قسەکەی درێژە پێ بدا.

کە دیم چ نەبوو پێوە گۆرەوی بە دەس خزیمە نێو راحەتیە چەرمیەکە، لەبەر پەنجەرە دانیشتم. ماوەیەك گوێم لە دەنگی یەك هەوای کۆلێرەکان گرت، ئەوجار کتێبێکم لە قەفەسەی پاڵ پەنجەرەکە هەڵگرت کە ئاغای داوەتیان خاوەنی کتێبفرۆشی ئاراکس، لە تارانەوە ناردبووی. بابەت گەلێك بوون لە نووسراوەکانی ساردۆ. وەك هەموو ئەو کتێبانەی کە لە ئەرمەنستانەوە بە دەستمان دەگەیی رەنگی بەرگەکەی ناحەزو چاپەکەی خراپ بوو، مرۆڤێکی ردێن بزنۆکانە قاپوتێکی رەش لەبەردا پشتی دەو ژنە کردبوو کە لەسەر عەرزی چۆکی دادابوو، پێوە گۆرەوی بەر دەستمی گرتبوو. خستمە گیرفانی بەرەڵبێنەکەم.

دەستم بە گۆریەوە لە گیرفانمدا رەق هەڵات. ئەو رۆژەم بیرکەوتەوە کە بە دایکم و ئالیسم گوت «لەو ئافرەتانەی کە پێیان وایە ماڵداری هەر ئەوەیە لە بەیانییەوە هەتا شەو بەرەڵبێنە لێبدەن بێزم دەبێتەوە. مرۆڤ لەپێشدا دەبێ خۆی پاك و لەمەڕ جلوبەرگەوە پاقژ بێ.« لای خۆی پێم وابوو هەردووکیانم گرتۆتە ژێر تانە و تەشەرەوە. دایکم ئەگەرچی چەند ساڵ بەسەر مردنی باوکم دا تێدەپەڕی هێشتاش هەر رەشپۆش بوو و قژی رەنگ نەدەکرد و خوشکم لە شل

و شەپڕێوی و دەس بڵاویدا هاوتای نەبوو. دایکم بڕۆی هەڵتەکاند. «کەواتە ئاوها؟ یانی هەرکەس دەبێ هەر کارێك بۆخۆی بکا؟» زەردەخەنەیەکی هاتێ. « ئەدی بۆ ئەوکاتەی کە ئارتووش ئاگای لێ نەبوو بەرگی نوێت دەبەر کرد یا چوویە ئارایشتگەری یا گوڵت لەسەر مێز دانا لووتت هەڵدەقرچێنی؟ درۆ دەکەم بڵێ درۆ دەکەی.» ئالیسیش زەردەخەنەی هاتێ. بۆ وێنە تۆ هەمیشە لەبار و رێکوپێکی بە تەمای چی؟» پاش رۆیشتنی دایکم و ئالیس لە خۆمم پرسی «بە تەمای چیم؟» وەڵامی خۆمم داوە « نازانم ».

دەستم لەنێو گیرفانی بەرەڵبێنەکە دەرێنا و کتێبەکەم دانایەوە نێو قەفەسەکە. ماندوو بووم و وازی خوێندنەوەم نەبوو. ئارتووش رۆژنامەکەی تووڕ دایە سەر مێز و وێستا. خۆی لەبەر یەك کێشاوە و باوێشکی هاتێ. «ئەتۆ چراکان دەکووژێنیەوە یا ئەمن؟» رۆژنامە کەوتە خوار. سەیریم کرد. لە ماوەی حەفدە ساڵدا کێشی بیست کیلۆ لە زیادیدا بوو و قژە چڕو پڕو کرژەکەی ساف و تەنك ببوو. ردێنە بزن ئاساکەی کە ئالیس هەر بەم هۆوە پێی دەگوت «پڕۆفیسۆر» وەك ئەو سەردەمان رەش نەبوو. چەندە گۆڕا بوو. ئەوە بیرم لەوە دەکردەوە کە بێشك ئەمنیش گۆڕاوم کە گوتی «ئەتۆ چراکان دەکووژێنیەوە یا ـــــــ » بە پەلە گوتم « ئەمن.»

رۆژنامەکەم هەڵگرتەوە و وەستام. بەرەڵبێنەکەم لە خۆ کردەوە. بەرەو دەرگە چووم و چرای ژووری دانشتنم کوژاندەوە.

## ٣

دایکم دوایین قومی قاوەی خواردەوە و فینجانەکەی نخوون کردە نێو ژێرپیاڵەکە. چاوە چکۆڵەکانی بۆ چەند ساتێ چکۆڵەتر و لێوەکانی باریکتر کرد و دە بەرەو رووی خۆی راما، واتە بیر دەکاتەوە. « گوتت بەژنی زۆر کورت بوو؟ جوان بوو؟»

پرتکێکم لە گاتای سوێر قاش کرد و نامە نێو دەوری. «جوان؟ گوتم هەر نەبێ حەفتا ساڵی تەمەنە.»

چەناگەی وێکناوە و دەم و چاوی تێك نا. « باشە دەی جا؟ ئەوجار، ئەگەر خۆی بێ بێشك حەفتا ساڵ زیاترە. ئەمن هێشتا هەر گۆرەوی لاسك کورتم دەبەر دەکرد کە ئەو خاتوونە بە کڵاوگەلی جۆرا و جۆری لێوار پان ـــــ »

چاوم بە لووتی کەوت. « دایە، لووتت!»

دایکم لووتی درێژ بوو. کە قاوەی دەخواردەوە لووتی بە لێوی فینجانەکە دەنووسا و پەڵەی تێدەکەوت.

زوو دەستی بە لووتیدا هێنا. « ـــــ و حەوت ریز مرواری لە ملدا، بە سواری ماشێنی سەر ئاوەڵا لە شەقامی نەزەر جلیتێنی بوو.»

پرسیم « خۆی لێیدەخوڕی؟»

خۆی سوورهەڵگەڕا « جا هەر بپەڕە نێو قسەکانم. نەخێر لێخوڕی هەبوو.»

سەیری گوڵدانەکەی سەر دەلاقەم کرد. خۆزیا بە ئاغا مورتەزام گوتبا گڵی گوڵدانەکە بگۆڕی. هەر کە سەیری گوڵەکانم کرد دەموچاوی خاتوون سیمۆنیانم کەوتەوە بیر.

« ئا بێشك گەنجێکی کەشخە و ژیکەڵە بوو. کوڵمەکانی زۆپ و لەڕوو، چاوی درشت و رەش و ـــــ » "لووتی گچکە و شۆخ" ئەوەم لە دڵمدا گوت. لە وێنەی زەماوەندی دایك و باوکم، دە قابە زیوینەکەی سەر پیانوکە دا، دایکم لووتی هیچ درێژ نەبوو.

دایکم پرتکێك گاتای سوێری دەزارینا و گوتی «بەهبەهـ.»

دەستم نایە ژێر چەناگەم و لێی رامام.

ئەو کتێبانەی کە ئاغای داوەتیان لە تارانەوە دەینارد، هەمیشە چەند گاتای سوێریان لەگەڵ بوو. ئەو رۆژەم بیر کەوتەوە کە ئارتووش پرسی «ئەو لە کوێ دەزانێ ئەتۆ گاتای سوێرت پێخۆشە؟» هەتا هاتم بیر بکەمەوە چ بڵێم دایکم گوتی «بۆکلاریسیان نانێرێ، بۆ منیان دەنێرێ. جێژنە کە لە تاران بووین لەگەڵ کلاریس چوومە کتێبفرۆشی. رانەرمی نواند و قاوە و گاتای هێنا. گوتم ئەمن کاتی سەرخوراندم نییە جا چ بگا بە کتێب خوێندنەوە، بەلاّم بە پێچەوانە مردووی گاتای سوێرم. دوای ئەوە هەرکات کتێب بۆ کلاریس رێدەکا بۆ منیش گاتا رێدەکا.» ئەمانەی گوت و بە دەنگی بەرز پێکەنی. ئارتووش بە سەیرەوە لە دایکم راما و ئەمن سەرم دەبەرە خۆنا. نازانم لەمەڕ پێکەنینەکانی دایکم بۆم نەلوا یا زمانم نەگەڕا بڵێم ئاغای داوەتیان هەموو جارێ بە قاوە میوانم دەکا و زۆر لەمێژە دەزانێ ئارام لەگەڵ گاتای سوێر سازە.

دایکم تلی لە زمانیدا و وردە گاتای نێو دەوریی خر کردەوە و خواردی. پاشان دەسماڵێکی لە قوتووەکە دەرکێشا، چوار قەدی کرد و فینجانی قاوەی چەندجار دەمە و روو دانایە سەر و هەڵینایەوە. قەراخی فینجان چەند تۆقی قاوەیی خستە سەر دەسماڵ. خۆیەتی. ئێلمیرا

هارتوونیان ، کیژی هارتوونیانی تاجر. لەگەڵ وارتان سیمۆنیان کە لە هیندوستاندا تجارەتخانەی بوو زەماوەندی کرد. میراتێکی کەمی لە بابییەوە پێگەیبوو ماڵی باوکیشی پێوە زیاد بوو لە جولفا دا بە ئێلمیرا سەرەخۆرە ناسرابوو.» دامە پێکەنین.

دایکم لووتی گرژ کرد. « لە خۆڕایی پێمەکەنە.» خۆ لە خۆڕایی نییە. دایکی لەسەر زانی ئەو دا مرد، چەند ساڵ دواتر دایەنەکەی لە پەنجەرە را خۆی هەڵداشتە نێو باغ.»

هەرکە ویستم فینجانەکانی قاوە کۆکەمەوە دەستمی وەلانا «راوەستە. فالّم نەگرتۆتەوە.» ئەوجار چاوی دە پەنجەرە بڕی. « شەوی زەماوەند، باوکی ژار خـواردوو بـوو، دوای چـەند رۆژ مرد. گوتیان بە هۆی کێکی زەماوەندەوە بوو. بەڵام بۆچی هەر باوکی مـردووە؟ هـەموو لـەو کێکەیان خواردبوو و ــــــ »

گوتم. « دیسان هەرمەنییەکانی جولفا دەمیان رەپێش خست. زۆر چاکە، بەڵکو بـە هـۆی کێك نەبووبێ کە مردووە. رەنگبێ سەکتە یا کوو ــــــ »

دایکم فینجانی نایە سەر دەسماڵ کاغەزییەکە و هەڵیگرت، نایی و هـەڵیگرت. « ئـەودەم کە شووی کرد چووە هیندستان و دوای چەند ساڵ لەگەڵ کوڕەکەی زۆڕیاوە جۆلفـا. شـووەکەی کوژرا بوو. دەیانگوت بە هۆی یەکێ لە نۆکەرەکانی هیندییەوە بووە. پاشان چـەند سـاڵێك ون بوو. گوتیان چۆتە ئەورووپا. بۆ جاری تر کە سەری لە جولفا دەرکەوت کوڕەکەی مەزن ببـوو. بۆ کوڕەکەی بە شوێن ژنەوە بوو. لە جولفـا دا ئـەم دەنگۆیـە هـەبوو کـە کوڕەکـەی تووشـی نەخۆشییەکی چارە نەکراو هاتووە ئەگینا بۆ هەر لەوێ ژنی نەهێناوە؟ پاش قـەدەرێك بیسـتم کوڕە لەگەڵ کیژە هەرمەنییەکی تەورێزی زەماوەندی کردووە. هەرمەنییەکانی تەورێز خۆ ئـەم شتانەیان بەلاوە گرنگ نییە.»

فینجانەکەی خۆی راکرد و دە وێنە تێکەڵ پێکەڵەکانی قاوە رامـا. چـەند جـار گـوتی « هووم!» ، چەند جار « ئاخ !» چەند کەڕەت سەری راوەشاند و فینجانی دانایـە سـەر مێـز. « هی من خۆ سندانیشی تێدا نییە.» فینجانەکەی منی راکرد.

شوکری خوام کرد ئارتووش لەوێ نـەبوو و "هەرمەنییـەکانی تـەورێزی" نەبیسـت. ئـەو رۆژەی گوتبووم گەرەکمە لەگەڵ ئارتووش زەماوەند بکەم یەکەم پرسیاری دایکم ئەوە بـوو کـە «لە ئەرمەنییەکانی کوێیە؟» هەتا گوتم قیژاندی «چی؟ تەورێزی خۆ بە زل زان ؟» ئەگەر نێـو بژیوی باوکم نەبووایە کە جیاوازییەکی بۆی نەبوو زاواکەی لە هەرمەنییەکانی جولفـا بـێ یـا تەورێز یا مووریخ زەماوەندی ئێمە بە سانایی سەری نەدەگرت.

سەیری فینجانەکەی خۆمم لەنێو دەستە ئێسکنەکانی دایکم داکرد. فینجانێکی چەرمووی گــوڵ وردی پەمــەیی، پێســتی دەســتی دایکــم چــین و چرووکی تێکــەوتبوو، دەمــارە شــین هەڵگەڕاوەکانی دەرپەڕیبوون. پرسیم « باشە. دوایە بوو بەچی؟»

سەری بەرز کردەوە، « بیستم بووکەکەی دوای چەند ساڵ دین* بــوو و ســەری لــە "نــەما گەرد" وەدەرنا. هەر لەوێ مرد. چاو لێکە!"سەرو" کەوتۆتە نێو فینجانەکەت.» کەوتمەوە بیر نەما گەرد و دڵم گیرا.

دایکم فینجانی دانایە سەر مێز و وێستا. « ســەرو یــانی ئــاڵوگۆڕ، بــەڵکو موهەنــدیس ئاخریەکەی هاتە سەر ئەوەی مننەت بخاتە سەر کۆمپانیای نەوت و یەکێك لە ماڵەکانی بڕەیم قبووڵ بکا. ژنە عەرەبەکەی تۆش هەر بڕەیم نشین دەبێ و ئێوە لــەم بــواردە ســندان کوشــتووە دەمێننەوە کە دەمێننەوە.»

دەستم دایە کۆکردنەوەی فینجانەکانی قاوە. « ژنە عەرەبەکەی من ؟»

وردە گاتاکانی لە دامینە رەشەکەی تەکاند «ئەو ژنە بۆرەی هەتا ئاغا مورتەزا چــیمەن و شمشادەکان دەدرووی وەك موت ئاور دابێ دەگاتە جێ و هەمووی رەپیچەك دەدا و دەیبا.»

«مەبەستت یوومایە؟» و لە گومانی بڕەیم نشین بــوونی یوومــا کــە بێشــك لــە گــەڕەکی عەرەبەکاندا دەژیا پێکەنین گرتمی.

«ئا، یووما، چ ناوێك! سەدجار گوتم رێی مەدە ماڵێ. بۆخۆت گوتت منداڵەکان دەترسن. هەقیشیانە. بەو ددانە خوارو خێچە و دەموچاو کــوتراوەوە، خــراپتر لــەمنیش کــە هەمیشــە رەشپۆشە.»

راستی دەگوت. یووما ساڵ دوازدە مانگ رەشپۆش بــوو، چــونکە هەمیشــە بــۆ مــەرگی کەسێ تازیە بار بوو. فینجان و دەوریەکانم دانایە نێو قاپشۆری. هیچیش ناترسن. هــەرجارێك ترسان، چونکە ئارمینە گوتبووی دیویە یووما پاساری بە زینــدوویی دەخــوا ئــەویش لــەخۆڕا دەیگوت.

دایکم قڵفی کیفە رەشەکەی دە ملی کرد.« هیچ دوور نییە.»

چەند ساڵ بوو ئەم جانتایە بە دەستەوە دەگرت؟ قڵفی جانتاکە چەند جار قەتیابوو و دایکم دروووبوویەوە؟ چەند کەڕەت لە وەڵامی ئەم قسەیەمدا کــە گوتبــووم « کــاتی ئــەوە نــەهاتووە کیفێکی نوێ بکڕی؟» گوتبووی « ئەگەر ویستبام وەك ئەو ئافرەتە شڵەپەتانە* زوو زوو پێڵاو و کیف بکڕم نە تۆ بەکالۆریۆسی وەردەگرت، نە ئالیس.» گەلێك جار باسی ئــەوەم بــۆ دایکــم

کردبوو ئەو بەڵگەنامەیەی زمانی ئینگلیزی کە لــە کۆمپانیــای نــەوتم وەرگرتــووە لیسانســی پێنــاڵێن و ئەگەرچــی ئــالیس لیسانســی ســەر پەرســتاری ژووری برینگــەری* لــە ئینگلیــز وەرگرتووە، خەرج و مخارجی خوێندنەکەی کۆمپانیای نەوت داویە.

دایکم لە دالآنەکە دا تلی بە سەر مێزی تەلەفۆندا هێنا «تۆزەکەیت نەتەکاندووە؟»

چاوم لە کیفە رەشەکە بوو کە گوتم «بەدی پێرێ هەشت جار، دوێنێ شــازدە جــار، ئیمــڕۆ سی و دووجار.» سەرم هەڵێنا و دە سەر و چاوی رامام، خۆم ریچ کردەوە* گوتی «خۆت بێتام مەکە.» و دەستی دانایە سەر دەسگیرەی دەرگە. «لەو شارە وێرانبووە دا رۆژێ دە جاران پــاك و خاوێنی بکەی هێشتا کەمە. دەچمە "ئوستوور" شەکەراتی تازەی هێناوە.» بێ شــك ســەر سورمانی منی لە چاوەکانم دا خوێندەوە، چونکە زوو گوتی « دەزانم. پــێم بڵــێ کــەرە. بــەڵام ـــــ » هەناسەیەکی قووڵی کێشا، دەسگیرەکەی بەردا و دەســتی کــرد بــە راســتە و پاســتە کردنی گنجەکانی دەرگە تۆڕییەکە. «ئالیس بە دەماخ نییە، دەزانی کە ـــــ » پاشــان لــە ناکاو وازی لە دەرگە تۆڕییەکە هێنا و زوڕیایە لای من. «بــە رۆحــی باوکمــت ســوێند دەدەم، ئاگات لێ بێ قسەیەك نەکەی دیسان شەڕو کێشە ساز بێ . لە ئوستوور چیت پێویست نییە؟»

گوتم چم پێویست نییە و داوام لێکرد کە «تکایە شەکەرات بۆ منداڵان نەکڕی.»

دەرگەی ماڵ کە کرایەوە گــەرما و بــۆی گوڵــە ســێوەڕە دە ژوورێ گــەڕا. دایکــم گــوتی: مەیەدەرێ. هەوا لە دۆژەهی* خوا داغتر بووە.» دەرگە تۆڕیەکەی کردەوە و وەڕێکەوت.

دەرگە تۆڕییەکەم بە دەستی راگرت ، پالم وەشیپانەکەیداو چــاوم تــێ بــڕی. لــە جەرگــەی دالآنەکە وێستا، داهاتەوە و گوڵێکی لە باغ چنی، پشتی بە زەحمەت راست کردەوە، گوڵەکەی بۆن کرد و وەڕێکەوت. درگە ئاسنییەکەی کردەوە و پێیوەداوە و سووڕاوە لای وێستگەی پاس، وەبیرم هاتەوە ئەو هاوینەی کە چووبووینە نەماگەرد دایکم چەند بە گورجی دەڕۆیی.

# ٤

لەسەر پێپلەکانەکەی بەر دەرگە دانیشتم و دە هەر دوو باغچەکە، ئەم لاو ئەو لای رێگــە بەرتەسکەکە، مێخەك و شا پەسند و گوڵە مەیموونــە و نمرەیــی و ئەتڵەســییەکانی کــە ئاغــا مورتەزا یەك بە یەك لەهەر دوو باغچەکەدا چاندبوونی رامام. ســەیری دار بیەکــەم کــرد کــە نسێی خستبووە سەر جۆلانە ئاسنییەکە. سێ دارمان لەنێو چیمەنی حەوشە دا هەبوو. یووــا

پێی دەگوتن دارە بەن. خاتوون ڕەحیمی دەیگوت زمانەگا و ئـالیس پێـی وابـوو هـەردووکیان لەخۆیانەوە دەیلێن و ناوە دروستەکەی ئەرخەوانە. دوانەکان بێ سەرنج دان بەو را جیاوازانە بە یەکەمیان دەگوت دارە ئارمینـە و دووهەمیشـیان ئارسـینە. داری سـێهەم لـەو دوانـەی تـر چکۆلەتر بوو و بەو گشتە هەرەس کردنە و کوود پێدانەی ئاغا مورتەزا هەمیشە کـەمتر لـەو دوانەی تر گوڵی دەکرد.

ناوی داری سێهەم پێوەندی بەوە هەبوو کە دۆستی نزیکی دوانەکان کێ بێ. ئەو دەمانـەی کە نینا و گارنیك جینارمان بوون ناوی دارە سووفی بوو، کیژی نینـا و گارنیـك . ئـەو رۆژەی سووفی رادیۆ ترانزستۆری سینگوڕنیگی دوانەکانی خرا کرد و لە یەکتر زیز بوون، دارەکە چـەند رۆژێك بێ نێو مایەوە هەتا تیگران کوڕی نینـا رادیۆکـەی دروسـت کـردەوە و دارەکـە نـاوی تیگرانی بەسەردابرا. بەر لە سووفی و تیگران، ئێلیزامان بوو کە کیژی جیناری دایکم و ئالیس بوو و تەنازکە لە دوو شەقام ئەولاتر دەژیـا و فێـری دوانـەکانی کردبـوو کـە چـۆن بـە گوڵـە ڕەمەییەکان فاڵ بگرنەوە، ئەو رۆژەی کە تەناز بۆ هەمیشە چوویە تـاران، ئارسـینە و ئارمینـە گریان و چەند رۆژێك فاڵیان بە گوڵە ڕەمەییەکان گرتەوە کە دۆستەکەیان کەی دەگەڕێتەوە. لـە چەند رۆژ بەر لەمەوە داری سێهەم ببوویە دارە ئێمیلی.

« ئالیس بە دەماخ نییە، دەزانی کە ـــــ »

دیارە کە دەمزانی ئالیس بە دەماخ نییە هۆیەکەییشم دەزانی. حەوتووی پێشتر یـەکێ لـە پەرستارەکانی هەرمەنی نەخۆشخانەی کۆمپانیای نەوت کە بەردەستی خوشکم بـوو و ئـالیس پێی وابوو کرێت تر و نەخوێندەوارتر و گوندی تر لەو کیژە خودا دروستی نەکردووە، شووی بـە دکتۆرێکی هەرمەنی کردبوو کە ئالیس گەلێك جار بە زەردەخەنەیەکی سـووکەڵە و رامـان دە شوێنێکی نادیار گوتبووی « بۆشناخ* ترین و بە ئاوەزترین مرۆڤێکی کە تا ئێستا دیومـە.» ئەوەی کە ئالیس هەر شوو کردنێکی سووکایەتییەکی راستەوخۆ بە خۆی دەزانی مەبەسـتێکی لاوەکی بوو. مەبەستی سەرەکی ئەوە بوو کە زۆر لەمەو پێش خوشکم هێندێ جار زەمزەمـەی ئەوەی دەکرد « لام وایە دکتۆر ئارتامیـان ئـەمنی خـۆش دەوێ.» راسـت لـەو کاتەیـدا کـە دڵنیابوو دکتۆری بۆشناخ و بە ئاوەز گەرەکیە بۆ شێو بانگێشـتنی بکـا، کـارتی بانگێشـتنی زەماوەندی دکتۆر ئارتامیان گەیی.

«ئاگات لێ بێ قسەیەك نەکەی دیسان شەڕ و هەڵلا ساز بێ.»

لەو بن پنچکە گوڵە کاغەزەی کە دیواری ماڵیی داپۆشیبوو گوڵێك کەوتە سەر پێپلەکان و بیرم کەوتەوە.

دە دوازدە ساڵانە بووم. ئالیس دەیویست بە بەردەکانی بازەڵێنێم کایە بکا و ئەمن پێم نەدەدا و ئالیس دەیزیڕاند و دەگریا. دایکم قیژاندییە سەرم «منداڵەکە هێندە گریا بوورایەوە*. ئەو بەردە سندان کوشتووانەم دەیە. ئەتۆ مەزنتری، ئەوی بکێشە.» کە نەویم نەکێشا دایکم گوڕاندییە سەر باوکم «ئەگەر بۆ جارێکیش بێ شتەکی بڵێ. مردم لە دەس شەڕی ئەم دووانە.» باوکم بۆ ساتێ روانییە من و دایکم و ئالیس. پاشان لەسەرخۆ رۆژنامەکەی قەد کرد، هەستاوە و ئەو بەردانەی کە چەند مانگێك بوو یەك یەك کۆم کردبوونەوە لێمی وەرگرت دایە ئالیس و پێمی گوت دەبێ بێ ئەوە شێو بخەوم بخەوم. گەڕاوە دانیشت و رۆژنامەکەی راکرد. ئالیس خۆی ریچ کردەوە، دایکم کە شاڵ گەردنی دەچنی دیسان گرتیەوە دەستی و ئەمن شەوێ بە دەم گریانەوە خەوتم. چەند رۆژ دواتر کە سۆراخی بەردەکانم لە ئالیس گرت، شانی هەڵتەکاند کە « ونم کردوون.» پێم وایە دوای مانگێك دەبوو. دایکم ئەو بەردانەی کە ئالیس دەکەلێن و قوژبنانی هاویشتبوون دۆزییەوە و نایە سەر پاتەختییەکەی پاڵ قەرەوێڵەکەم و وابزانم هەر دوای مانگێکی تر دەبوو کە باوکم کاتی چوونە سەرکار، دەستی نایە گیرفانی بارانییەکەی، پێنج بەردی هاوچەشنی خڕی دەرێنا و بێ هیچ قسەیەك دە دەستی نام. بەردەکانی خۆمم لەبەر چاوی ئالیس وەرگرت. «ئەمانە بۆ تۆ . باوکم بەردی بۆم کۆ کردۆتەوە.» ئالیس بە مرچ و مۆنیەوە گوتی «بازەڵێن کایەی منداڵانی گوێ نەدەرە. ئەمن ئەوە خەریکی خڕ کردنەوەی وێنەی هونەر وەرانم.»

« بە رۆحی باوکمت سوێند دەدەم ـــــ »

گۆڵە کاغەزییە سوور و سپییەکانم لەسەر پێپلەکان راکرد و لە دەستمدا هەڵمسووڕاندن. دایکم بۆچی بە رۆحی باوکمی سوێند دام؟ دایکم لە کوێ دەیزانی؟

دیسان وەبیرم هاتەوە. ساڵڕۆژی مەرگی باوکم بوو و تازە لە کڵێسا گەڕابووینەوە. دایکم و ئالیس لە پشت مێزی چێشتخانە دا قرەیان بوو و ئەمن خەریك بوو دەچوومە حەوشەی پشتەوە جل و بەرگە شۆراوەکانی سەر تەناف کۆ وەکەم. بە هۆی بۆی شەم و کوندر گێژ و وێژ بووم و بە هۆی گریان سڕ و بێواز. دایکم بە ئالیسی گوت « خەتای کەسێ نەبوو، لە خۆوە بوختانێ بە خەڵکی مەکە. رەنگبێ قسمەت نەبووبێ.» ئالیس بە تووڕەییەوە زیقاندی «خەتای کەسێ نەبوو؟ ئەدی خوشکە گولەکەی کە وەك مەرگی لە ناکاو لە تارانەوە خۆی گەیاندە ئێرە

و رای براکەی پووچەڵ کردەوە چکارە بوو؟ قوڵینەی* بەتاڵ بە دەستەوە وەبیر ئەو پنچکە گوڵە سوورە کەوتمەوە کە هاوینی پارەکە لەسەر گۆڕی باوکمم چاندبوو. خزمەتکاری گۆڕستان لەبیری دەبوو ئاوی بدا؟ هۆشم هەروا لە لای گوڵە سوورەکەی سەر گۆڕی باوکم بوو، لە زارم دەرپەڕی کە «بێ جێ نییە عەیب و ئیرادی خۆشمان ببینین، چاوەنۆڕی بوونی کلکەوانەی ئەڵماسی سێ قێراتی* ــــــ » ئالیس دەرفەتی پێنەدام قسەکەم تەواو بکەم. بۆ وێنە ئەمن چ عەیب و ئیرادێکم هەیە کە کلکەوانەی ئەڵماسم نەبێ؟ لە بنەماڵەیەکی بەرێوجێ نیم کە هەم، خوێندەوار نیم کە هەم. رەنگبی چون قەڵەو و گۆشتنم و وەك تۆ پێست و ئێسك نیم دەبێ شوو بە هەر مرۆڤێکی بەدخولق و بێ ئاوەزی وەك جەنابی پرفسۆر بکەم و وەکو تۆ هێندە خۆ چکۆڵە بکەمەوە کە کلکەوانەی دەسگیرانیم ئاڵقەیەکی سندان کوشتووی زێڕ بێ کە شاییەك ناهێنێ. نا گیانە، نرخی من زۆر لەوانە زیاترە، ئەتۆ هەر لە منداڵییەوە ئێرەییت پێم دەبرد، ئێستاش هەروەتر، بێ خەم بە. ئەگەر بم ویستبا شووەکی وەك شووەکەی تۆم ببێ، تا ئێستا بیست جار شووم کردبوو.» قوڵینەکەم لە عەردیدانا و زۆڕیامەوە لای خوشکم. نازانم رەنگم پەڕی، سوورهەڵگەڕام، یاکوو شتێکم دە چاویدا بوو کە ئالیس لەپێشدا روانیە من ، پاشان لە قوڵینە و دوایی روو لە دایکم گوتی «چ بوو؟ ئەمن خۆ قسەیەکی خراپم نەکرد.» دایکم و ئالیسم لە چێشتخانە بەجێ هێڵا و بە قوڵینەی بەتاڵەوە چوومە حەوشەی پشتەوە. هەرکات چووبایە تاران پنچکە گوڵێکی سوورم لەسەر گۆڕی باوکم دەچاند. هەموو جارێکیش بەڵێنیم لە خزمەتکاری گۆڕستان دەستاند گوڵە سوورەکە ئاو بدا و پێشی نەدەدا و جارێکی تر کە دەچووم پنچکەکی ترم دەچاند. چاوم لە جلوبەرگەکانی سەر تەنافەکە کرد: گۆرەوییەکانی کوڕەکەم، ژێر دامێنەیەك چەشن و یەك ئەندازەی دوانەکان ، کراسگەلی ئارتووش، مەلافە و روو باڵگە، گشتیانم یەك یەك کۆ کردەوە قەدەم کردن، نامنە نێو قوڵینە و سەیری تەنافە رووتەکەم کرد کە لە نێوان دارە مۆرتك و دیواری حەوشەدا بەستبووم. لقەکانی دار جووڵانەوە و چەند مۆرتکی گەییو کەوتنە خوار. بۆ وەبیر ئالیسم نەهێناوە کە لەسەر زەماوەندی من و ئارتووش چ هەڵڵاو بگرێکی ساز کرد؟ لە دڵی خۆمدا گوتم ئەم مۆرتکە سوورە جوانانە. بۆچی نەمگوتە ئالیسی کە تەنانەت پاش زەماوەندم گەلێك جار چ لە روو دا و چ پاشملە بە تانە و تەشەرەوە ئازاری دابووم کە «ئارتووش لە پێشدا گەرەکی بوو لەگەڵ من زەماوەند بکا، پاشان کلاریس وەك کەوچکی نەشۆراو لێمان قووت بۆوە.» خۆزیا لە جێگەی گوڵە سوورەکە کەس لە بیری نەدەما ئاوی پێبدا، نەمامێکی مۆرتکم لەسەر گۆڕی باوکم چاندبا. بە خۆمم گوت ئەگەر

ئەوجار ئاغا مورتەزا هات دەبێ لێی بپرسم لە کوێ دەتوانین نەمامی مۆرتك بکڕین. ڕەنگە داره مۆرتك خۆرسکیش بێ، ڕەنگبێ ئاووهەوای تارانیشی پێنەکەوێ. هەتا بەر لە هاتنم بۆ ئابادان مۆرتکم نەدیبوو. ئالیس و دایکم هەتا بەره بەرەی ڕۆیشتنیان شەڕیان بوو. شەو کە منداڵەکانم خەواند و قاپ و قاچاغی شێوم شورد و چێشتخانەم خاوێن کردەوە، دانیشتمە نێو ڕاحەتییە چەرمە سەوزەکە. یەك یەکی مۆرتکە سوورەکانم خوارد و باوکم بیر هاتەوە کە دەیگوت «نە لەگەڵ کەس باس بکە، نە ڕەخنە لە کەس بگرە. هەرکەس هەرچی گوت بڵێ هەق بەتۆیە و خۆت ئاسوودە کە. مرۆڤەکان کە لەمەڕ بڕواکەتەوە پرسیار دەکەن، ڕای تۆ ناخوازن. دەیانەوێ دان بە بڕواکەیاندا بێنی. باس لەگەڵ ئینسانەکان بێ فایدەیە.» مۆرتکم خوارد و بە خۆمم گوت «هەق بە تۆ بوو، باس لەگەڵ ئینسانەکان بێ فایدەیە.» و بەڵێنیم بە باوکم دا هەرچی ئالیس گوتی بڵێم هەق بە تۆیە و هەر کارێکی کرد دانی پێدابنێم. دوایین مۆرتکم خوارد و گوتم «خۆزگا باوکم بووایە. بێشك چێژی مۆرتکی پێخۆش دەبوو.»

گوڵە قاقەزییە سوور و چەرمووەکە لەنێو دەستمدا چەمۆڵە ببوو. بۆقێکی خڕپن لە باغچەکە دا دەرپەڕی، بەرەو رووم هەڵتروشکا و زەق چاوی تێبڕیم. هەستام چوومە ژوورێ. دەرگەم لەپشتەوە گاڵەدا و بە دەنگێکی بەرز گوتم « دەزانم کە دەبێ بێدەنگ بم و هەر گوێ هەڵخەم، ئەتۆش دەزانی کە تەنانەت هەتا حەوتوویەك نابێ لەمەڕ زۆر خواردن و قەڵەوبوونەوە لەسەر ئالیس ببۆڵێنی.» دایکم هەرکات لەسەر زۆر خواردنی ئالیس دەیبۆڵاند، خوشکم ئەگەر لەسەر دەماخ بووایە بە گاڵتە و قسەی خۆش کارەکەی یەکلا دەکرد و ئەگەریش وەك ئەمڕۆژانە بە دەماخ نەبووبایە دەستی بە هات و هاوار دەکرد کە «بۆ دەستم لە کۆڵ ناکەیەوە؟ دڵخۆشیم هەیە؟ قەڵەو بوومە کە بوومە. خۆم بۆ کێ کز کەم؟ دۆستی کوڕ؟ شووم؟ منداڵەکانم؟» دایکم ناچار دەبوو نەوی بکێشی و ئەو شەکەراتە کەدبریانەی کە هەموو جارێ ئالیس دەیکڕی و دایکیشم هەمیشە دەیشاردنەوە بیانهێنێتەدەر و لەپێش ئالیسیان دابنێ یا ئەگەر هەلومەرج وەك ئەو چەند ڕۆژە نالەبار بووایە بڵێ «بە من بڵێ کەرە!» و بۆخۆی بچێ بۆ خوشکم شەکەرات بکڕێ. دەستێکم بەسەر مێزی تەلەفزیۆندا هێنا. هەق بە دایکم بوو. دەرگە هەتا دوو چرکە سات ئاوەڵا مابایەوە ماڵ وەبن تۆز و خۆڵ دەکەوت. بەرەڵبێنەکەم بەست و بەر لەوەی شێرەی قاپشۆری بکەمەوە سەیری فینجانی قاوەی خۆمم کرد. هیچ وێنەیەکم تێدا بەدی نەکرد کە چووکترین شێوەی سەرو بدا.

# ٥

پەردەی ژووری دوانەکانم لادا و روو قەرەوێڵەی چل تکەکانم رێکوپێك کـرد. دایکـم چـەند ساڵ بوو کوتە پارچەی کۆکردبۆوە و ئەو رووتەختییانەی پێ درووبـوو. ئـەو رۆژەی کـە پـاش چەند مـانگ کـاری درونەکـەی تـەواو بـوو، دوانـەکان چـوار گۆشـەکانی هـەر کـام لـە روو قەرەوێڵەکانیان ژمارد هەتا لە یەك رادە بوونیان دڵنیا بن. خوارەوەی هەریەك لە قەرەوێڵەکان جووتێك دەمپایی لێبوو. هەردوو جووت سوور و گوڵنگی زەردیان پێوە بوو، لـەو ژوورەی کـە هەموو شتێکی دوو دووی وەك یەکی لێبوو، تەنیا بووکەڵەکان یەك شێوە نـەبوون، جارێکیـان کە پرسیم «بۆ گەرەکتانە هەموو شتێکتان وەکو یەك بێ؟» بەر لەوەی وەڵام بدەنەوە بە یەکەوە کەوتنە راوێژکردن. ئارمینـە گـوتی «ئـەمجۆرە وەك ئـەوەی کـە ـــــ» ئارسـینە کۆتـایی بەڕستەکەی هێنا «وەك ئەوەی کە هیچکات تەنیا نین» و دەستی خستە ملی خوشکی. کاتـێ گوتم «ئەی بۆچی بووکەڵەکانتان یەك شێوە نین؟» دە یـەکتر رامـان، ئـەوجار دەمـن و پاشـان گوتیان «نازانین»

ژوورەکەم رێکوپێك کرد و بە خۆمم گوت ئەو هاودڵییەی کیژەکانم بریا لە سەردەمی گەورە بوونیشیاندا درێژەی ببێ. دەرپێکەی ئارسینەم قەد کرد و نامە ژێر باڵگە و دیسان بیرم لە خۆم و ئالیس کردەوە. لەو سەردەماندا کامەمان تاوانبار بووین؟ ئیشـیم دانایـە سـەر قەرەوێڵـەی ئارمینە و ئەوەم بیرکەوتەوە کە ئەمنیش ئالیسم عەزیەت دەکرد، بووکەڵە رەش پێستەکەم کە ناوی تام بوو لەسەر قەرەوێڵە راکرد. دوانەکان زۆرتر لە بووکەڵەکانی تر ئاگایان لە تام بوو کە نەوەکو بەستەزمانەی وەبزانن بە هۆی رەنگ و پێستییەوە زۆرمان خۆش ناوێ.» کەوتمەوە بـیر ئەو رۆژەی کە زۆر خوێڕیانە جەدوەلی زەڕبم بە سەهوو فێری ئالیس کردبوو، یا چەند جار لێمی ویستبوو داڕشتنی بۆ بنووسم و نەمنووسیبوو. تامم دانایە نێو لانکەی بووکەڵەکان. لانکـەی بچکۆلە کە جووڵایەوە بۆ چەندین جار بەڵێنییەکی کە بە باوکمم دابوو بیرم کەوتـەوە و ئـەوەم دووپات کردەوە کە «هەرچی ئالیس گوتی دەڵێم هەق بەتۆیە.» زەنگیان لێدا.

دەرگەم کردەوە و لەو بەرزاییەی کە چاوەڕێ بووم یەکێ ببیـنم کەسـم نـەدی. ئـەوجار زۆر خێراتر لە دوێنێ سەرم شۆڕ کردەوە.

فانیلەیەكی یەخە داخراو و دامێنێكی رەشی لەبەر دابوو. گەردانە* مرواریەكەی دوێنێی خستبووە سەر فانیلەكە. گۆرەوی نایلۆنی لەپێدابوو كە هەركە چاوم پێیكەوت گەرم داهاتم. كەوشە بریقە دارە رەشە پانیە بڵێندەكەییم كە دی پێم وابوو ژمارەی كەوشەكەی دەبێ سی بێ، بە رادەی پێی دوانەكان، بەستەیەكی گرتە لام، «كێكی ئالۆو باڵووە. دەستاوی خۆمە.»

خولڤم كردە ژوور، دەستی چەپی بەرز كردەوە و چاوی بەرداوە. «نا! ئەمە چاوپێكەوتنێكی فەرمی نییە. لە راستیدا هاتووم داوای لێبوردن بكەم.» چاوی هەڵێنا. «لە كردەوەی دوێنێم.» بەستەكەی نایە نێو دەستم و بەرەو چێشتخانە وەرێكەوت.

هەتا هاتم دەرگە پێوەدەم و بە شوێنی دابچم لە پشت مێزەكە دانیشتبوو. ئیمرۆ دوو كلكەوانەی بوو. یەكەمیان نەقیمەكەی سەوز بوو و دووهەمیش بەردێكی درشتی چەرموو كە لام وابوو دەبێ ئەڵماس بێ، ئەگەر ئالیس لێرە بووایە بێشك دەیزانی. خوشكم دوای شەكەرات و شیرینی، یا هەر بەو رادە هۆگری جەواهیرات بوو.

جینارە بەژن كورتەكەم خەریكی روانینی دەور و بەر بوو. «چێشتخانەیەكی چەند جوانە!» نەمدەدی بەڵام دڵنیا بووم لاقەكانی نەدەگەیشتە عەردی.

لە یەكێ لە قەفەزەكانی چێشتخانە دا تەبەقێكی* خڕی فەخفووریم* دەرێنا كە ئالیس لە دوایین سەفەریدا بۆ ئینگلیز بە دیاری هێنابووی. قوتووەكەم كردەوە و كێكەكەم لەسەر مقەباكە وەرگێڕایە سەر تەبەقەكە، قوتوو و مقەباكەم دانایە سەر پێشخان و بە تەبەقەوە بەرەو مێزەكە چووم « كێكێكی چەن جوانە. بۆ زەحمەتت دەكێشا؟»

پێكەنی و گوتی « بژی!»

روانینە گێژەكەمی كە دی گوتی «بۆ هەر ئافرەتێكی هەرمەنی كێكم بردووە، بە مقەباكەی ژێرەوەی نایە سەر مێز.» چای لە قاوە پێ باشتر بوو، شیری دە چای كرد و لێكیدا.

كێكە ئالۆوباڵووەكە رواڵەتی لە تامی باشتر بوو. گوتم «كێكێكی زۆر تام خۆشە.»

گوتی « تامی خۆش نییە، ڤانێللام نەبوو.» هێشتا چای لێكدەدا.

هەوڵم دا بابەتێك بۆ قسە كردن بدۆزمەوە. بە گەرما و شێداریی ئابادانەوە دەستم پێكرد كە بە بڕوای دراوسێكەم لەچاو گەرمای هیند هیچ نەبوو. دەنگی وێك كەوتنی كەچك و فینجان وردە وردە تووڕەی دەكردم.

بیرم کردەوە چ بڵێم کە بۆ ئەو باش و بەرچاو بێ. چاوم وە قوڵێنەی سەر مێز کەوت. چەند هێلکە لە جێژنی پاکەوە هەر وا لە قوڵێنەکە دا مابوو. گوتم « هێلکەی رەنگ کراوە بۆ ئێمیلی ببە» و قوڵێنەکەم خولّق کرد.

ئاخرییەکەی کەوچکەکەی نایە پاڵ فینجان ، هێلکەیەکی راکرد و لەنێو دەستیدا هەڵیسووڕاند و گوتی. «خۆتان رەنگتان کردووە؟»

گوتم « بەڵێ. نا. یانی لەگەڵ منداڵەکان ـــــ »

هێلکەکەی نایەوە نێو قوڵێنەکە. « ئێمیلی کەیفی بەو شتانە نایە.»

گوتم « بەڵام منداڵ هێلکەی رەنگیان خۆشدەوێ.»

هەروەك قسەیەکی سووکایەتی هێنەری بیستبێ گوتی «ئێمیلی منداڵ نییە. هێندێ جار کارگەلێکی سەرسوڕهێنەری لێ روو دەدا بەڵام ـــــ منداڵ نییە. خاوەن خووخدەی تایبەت بە خۆیەتی.»

هەتا ویستم ئیدی قسە نەکەم، چای خواردەوە و دەستی بە قسە کرد. رستەکانی نێو بە نێوە « کە لە پاریس بووم» یا «ئەو ساڵەی کە لە لەندەندا دەژیام» یا «ماڵەکەم لە کەلکەتە» دەس پێدەکرد. بەم پێیەش نازانم بۆچی هەستم پێنەکرد وەك ئالیس فیز لێدەدا. خوشکم لەخۆ هەڵنانددا پسپۆر بوو.

لە پڕێکا لە جێوە رابوو، سوپاسی میوانداریییە پڕ لە دلۆڤانییەکەمی کرد، بەرەو دەرگە چوو و گوتی «پێنج شەممە شەو بۆ شێو چاوەڕوانتانم. منداڵەکان بە یەکەوە کایە دەکەن، ئێوە و شووەکەتان لەگەڵ کوڕەکەم ئێمیل ناس دەبن.»

تەنانەت نەیپرسی پێنج شەممە شەو بەرنامەیەکمان هەیە یا نا.

# ٦

ئارتووش گشت پرتە و بۆڵەکانی چەند رۆژەی لای دایکم و ئالیس دووپات کردەوە. «هەوەڵین و دوامین کەڕەتە. تکایە هاتۆچۆی زۆر دامەمەزرێنە کە تاقەتی ئەو شتانەم نییە. بۆینباخیش* لێنادەم.»

ئالیس شەکەراتی چوار گۆشەی لە جانتا حەسیرییە مەزنەکەی دەرێنا و قاقەزە زەردەکەی دەوری کردەوە. شەگەڵاتەکەی دە زاری هاویشت. قاقەزە زەردەکەی تووڕ دایە سەر مێزی

چێشتخانە و بە گووپی * هەڵمساوەوە گوتی «نەقیمی کلکەوانەکە زمڕووت بوو؟ بێشك لە هینـدەوە هێناویە.»

دایکم ئەسکەملەکەی بە هەرا هەراوە وەلانا و وێستا «بە بڕوای منیش دەبێ رادەی هـاودەمی و هات و چۆ لەبەرچاو بگیرێ.» قاقەزە زەردەکەی راکرد و بردی دە سەتڵی زبڵـی هاویشـت. «ئـەم ژنە لە جولفا دا هیچ خۆشناو نەبوو.»

ئالیس گوتی «ژنە خۆشناو نەبووە بە کوڕەکەی چی؟»

لەگەڵ دایکم چاومان دە چاوی یەکتر بڕی. بێشك دایکیشـم بـەوەی زانـی کـە «دیسـان سـەرو کەلارەی مێرێکی رەبەن دەرکەوت.»

ئارسینە رایکردە چێشتخانە. جلە سوورەکەی راپۆنزێل دیار نییە.» رووی دە دایکم کرد. «ئـەو جلە گنجاوییەی کە تۆ درووو بووت.» پێـی دە عـەردی کوتـا. «نـە دۆزرێتـەوە، راپۆنزێـل نایەتـە میوانی. راپۆنزیل نەیە، ئەمن و ئارمینەش نایەین.» دەسـتی دە کەلەکـەی نـا و زەق دە ئارمـەن راما.

ئارمەن سەعاتێك بەر لەمە حازر بوو. ئەو کراسەی کە وێنەی کەللە بەرانی لەسەر بوو، لەگـەڵ شالْوارە لیبە کاڵ بووەکەی لەبەر کردبوو کە چەند جار ویستبووم تووڕی هەڵدەم، بەڵام هەموو جارێ قیژاندبووی « نا » لەپێشدا کەوشەکانی بە پەڕۆی تۆزتەکێنی چێشتخانە و تف پا دەکردەوە، بـەڵام پاشەوەی گوڕاندبوومە سەری، بە پەڕۆی تایبەتی کەوش پاکردنەوە و ئاو خاوێنی کردبۆوە. گـوتم « زۆر بێجێ نییە. جلی راپۆنزێل نەدۆزرێتەوە ئارمەنیش لە ماڵ دەمێنێتـەوە.» هـەموو چـاومان دە ئارمەن بڕیبوو.

ئارمەن لەپێشدا چاوی لە من کرد، پاشان لە ئارسینە دەتگوت لەوەی کە بەدفەڕییەکانی درێژە پێ بدا یا نا دڵەڕاوکەی بوو. ئەوجار بە شل و شەویقی چەند هەنگاوێکی هـەڵگرت. قتـووی چـای سەر پێشخانی کردەوە و جل و بەرگی بووکڵەکەی دەرێنا. ئارسینە جرتێکی راهێڵا و جلـەکانی پـڕ دایە و رایکردە دەرێ.

دەمزانی دایکم و ئالیس بۆ ئەوەی دان بە شیرین کاریەکانی ئارمەن دابنێن لـە پێکـەنین دەدەن کە لە ئاکام دا کوڕەکەم بۆ سەرکۆنە کردنەکەی ئەو جـارەم خۆشـی شـلوێ نـەدەکرد. گـوتم « بـڕۆ ژووری خەوتنی ئێمە. باوکت بۆینباخەکەی لەبیر کردووە.» ئارتووش قەیتانی کەوشەکەی دەبەست. «گوتم کە بۆینباخ لێنادەم.» بە بێدەنگی ئارمەنم تێگەیاند کە « بڕۆ.»

هەتا ئارمەن لاقی دە دەرێنا دایکم گوتی « دەبەر بەژن و بالآت مرم.» منداڵەکەم بەو هەموو خوێن شیرینییەوە وەکێ چووە؟»

ئالیس پێکەنی « وە پووری.» دوایە رووی دە ئارتووش کرد « گوتت کوڕەکەی چکارەیە؟» ئارتووش کە گوتی ئەندازیاری دامەزراوە، دووهەمین شەکەرات پەڕییە زاری ئالیس. «ئەندازیاری دامەزراوە. م م م م.» و دە گوڵدانەکەی سەر قەڕنیز راما. دایکم وەدەنگ هات کە « دیسان وەك مێوژ و لەبلەبی دەستی کرد بە شەکەرات خواردن.»

ئەوجار ئەمن قاقەزە زەردەکەی شەکەرات لەسەر مێز راکرد، ئەوەم لا سەیر بوو کە خوشکم خۆی گوتەنی لە کەیەوە هۆگری خۆی پێشانی مێرێك دەدا کە لەمەو پێش زەماوەندی کردووە و منداڵێکیشی هەیە. دایکم جارێکی تر پڕژایەوە سەر باسی خۆشناو نەبوونی خاتوون سیمۆنیان لە جولفا دا. لە دڵی خۆمدا گوتم بریا دایکم دیسان سەر لەبەری ئەو رووداوەی کە چەند رۆژ پێش بۆی گێڕابوومەوە دووپاتەی نەکاتەوە.

ئارتووش بە پەرۆیەکەی عەردی چێشتخانە کەوشی دەسڕییەوە پەرۆی تایبەتی کەوشم پێدا. پەرۆی وەرگرت و گوتی: «گرنگ نییە کە خەڵکی جولفا چیان دەگوت یا چ دەڵێن. وازی تێکەڵاوی لەگەڵ جینار و هات و چۆیە زۆرەملیەکانم نییە.»

ئالیس دەستی نابووە ژێر چەناگەی و هەروا لە گوڵدانەکە رامابوو. زمرووتەکانی هیند ناوبەدەرن.» جاجکی لە جانتاکەی دەرێنا.

بۆ دوامین جار لە نەینووکی* دالآنەوە سەیری خۆمم کرد، دڕدۆنگ لەوەی کە یەخەی جلە بێ قۆڵەکەم زۆر ئاوەڵا نییە؟ داوێنی جلم زۆر تەنگ نییە؟

ئالیس و دایکم بەرەو دەرگە چوون. دایکم لە سەر تا لێم ورد بۆوە. « ئێمە رۆیشتین . بریا شاڵێك ، شتێکت بە شانی دادابا.»

گوتم «پێتان خۆشە ئارتووش بتانگەیەنەتەوە؟»

ئالیس جاجکەکەی هەڵدا و توقاندی. « نا، پیاسە دەکەین. جارێ هەتا چوار، پێنج رۆژ رێگەمان دوور نییە، بەڵام حوکمەکەم کە وەرگرت ــــــ » چاوی لە ئارتووش کرد کە لەبەر نەینووکدا خەریکی گرێی بۆینباخەکەی بوو. «حوکمم کە وەرگرت، مێردی خوشکی خۆشەویستم دەبێ زەحمەت بکێشێ بە ماشێنی ئاخرین مۆدێل بمانگەیەنەتەوە ماڵ.» قاقا پێکەنی و رووی دەمن کرد. « خۆ ناکرێ لە بواردەوە هەتا بڕەیم بە پێیان بڕۆین. ماڵئاوا. سەرەڕای ئەوە جلت بۆ بەرت فرەوانە، ماڵئاوا منداڵەکان.» دەرگەم لەسەر داخستن و هەناسەیەکی دوور و درێژم کێشا.

# ٧

ئێمیلی دەرگەی کردەوە

جلی قۆڵ پف دراوی چەرموو و کەوش و گۆرەوی چەرمووی لەبەر دابوو. نەوارێکی پانی چەرموو لە سەری کەزییە کورتەکانی بەستبوو. لام وابوو تووکێکی چەرمووەکە هەر ئێستا لە عەردی بەرز دەبێتەوە.

ئارمینە گوتی « وەی ! ئێمیلی ــــ »

ئارسینە گوتی « وەك فریشتانت لێهاتووە. »

ئارسینە راپۆنزێلی دایە دەستی ئێمیلی. جلی سووری بووکەڵە دەتگوت ئێمیلی لەسەر عەردی راگرتووە. ئارتووش بە سرتە پێی گوتم « چ منداڵێکی نازدارە. »

لە چاوەڕوانیدا سەیری خاوەن ماڵەکانی سەرەکی دەوروبەرم کرد. دالان کە هاوچەشنی دالانەکەی خۆمان بوو مەزنتر دەینواند. رەنگبێ لەمەڕ ئەوە کە جگە لە مێزی تەلەفۆن کەل و پەلێکی تری نەبوو. « پێدەچوو هێشتا وێرا نەگەیشتبن شمەکەکانیان جێبەجی بکەن، » کە خاتوون سیمۆنیان و کوڕەکەی هاتنە دالان .

ئەوەی کە گشتمان روانیمانە خاتوون سیمۆنیان تەنیا بە هۆی بەژن کورتییەکەی نەبوو. جلێکی حەریری رەشی پۆشیبوو کە لەبەر درێژییان عەردی دەماڵی. سنجاقێکی مەزنی بە سنگی وەکردبوو و جووتە گوارەیەکی بە گوێدا شۆڕ ببۆوە، ملوانکە مرواریيە چەند ریزەکەی هێندە درێژ بوو کە دەگەیشتە پشتێندە پانە زێڕەکەی. ئارسینە سەبر گوتی «هەروەك کاجی ساڵی نوێ » هەر کە سیخورمەیەکم گەیاندێ لەگەڵ خوشکی پێکەنینەکەیان قووتدایەوە.

خاتوون سیمۆنیان دەستە چکۆڵەکەی هێنایە پێش و لەگەڵ ئارتووش تەوقەی کرد. «ئێلمیرا هارتوونیان — سیمۆنیان. بەخێر بێن. » پاشان روو لە ئێمەوە هێمای پشت سەری خۆی کرد. « کوڕم ، ئێمیل سیمۆنیان بە ئێوە دەناسێنم. » ئەو چەشنە ناساندنە رەسمی و راسەقینەیەم هەر لە فیلمەکاندا دیبوو.

ئێمیل سیمۆنیان هاوبەژنی من بوو کە سەیر بوو. دەکرێ بڵێم لە هەموو ئەو مرۆڤانەی کە دەمناسین کەڵەگەتتر بووم، جگە لە ئارتووش کە تەنیا ئەو کاتانەی کەوشی پانیە تەختم لەپێ دەکرد هاوبەژنم بوو. نازانم لەمەڕ ئەوە لە شووەکەم بەرزتر نەبم کەوشی پانیە بڵێندم دەبەر

نەدەکرد یا هەر بەڕاستی بە کەوشی پانیە تەخت راحەت تر بووم، دەستم درێژ کردە لای ئێمیل سیمۆنیان. ئەوەی کە کارێکی وام کردبوو ئارتووش بۆینباخ لیّ بدا زۆر بەجیّ بوو.

ئێمیل سیمۆنیان بە چاکەت و شالّواری سورمەیی، بۆینباخی بۆر و چاوی سەوزەوە بەرمزەی هاتیّ. کە دەستم بردە پێش دەستی هێنایە پێش. بەلاّم لەجێی تەوقە کردن داهاتەوە دەستمی ماچ کرد. ئارتووش پێگژی و دوانەکان زەق چاویان لە دەستی مـن و سەری ئێمیل سیمۆنیان بڕی کە قژە پڕ و چڕەکانی لێك و لووس و بریقەدار داهاتبووە سەری. تێنەگەیشتم کام یەك لە دوانەکان گوتی « چەند شیرینە.» و دووهەمیان گوتی « هەر وەك فیلمەکان.»

هیوادار بووم ئارەقەی لەشم لە ژێر باغەلّم دا جێی خۆش نەکردبیّ. پێدەچوو ئارمەن هـای لیّ نەبووبیّ. دەرفەتی ئەوەم نەبوو بیر لەوە بکەمەوە بزانم هۆشی لە کوێیە.

ئێمیل سیمۆنیان کە خۆی راست کردەوە، ئارمەن لەگەلّ ئێمیلی تەوقەی کـرد. ئارتووش چاوێکی لێکردم و برۆی هەلّتەکاند. هەموو جاریّ بە ئارمەنمان دەگوت « مەزن بوویە و دەبیّ وەك ئینسان لەگەلّ مێران تەوقە بکەی،» شانی هەلّدەتەکاند و تەوقەی لەگەلّ کەس نەدەکرد.

ئارسینە بە ئێمیلی گوت « راپۆنزێل دلّی بۆت تەنگ ببوو.»

ئارمینە گوتی « زۆر تەنگ ببوو.»

دەستە گولّە سوورە چکۆلّەکەم دایە خاتوون سیمۆنیان.

پنچکە گولّە سوورەکەی خۆم لە باغچەدا چاندبوو و بەو گشتە رەشبینییەی ئاغا مورتەزا کە هەموو جاریّ دەهات دەیگوت « خاتوون ئەندازیار، بیّ ئەدەبی نەبیّ بەشکم بە گولّ بیّ» حەوتووی پێشتر نوقمی گولّ ببوو.

خاتوون سیمۆنیان گولّەکانی بۆن کرد. سوپاسی نەکرد. بزەیەکی تالّی هاتیّ و بە دەست هێمای ژووری دانیشتنی کرد.

ژووری دانیشتنیشم لە ژوورەکەی خۆمان مەزنتر هاتە بەرچاو. راحەتییە دەستە ئاسنییەکان و مێزی فراوێن خۆری شەش کەسی کە لە دوو لای ژوورەکە دا ریز کرابوو، کەل و پەلێك بوو کە کۆمپانیای نەوت دەیدا بە هەموو مالّەکانی بواردە. زۆربەی بنەمالّەکان وەك ئێمە وایان پیّ باش بوو راحەتی و فراوێن خۆری چاکتر بکرن، پەنجەرەکان پەردەیان پێوە نەبوو و چەند کوتەسیم لە دیوارسمەکان* هاتبوونە دەریّ. دوانەکان یەکدەنگ گوتیان « ئێمە چووینە ژووری ئێمیلی.»

هەستم کرد ئارمەنیش گەرەکیە بچێ، بەڵام دوو دڵە. دڵنیا بووم ئەگەر بڵێم لێرە بە دەچێ. گوتم « تۆ لە لای ئێمە بمێنەوە.» لووتی تێك نا و لەگەڵ کیژەکان رۆیی. لە دڵی خۆمدا گوتم «خوا بکا بەر لە نیو سەعات شەڕی ساز نەکا.»

خاتوون سیمۆنیان دیسان گوڵەکانی ماچ کرد و بەرەو دۆڵابێك چوو کە بە رادەی نیوەی دیواری گرتبوو کە لە دارێکی رەنگ تاری بە دوو دەرگەی نەینووك دارەوە دروست کرابوو. نێوان دوو دەرگەکان وەك تاقە چووبووە ژوور. دوو شەمدانی کە هەر کام چەند لقی لێ جیا ببۆوە و هەر لقەی شەمێکی چەرمووی تێخرابوو، لەو جێگا شێوە تاقەیە داندرا بوو. دوڵابە مەزنەکە لەگەڵ کەل و پەلەکانی تری ژوورەکە رێك نەدەکەوت. خاتوون سیمۆنیان یەکێ لە دەرگاکانی کردەوە و گوڵدانێکی بلووری دەرێنا. دەوروبەری نەینووکی دەرگەکان بە وێنەی رەنگاوڕەنگی گوڵ و بولبول رازابۆوە. لام وابوو دۆلابەکەیان لە هیندوستانەوە هێناوە. ئێمیل سیمۆنیان خولقی کردم دانیشم.

لەم لایەی ژوورەکەوە کە هەر دەتگوت هیچ پێوەندییەکی بە لایەنەکەی تری ژوورەوە نەبوو چاوم لە خاتوون سیمۆنیان کرد. گوڵدانە بلوورییەکەی دانایەوە نێو دۆلاب ، گوڵدانێکی فەخفووری سووری راکرد، دەرگەی پێوەدا و روویدە من کرد. رەنگی ئەوەیان لەگەڵ رەنگی گوڵەکاندا رێکترە.» نازانم چی لە نیگای مندا دی کە بزەی هاتێ. « دۆلابەکەتان پێ جوان بوو؟ کاری ئینگلیزی سەدەی نۆزدەهەمە. پاشان دەستی بە گوڵدانەوە راداشت. « ئێمیل!»

کوڕەکەی هەستایەوە، گوڵدانەکەی وەرگرت و لەو دەرگەیەی کە دەمزانی بەرەو چێشتخانە دەکرێتەوە وەدەرکەوت. بیرم کردەوە " رێکتر؟" دەمێك بوو ئەم وشە دژوارە هەرمەنییەم نەبیستبوو؟ ئەمن بوومایە رەنگ بوو بڵێم تەرز و لەبارترە. یا زۆرتری لێدێ. بێشك جلی حەریری رەش و جەواهیرات زۆرتر لە دۆڵابەکە دەهات — لەگەڵ دوڵاب رێکتر بوو. — هەتا شڕە و بڕەی تر.

پیانۆیەکی رەش لە سێ سووچی ژوورەکە دابوو. سەری هەڵدرابۆوە و دوگمە سپییەکان ئاماڵ زەرد بوون. چەند لاپەڕە نۆت لەسەر جێ نۆتەکە بوو پیانۆکەم لێ دوور بوو و نەدەشیام ناوی ئاهەنگەکە وەخوێنم.

خاتوون سیمۆنیان گوڵەکانی بە سنگییەوە نا، هەر بەو زەردەخەنەوە چاوی لێم بوو. « چ نەوارێکی کەشخەت لە گوڵەکانداوە.» لە سیلەی چاومەوە ئارتۆشم دی کە لە نێو راحەتیدا جێی خۆش کردبوو.

ئێوارەی ئەو رۆژە نەوارە سوورەکەم لە دەوری گوڵەکاندا بوو و کردبوومەوە و لـوولم دابـوو هەتا ئاخرییەکەی گەردن بەسی* نەوار بە مەراقی من ببوو. هەر جارەی بۆ یەکێکم بە دیاری دەبرد، ئەو راڕاییەم لەگەڵ نەواری بەستەبەندیدا هـەبوو. ئـارتووش ئەگـەر دەیـدی دەیگـوت «ئەتۆش حەوسەلەت هەیە ها. کێ چاو لە نەوار دەکا؟» یەکەم جار بوو کە یـەکێ چـاوی لـە نەوار کردبوو.

ئێمیل سیمۆنیان بە گوڵدانی تەژی لە ئاو زۆڕیاوە. دایکـی گوڵـدانی دانایـە سـەر مێـزی فراوێن خۆری و یەك بە یەکی گوڵەکانی خستە نێو گوڵدان.

ئارتووش و ئێمیل باسی گەرم بوونی هەوایان دەکـرد و ئـەمن سـەیری دەسـتەکانی خـانم سیمۆنیان. گوڵدان رێك هاوڕەنگی گوڵەکان بوو و تەنیا رووناکایی ژوورەکە بە هۆی گلـۆپێکی رووتەوە بوو کە بە سیمێکی درێژی پاڵ پەنکەی میچەوە شۆڕ ببـۆوە هاوسـێکەم نـەواری بـە دەوری گوڵدانەکەدا هێناو توندی کرد و هات دانیشتە سەر راحەتییە سـێ نەفەرییەکـە و بـە دەست ئاماژەی کرد لە پالّی دانیشم. چووم لە پالّی دانیشتم. فەنـەرەکانی راحـەتی دەنگیـان لێوە هات، چەندجار بە دەستە چکۆڵەکەی لە ئەژنۆمیدا دوایە گوتی «ئێمیل!»

ئێمیل دیسان لەو دەرگەی کە بەرەو چێشتخانە دەکرایەوە وەدەرکەوت.

خاتوون سیمۆنیان لەسەر لێواری راحەتی دانیشتبوو و لاقی دەگەیشتە عـەردی ، کەوشـە ساتێنە رەشەکەی پشت ئاوەڵاو پانیە بڵێند بوو. پەپوولە گەلێك بە موورووی رەنگ زێوینـەوە بە کەوشەکانەوە دروابوو. رووی دە ئارتووش کرد. «هاوسەری تۆ لە ریزی ئەو چەند ئافرەتە بە فەرهەنگە هەر مەنییانەیە کە لە ماوەی سالانی دوور و درێژی ژیـان لـە چـوار قوڕنـەی ئـەم دنیایەدا شانازی ئەوەم بووە لەگەڵی ئاشـنابم. مرۆڤێکـی بەختـەوەری.» ئـارتووش چـەندجار پێلکی چاوی لێکدا، ئەوجار سەری بادا و گرێی بۆینباخەکەی شل کردەوە. ژوورەکە فرە گەرم بوو و لە رستە درێژەکەی جینارە بەژن بالاکەماندا واژەگەلێك بەرچـاو دەکـەوت کـە ئـەمن و ئارتووش زۆر لەمێژ بوو نەمان بیستبوو.

ئێمیل سیمۆنیان کە کەشـەفێکی زێـوینی چـکۆڵەی بـە دەسـتەوە بـوو گـەڕاوە ژوورەوە، گوڵدۆزییەکی سپی لەنێو کەشەفەکەدا بوو، تونگەیەکی ئاوی پرتەقاڵ و چوار شەربەت لەسـەر گوڵدووزییەکە داندرابوو.

ئاوی پرتەقاڵە شیلەوتێن و تاڵەکەم فڕ کرد و گوێم بۆ قسەکانی خاتوون سیمۆنیان شل کرد کە گەرمای ئابادانی لەگەڵ گەرمای هیند هەڵدەسەنگاند و دەیگوت بای کۆلێر بۆ پشت ئێشە

زەرەرێکی قەرەبوو نەکراوەی هەیە. ئەگەر ئەمن بوومایە دەمگوت " بۆ پشت ئێشە هەر هیچ باش نییە". لایەنی بێوازی بیرگەم قیژاندی « دە واز بێنە! پێویست ناکا هەرمەنییە کتێبیەکەی هاوسێت هەموو دەم وەرگێڕییە سەر ئەو هەرمەنییەی کە رۆژانە قسەی پێدەکەی.» لایەنی دلۆڤان پێکەنی. «بۆخۆشت ئەوە هەر کتێبی دەئاخۆی.»

هەولَم دا سەیری ئارتووش نەکەم. روالَەت و ئاکاری نائاسایی دایك و کوڕ، ئاخاوتنەکانی بە ناعیلاجی، ئاوپرتەقالَی تالَ و شیلەوتێن، گەرما و روونـاکی کـزی ژوور لـە هێـز و تـوانی منیش بە دەر بوو. دە چرکە سات تێنەپەڕیبوو کە خاتوون سیمۆنیان وێستا « ئێمە شـێو زوو دەخۆین.» ئارتووش وا بە لەز گوتی «ئێمەش هەر وەتر» کـە جـەرگم ئـاوری تێبـەربوو. بـۆ ناچارم کردبوو بێ؟ هەر بۆچی بانگێشتنەکەم قەبوولَ کردبوو؟ رەنگبێ لەمەڕ دوانەکان بووبێ کە بێ نێوبڕ لە بابەت ئێمیلی یەوە ئاخۆتبوون و ئەوەی کە ـــــ ئاخر هاوسێ بووین.

ئەوجار هەتا خاتوون سیمۆنیان گوتی «ئێمیل!» لە جێوە را بووم. رێگەم بدەن یارمەتیتان بدەم.» ئێمیـل سـیمۆنیان لەبنـەوە خێچـەیەکی لـێ کـردم، زەردەخەنـەی هاتـێ و دیسـان دانیشتەوە.

شێوی مندالَەکان بریتی بوو لە کەتەو مریشـکی کـولاَو کـە بڕیـار بـوو لـە سـەر مێـزی چێشتخانە بیخۆن. زۆر باش بوو کە بەر لە هاتن بابۆلَەم دابوویـە هەرسـێکیان. بـۆ شـێو یـا فراوێن هەر جارەی کە لە شوێنێکی نەناسیاو میـوان دەبـووین، لـە پێشـدا شـتێکم پێـدەدان بیخۆن، کەتە و مریشکی کولاَو چێشتێك بوو کە ئەو دەمانەی دایکم نەساغ دەبـوو پڕکێشـی دەکرد بیخۆن و هیچکات نەیاندەخوارد. شێوی ئێمە پلاَو و خۆرێشتی بامیە بوو.

مێز لەپێشدا رازابۆوە. روومێز و پەڕۆی سفرەکان لەکەتانی سپی دروست کرابـوو. دەوریـە فەغفوورییەکان بەو گولَە نارنجیانـەوە دیـارە کـۆن بـوون و بێشـك بـە قیمـەت گـران، بـەلاَم دەوریەکەی من لە دوو جێوە کەت بوو. خاتوون سیمۆنیان لە لای سەرووی مێز دانیشت و بـە من و ئارتووشی گوت لەسەر کام ئەسکەمل دانیشین. کەوتمەوە بیر قسەی دوانەکان:

«هەر وەك فیلمەکان.» خانەخوێ پەڕۆی سفرەی لێك کردەوە و بەسەر چۆکیدا دا و گـوتی «ئێمیل!» و ئاماژەی کردە دۆلابە دارینەکە.

ئێمیل سیمۆنیان شەمدانەکانی نێـو دۆلابەکـەی هێنـا و لـە ناوەنـدی مێزەکـەی دانـا و شەمەکانی هەلَکرد. ئارتووش لەبنـەوە خێسـەیەکی لێکـردم. خـاتوون سـیمۆنیان بـێ قسـە وجموجۆلَ، هەروەك چاوەڕوانی کۆتایی رێورەسمێك بێ، راوەسـتا هـەتا دوایـین شـەم هـەلَبوو و

کوڕەکەی دانیشت و پەڕۆی سفرەی لێك کردەوە، پاشان گـوتی «تکایـە دەس پێبکـەن.» روو مێزییە چەرمووەکە لە ژێر رووناکایی شەمدا زەرد دەینواند. زۆرتر لە یەك دوو جێگا پەڵـە و شوێنی سووتانی جگەرە دیار بوو.

یەکەم کەوچکم نایە زارم و هەوڵم دا چاوم وەچاوی ئارتووش نەکەوی. خۆرێشـتەکە هێنـدە تیژ بوو تەنانەت ئەمن کە چێشتی تیژم پێخۆشە ئاورم تێبەربوو. ئارتووش رقی لە چێشتی تیژ بوو.

خاتوون سـیمۆنیان قـاپێکی چـکۆڵەی فـەخفووری بـۆ لای ئـارتووش راداشـت. «ئەگـەر خۆرێشتەکە بە رادەی پێویست تیژ نییە لەم چاشنیە کەلك وەرگرە» ئارتووش شـەربەی ئـاوی دانایە سەر مێز و هەر سەری بادا. ئەمن بوومایە دەمگوت «لەم چاشنیە بەسەر داکـە». بـە خۆمم گوت بێدەنگ بە!

ئێمیل سیمۆنیان لەسەر کورسیلەکە ئەوبار ئەوبار بوو و بێ ئەوە سەری بەرزکاتەوە گـوتی «دایە واباشتر بوو خۆرێشتەکەت تیژ نەکردبا، هەموو هەر فێر نـین.» پاشـان چـاوی لـەمن و ئارتووش کرد و پێکەنی. هەستم کرد داوای لێبووردن دەکا.

دایکە دوو کەوچك چاشنی دە لایەکی دەوری کرد و بێ ئەوە چاو لە کوڕەکەی بکا گـوتی « تکایە دەستووری چێشت لێنانم پێمەدە. خۆرێشتی بامیە دەبێ تیژ بـێ.» ئـەوجار رووی دە من کرد. «چۆنیەتی دروست کردنی ئەم چاشنیە لە کەلکەتە لە چێشت لێنەرەکەمان "رامـۆ" فێر بووم.» قاپی چاشنی لەسەر خۆ دانایە پاڵ دیزەی برینج. «بەر لەوە وەدیوی دەرێی بنێم.»

ئێمیل سیمۆنیان دەستی بە قژیدا هێنا، تلەکانی باریك و درێـژ بـوون. ئـالیس دەیگـوت «مرۆڤە ناسك هەستەکان تلی باریك و درێژیان هەیە.» دەستی بە بەر چاوی دەگرت و تلەکانی رادەوەشاند. «وەك هی من.» سەیری دەستەکانی خوشکمم دەکرد کە وەك هـەموو جێیـەکانی تری گۆشتن بوو و سەرم رادەوەشاند کە «ئادی.»

بۆ ماوەیێ کەس نەئاخۆت، دەنگی بۆق و بەرسولکەکان لە حەوشەوە دەهـات. رووناکـایی ژوور هێندە بێ هێز بوو کە بە تەمابووم هەستم چرایەکی تر هەڵبکەم. خاتوون سـیمۆنیان بـە بێ دەنگی چێشتی دەخوارد. پێم وابوو دەبێ قسەیەکی تر بێنمـە گـۆڕێ. دەنگـی پێکـەنینی منداڵەکان لە ژووری ئێمیلییەوە دەهات. شێویان خوارد بـوو؟ چـۆن هیچـکامیان نـەیانگوت «پێم خۆش نییە.» ئێمیل سیمۆنیان هێشتا هەر چاوی بەردابۆوە و مـن قسـەیەکم بـۆ گـوتن نەدەدۆزییەوە.

ئارتووش شەربەی دووهەمی لەسەر مێز دانا و گوتی «لە مەسجدسولێمان لـە چ بەشـێك کارت دەکرد؟» ئێمیل سیمۆنیان سەری هەڵێناو زەردەی هاتێ. ئەوجار هەستم کرد بە تـەمای سیاسی کردنە. رەنگبێ بابەتی تاراندنی بێدەنگی بێ.

چاوم لە ئارتووش کرد و بیرم بۆ ئەوە چـوو کـە بـاوك و کـوڕ لـەو کارانـەی نـەیانکردووە کێبەرکێیانە. لەبیرم نەبوو شووەکەم لە قسە کردن لەگەڵ کەسیدا پێشقەدەم بـێ، مەگـەر بـۆ دژایەتی لەگەڵ دایکم دا.

ئێمیل سیمۆنیان پەڕۆی سفرەی بەرەو زاری برد و هەتا ویستی وەڵام بداتەوە دایکی گـوتی « ئێمیل خوێندکارێکی هەڵکەوتەبوو. لە هیند و دیارە لە ئەورووپا دا گەلێك ئیشوکاری فـرە باشی بوو. کۆمپانیای نەوت شانسێکی ئێجگار زۆری هێنا کە کوڕەکەم پێشـنیازی هاوکـاری قەبووڵ کرد. ئەگەرچی لە راستیدا ئێمە پێویستیمان بە مووچەی ئێمیل نییـە، بـەڵام هاتینـە سەر ئەوە ئێمە کە ئێستا لێبڕاوین لە ئێراندا بژین چ لـەوە باشـتر کـە ئێمیـل بـە کارێکـەوە خەریك بێ. هێشتا دەرفەت نەبووە ئەو سوپاسنامانەی کە لە زانستگا وەریگرتووە بە دیواریان هەڵواسم. بۆ سوپاسنامەکان رامسپاردۆتە لای بەنرخترین چوارچـێوە دروسـتکەری کەلکەتـە، گشتیان لە داری فۆفێل.»*

ئارتووش هەروا سەیری ئێمیلی دەکرد. «گوتتان لە کام بەشـدا کارتـان دەکـرد؟» دایکـە هەروەك هیچ قسەیەکی نەکردبێ وابوو.

ئێمیل سیمۆنیان پێکڕژی و چاوێکی لە دایکی کرد و دەستی بە قسە کرد. چـەندە شـێوەی کیژەکەی دەدا. لە چێشتخانەکەی ئێمەدا، کاتێ دایە گەورە هات. بێ واز و وەرەز.

ئارتووش پلاوی هەر بە تەنێ خوارد، تەنیا سەیری ئێمیل سیمۆنیانی کـرد و هـەر سـەری بادا. خاتوون سیمۆنیان بۆ جاری دووهـەم هێنـدە بـە سـەرنجەوە چاشـنی دە دەوری کـرد کـە دەتگوت ماجوومێکی کەم وێنە دەپێوێ.

لەبیری ئەوە دابووم کە ئەگەر گەڕامەوە ماڵ چۆن وەڵامی پرتە و بۆڵەی ئارتووش بدەمەوە کە خاتوون سیمۆنیان گوتی «منداڵەکانی تۆ لە چ سـەعاتێك دا دەخـەون؟» نیـو سـەعاتێك دەبوو منداڵەکان دەنگیان لێوە نەهاتبوو. نیگەران بووم. گوتم «زۆرتر سەعات نۆ. بـەڵام ئـەو شەوانەی کە وەك ئیمشەو بۆ سبەی ناچنە قوتابخانە ـــــ »

خاتوون سیمۆنیان کەوچك و چەنگاڵی لە قاپەکەدا لەپاڵ یەکتر داناو پەڕۆی سفرەی لەسـەر چۆکی راکرد. «چوون یا نەچوونی قوتابخانە نابێتە بەڵگە بۆ بەوەخت و ناوەخت نوستن. منـداڵ

دەبێ خوو بە بەرنامەیەکی دیاریکراو بگرێ. ئێمیلی سەری سەعات نۆ دەخەوێ. ئێمیل کە بچکۆلە بوو رامسپاردبووە پەرستارەکەی ـــــ » کورسیەکەم کێشایە دواوە و راوەستام. «سەرێك لە منداڵەکان بدەم.» ئێمیل سیمۆنیان لە جێوە رابوو و کەمێك سەری دانواند. ئارتووش قەپاڵێکی لە نان داگرت.

چەند چەمەدان لە سووچی دالأن لەسەریەك کەڵەکە کرابوو. پەیکەرەیەکی فیلی تاشراو لە بەرد لە پاڵ چەمەدانەکان دانرابوو. نیوەی خورتووم و کوتێك لە یەکێك لە گوێیەکانی فیلەکە شکابوو. سەیری سەعاتەکەم کرد. هەشت و چارەگێك بوو.

ژووری ئێمیلی تای ژووری ئارمەن بوو. ئێرەشم مەزنتر هاتە بەرچاو. جگە لە قەرەوێلەیەکی ئاسن، مێزێکی چکۆلەی لەسەر نووسین و مافوورێکی عەننابی شتێکی تری لێنەبوو. پەنجەرە پەردەی نەبوو و رووناکاییی ژوور کەم هێز بوو. دوانەکان لەسەر مافوور دانیشتبوون و ئارمەن لەسەر کورسی پشت مێزی لەسەر نووسین. ئێمیلی لەسەر تەخت پاڵ کەوتبوو. داوێنی جلە چەرمووەکەی تا سەرەوەی ئەژنۆکانی هەڵکشابوو. یەکێك لە کلکە مشکەکان کرابۆوە و قژەکانی بەسەر و چاویدا پەخش و پەرێشان ببوو. خۆی بە نەوارەکەوە خەریك کرد. ئەمنی کە دی قیت دانیشت، داوێنی داکێشا و هەر دوو دەستی خستە سەر چۆکی.

ئارسینە بەو قژە کرژانەوە کە لە ژێر دەرزیلە نارنجییەکەوە هاتبووە دەر چاوی لێم کرد. «چەند خۆش دەبوو سبەی ـــــ »

ئارسینە بەو قژە کرژانەوە کە لە ژێر دەرزیلە نارنجییەکەوە هاتبووە دەر درێژەی پێدا «ئێمیلی لەگەڵ ئێمە دەهاتە سینەما.»

ئارسینە گوتی « ئیزنی بۆ وەردەگری؟»

ئارمینە سەری چەماندەوە. « تکا دەکەین.»

ئارمەن کتێبێکی لەسەر مێزی نووسین راکرد و خەریکی لاپەڕە هەڵدانەوەی بوو.

گوتم «خۆش رادەبرێ ؟ چ کارگەلێکتان کرد؟»

ئارمینە گوتی « هەتا ئێستا هەر قسەمان دەکرد.»

ئارسینە گوتی « ئێمیلی تاریقی ئەو قوتابخانانەی دەکرد کە لێی خوێندوون.»

ئارمینە گوتی « بڕیار وایە ئێستا کایەی دەسکەلە* بکەین.»

ئارسینە گوتی « ئێمیلی فێری کردووین.»

گوتم « کایەی دەسکەلە؟» و هەناسەم قووت دایەوە.

ناسیاوی من و ئارتووش لەو کاتەدا روویدا کـە لـە جێـژنی لـە دایـك بـوونی دۆسـتێکی هاوبەشدا کایـەی دەسـکەلەمان بـە یەکـەوە دەکـرد. میوانـەکان بـە نـۆرە دەسـکەلەکانیان دەسووڕاند. کەسێکی کە دەسکەلەکەی سووڕاندبوو دەبوایە کەسێکی کە زارکـی دەسـکەملی بەرە و رووی دەوێستا رامووسێ. بڕیاری زەماوەندمان کە دا ئارتووش دانی پێداهێنا « هەوڵم دەدا دەسکەلەکە جۆری بسـووڕێنم کـە سـەری بـەرەو رووی تـۆوە بووەسـتێ.» دوای یەکـەم ساڵهاتی زەماوەند لە رووم هەڵات بڵێم « ئەمنیش هەروەتر.»

ئـارمـیـنـە گوتی «کـەسێکی کە دەسکـەلـەی هەڵدەسووڕاند ــــ »

ئارسینە گوتی « کەسێکی کە زارکی دەسکەلە بەرەو رووی دەوەستی ــــ »

ئارمینە گوتی « هەر دەستوورێکی گەرەکی بێ دەیدا.»

هەردوو گوتیان « خۆشە، وەنییە؟»

هەناسەم دایە دەرێ و پێکەنیم. « بە مـەرجێکی دەسـتوورگەلی مەترسـیدار لـە ئـارا دا نەبێ.» و بیرم کردەوە منداڵەکان چەندە پاك و قازاخن*.»

ئارتووش و ئێمیل لە ژووری دانیشتن دا قسەیان دەکرد. خاتوون سیمۆنیان مێزی شێوی کۆ کردەوە. پێم سەیر بوو چۆن کاری بە کوڕەکەی نەکردووە. یارمەتیم دا. لە هات و چۆی نێـوان شێو خۆری و چێشتخانە دا داوێنی جلەکەی هەڵکێشا و بێ نێو بڕ ئاخۆت « هەر لە رۆژی لـە دایك بوونەوە خزمەتکار و بەردەستم بوو. ئێسـتا ناچـارم بۆخـۆم کـارێ بکـەم. هینـد هـەر خراپییەکی کە هەیبوو نۆکەر و قەرەواشی فرە بوو، لە ماڵە باوکم لە جولفا دا خزمەتکارێکی زۆرمان بوو.» ملوانکە مروارییەکەم هەمیشە دە قاپ و قاچاخ و دەسگیرەی دەرگـە دەهـاڵا. «کە لە مەسجد سولێمان بووین کیژێکم لە جولفا هێنا. مێشکی چـاك کـاری نـەدەکرد. بـە بنەماڵەکەییم گوت کیژەیان بردەوە. پێم وایە سەری لە نەماگەرد وەدەرنـا بێشـك لـێم روونـە نازانن نەماگەرد کوێیە. ئێوە لێرە قەرەواشتان پێشك نایە؟»

ویستم بڵێم دەزانم نەماگەرد لـە کوێیـە، بـەڵام نـەمگوت و کەوتمـەوە بـیر ئاشـخێن کـە حەوتووی دووجار بۆ یارمەتیدانی کاروباری نێوماڵ دەهاتە لامان و حەوتووی جارێك دەچـووە مـاڵی ئـالیس و دایکـم. شـووەکەی پـاش ئـەوەی پشـتی برینگـەری کـرد سـەقەت ببـوو و مووچەیەکی کەمی بە هۆی خانەنشین بوونی لە کۆمپانیا وەردەگرت، کوڕەکەی تازە لـە سـەر بازی هاتبۆوە و بێکار بوو و ئاشخێن گوتەنی « لە بەیانییەوە تا شەو بـاژێڕی کوێتییـەکان و

ڕۆخ چەم پیّوان و ڕۆژێ دوو پاکەت جگەرەکێشان و تۆ تروکاندن ببوویە ئیشوکاری ژیانی، پێی وابوو دایکە قوڕ بە سەرەکەی کە ئەمن بم ئەسکناس لە دارێ لێوە دەکەم.» بیرم کردەوە هەم زەحمەتی هاوسێکەم کەم دەبێتەوە و هەمیش یارمەتییەکە بە ئاشخێن.

مێزی شێوکە کۆکرایەوە هەمبەر ئێمیل و ئارتووش دانیشتم. خاتوون سیمۆنیان لە شوێنی پێشووی دانیشت و گوتی «ئێمە دوای شێو میوە و چا ناخۆین. بۆ هەڵتاوێنی* چێشت زیان هێنەرە.» پاشان نێو نشانی بەقاڵییەکەی ئەدیبی وەرگرت کە لە نزیك ماڵەمە بوو و ژمارە تەلەفۆنی مامۆستای پیانۆی مناڵەکانی نووسی. «ئێمیلم هەر لە حەوت ساڵییەوە ناردە کلاسی پیانۆ. دەبێ درێژەی پێ بدا. بۆخۆم هەر لە پێنج ساڵییەوە پیانۆم لێدەدا.» گوتم چۆن بوو نەیگوت «دەمژەنی.»

ئێمیل لاقی هاویشتبووە سەر لاقی. کەوشە ڕەشە بریقەدار و گۆرەوییە ڕەشەکەی دەبەر کردبوو. ئارتووشیش لاقی هاویشتبووە سەر لاقی. کەوشی ڕەش و گۆرەوییەکانی قاوەیی بوون. خەتای خۆم بوو. لەبیرم چووبوو گۆرەوی ڕەش بخەمە پاڵ کەوشەکان.

چاوەڕێ بووم ئارتووش چاوێکم لێ بکا و ئاماژەی بکەم ماڵاوایی بکەین کە ئارمەن خۆی دە ژوورێ هاویشت. دەموچاوی سوورهەڵگەڕابوو و کۆخە دەرفەتی پێنەدەدا. تێگڕا بووم. «چ بووە» بە دەم کۆخەوە گوتی «ئاو.» ئێمیل سیمۆنیان وێستا. ئارتووشیش هەر وەتر. خاتوون سیمۆنیان خۆی نەبزاوت.

ئارمەنم بردە چێشتخانە. ئاوم تێکرد و دامە دەستی و پرسیم «شتێك پەڕییە ئەوکت؟» مژۆڵکە درێژەکانی بە هۆی فرمێسکەوە پێك وە نووسابوون، دیسان داوای ئاوی کرد، دیسان. کۆخی ، دیسان ئاوی خواردەوە هەتا ئاخرییەکەی هێمن بۆوە و بێ ئەوە چاوم لێ بکا گوتی «نازانم بۆ یەگجێ کۆخەم پێوە نووسا.» و لە چێشتخانە دەرکەوت.

ئارتووش دوانەکانی بانگ کردبوو و خەریك بوو سوپاسی خاتوون سیمۆنیانی دەکرد و ماڵاوایی دەخواست. ئێمیل سەری داخستبوو و نەوارە چەرمووەکەی لە دەوری تلی دەهاڵاند. ئەمن پێم وابوو یا بەراستی بزەیەکی تاڵی لەسەر لێوان بوو.

لەکاتی تەوقە لەگەڵ خاتوون سیمۆنیان و کوڕەکەی، لە سیلەی چاومەوە دیم ئارمەن چوویە لای دوانەکان و لەبن گوێیاندا سرتەی کرد ئارمینە داوێنی جلەکەمی کێشا. «سینەمای سبەی.» ڕووم دە ئێمیل سیمۆنیان کرد. «ئیزن دەدەی ئێمیلی لەگەڵ مناڵەکان سبەی بچێتە

سینەما؟» ئێمیل سیمۆنیان سەیری دایکی کرد. «ئارسینە لایەکەی تری جلمی کێشا. «لە دایە گەورەی بپرسە.»

خاتوون سیمۆنیان دوای ئەوە کە پرسی کامە سینەما و چ فیلمێك و لەگەڵ کێ دەچن و لەگەڵ کێ دێنەوە و کەی دەچن و کەی دێنەوە و نەکا لە سینەما چیپس یا بابۆڵە بخۆن ئاخری رازی بوو.

دوانەکان لە پانایی شەقامدا دەست دەبەر پشتی یەکتر دا بەر لەمن و ئارتووش و ئارمەن دەرۆیشتن. یەك دوو جار ئاوڕیانداوە و سەیری ئارمەنینان کرد و پێکەنین. دەرگەی ماڵێم کردەوە و چرای دالانێم هەڵکرد.

ئارسینە گوتی « ئۆخەی . چانیە ماڵەکەی ئێمە تاریك نییە.»

ئارمینە گوتی « ئۆخەی فێنکیشە.»

ئارسینە گوتی « زۆر خۆش گوزەرا، بەڵام ماڵەکەیان فرە تاریك بوو.»

ئارمینە گوتی « زۆر خۆش گوزەرا، بەڵام ماڵەکەیان زۆر گەرم بوو.»

ئارتووش بۆینباخەکەی کردەوە و بەرەو چێشتخانە چوو. «شتێکمان بۆ خواردن هەیە؟» ئارمەن بە بێ دەنگی چوویە ژوورەکەی و دەرگەی توند پێگدادا.

دووانەکانم ناردە ژووری خەو، پێڵاوە پانیە بڵیندەکانم داکەند و پێ پەتی چوومە چێشتخانە.

ئارتووش لە پشت مێز دانیشتبوو، زەق دە گوڵەکانی سەر قەرنێز رامابوو. « ئەو پیاوە بەستەزمانە. ئێستا دەزانم بۆ حاڵەتی ئاسایی نییە بەم دایکە ـــــ » مارمیلکەیەکی بچکۆلە لە پشت تۆڕەکەوە چاوی بڕیبووە چێشتخانە. بابۆڵەی هێلکەم دروست کرد. هێلکە لەهەر بیچم و هەرکاتدا چێشتێکی بە کەیفی شووەکەم بوو.

هەتا ئارتووش ویستی قەپاڵ لە بابۆڵە داگرێ هاواری ئارسینە بەرز بۆوە. « بڵێ ئیشی لە کوێیە دەنا دەڵێم بۆ کۆخەت گرت»

ویستم لە پشت مێزەکە هەستم کە ئارتووش دەستمی گرت و خوا دەزانێ چەندجار گوتی «خۆتیان تێمەقورتێنە. لێگەڕێ با شەڕی بکەن. پاشان ئاشت دەبنەوە. دیسان بە شەڕ دێن و ئاشت دەبنەوە لێیانگەڕێ. دوایە پێکەنی. مەترسێ ، یەکتر ناکوژن.» دەستم کە لە نێو دەستیدا بووتلی بە پشتی دەستمدا هێنا. جووڵەم لێوە نەهات. زۆر لە مێژ بوو دەستمی نەگرتبوو؟ دەستمی بەردا و بابۆڵەکەی راکرد و قەپاڵی لێدا. «پێستت چەندە وشك بووە.»

سەیری دەستەکانم و نینۆکە کردووە بێ لاکەکانی کرد. خاتوون سیمۆنیان لە کاتی تەوقە کردن دا ئاگاداری دەستە وشکەکانم ببوو؟ ئەدی کوڕەکەی؟ وەبیر ماچ کردنی دەستم کەوتمەوە و دیسان تووشی شەرمەزاری بووم. منداڵ دەنگیان نەهات و دوای نیو سەعات کە سەرێکم لە ژوورەکان هەڵێنا هەرسێکیان خەوتبوون و ئیشی دە باوەشی ئارمینە دا بوو.

# ٨

ڕۆژانی هەینی بە پێچەوانەی ڕۆژانی تر چێشتێکی تێر و تەسەلمان دەخوارد.
رادیۆ دایسا، هێلکەکانم دەنێو تاوە کرد و ئارتووش کە کەرە و پەنیری لە سەلاجە (دەیەنادەر) پێم گوت « ئەمن مێزەکە دەچنم، ئەتۆ بچوو ئارمەن لەخەو راکە بگەنە سینەما.»

ئارمەن لەبەر دەرگەی چێشتخانە دا گوتی « ئەمن وەخەبەرم، کیژە تەوەزەلەکەتان راکەن. سەرەڕای ئەوەش بەیانی باش.» قژی تەڕ و سەر و روو خۆش بوو. ئارتووش سەیری منی کرد و برۆی هەڵتەکاند. هەردوو دە کوڕەکەمان رامایین.

ئارمەن لە پشت مێز دانیشت. « چ باسە؟ ئینسانی حەمام کردووتان نەدیوە؟»

ئارتووش کەوگیری لەبن هێلکە و ڕۆنەکە هەڵدا. «ئینسانێك دەبینین کە زۆر بچێتە حەمام. ئارمەنی حەمام کردوو بەدەگمەن دەبینین.» هێلکە و ڕۆنەکەی دە دەوری ئارمەن کردو هەرتك پێکەنین. لە دە ساڵانەی ئارمەن بە دواوە، ناردنە حەمامی کوڕەکەم یەکێ لە ئەرکە دژوارەکانم بووە.

ئارمەن دەیبۆڵاند هێلکە و ڕۆنی دەڵەمەم پێخۆش نییە، ئارسینە و ئارمینە وەژوورکەوتن. سارافۆنی چوارخشتەکی سوور و سوورمەیی و فانیلەگەلی چەرموو لەبەر دا، هەرتك گوتیان هێلکە و ڕۆن ناخۆن و هەرتك داوای کەرە و مرەباو شیرکاوی ساردیان کرد.

فرووزەندەی ئەربابی لە رادیۆ دا گوتی « ئەم ڕۆژانە لە تاراندا بەهارە و خونچەو باران ــــ»

ئارمەن توند گوتی « ئەم ڕۆژانە لە ئاباداندا بەهار نییە و گەرما و شێدارییە.»

ئارسینە گوتی « چت گوت؟» ئارمینە بە دەنگی گنەوە گوتی « وەك فرووزەندەی ئەربابی ئاخۆت.» ئارسینە بە ئەدا دەرێنانی خوشك و برای قاقا پێكەنی و بە دەم پێكەنینەوە گوتی «فراوێن لە یانە دەخوێن،؟ ئارمینە گوتی «فراوێن لە یانە بخۆین.»

رۆژانی هەینی ئەگەر میوان نەبواین یا میوانمان نەبوایە بۆ فراوێن دەچووینە یانەی گوڵستان. منداڵەكان پلاو و كەبابی یانەیان پێخۆشبوو و ئەمن بیرم لەوە دەكردەوە چەند خۆشە كە حەوتووی جارێك هەموومان لە دەوری یەكتر بین. ئارتووش شەكری دە فینجانی چای كردو لێكیدا. «بە مەرجێك.»

ئارمینە پارووەكەی بە پەلە قووتدا. « مەرجی چی؟ سەر لەبەری كارەكانی قوتابخانەمان بەرێوە بردووە. مەشقی پیانۆشمان كردووە. ژوورەكەمانیشمان رێكوپێك كردووە.» و وەك هەمیشە لە خوشكی ویست داكۆكی لیێ بكا. « وەنیە، ئارسینە؟» ئارمەن بەشە دەڵەمە و توندەكەی هێلكە و رۆنی جیا دەكردەوە. « نێك و پێك ، وەنیە. رێكوپێك گێژە ــــ » چاوی بە من كەوت و پاشماوەی قسەكەی قوتدا. دوانەكان هۆشیان لە لای ئارتووش بوو. بلێ! بلێ چ مەرجێك.» ئارتووش چای لێگدەدا.

ئارمینە گوتی « باشە.» ئارسینە گوتی « هەر مەرجێك قەبووڵە.» پاشان هەرتك گوتیان « بلێ بلێ بلێ.»

من و ئارمەن و دوانەكان چاوەڕوان دە ئارتووش رامابووین كە بێ خۆ شلوێ كردن كەوچكی لەنێو فینجانەكە دەرێنا. هێمن و لەسەر خۆ خستیە نێو ژێر پیاڵە، لە پەنجەرەوە روانییە دەرەوە، سەیری منی كرد، ئەوجار لە ئارمەن و پاشان لە دوانەكان. هەتا ئەوەی كە گوتی « بە مەرجێكی كیژە ژیكەڵەكانم هەر یەكەی ماچێكی گەورە بدەنە باوكیان.»

ئارمینە و ئارسینە دایانە پێكەنین و لەجێوە هەڵبەزینەوە.

ئارمەن ریچ بۆوە و گوتی « بێ بێ بێ، چەند شیرنە.» پێكەنیم و خەریكی كۆكردنەوەی مێزی تێشت بووم.

ئارسینە لەسەر رانێكی ئارتووش را گوتی « بریا ئێمیلیش دوای سینەما هاتبایە یانە.» ئارمینە لەسەر لایەكەی دیكەی را گوتی « وەی! دەبێ بچینە شوێنی.» و لە كۆشی ئارتووش هاتەخوار. ئارمەن ئەسكەملی وەلانا. « ئەمن دەچمە شوێنی.» ئارتووش بە سەرەوەی قژە لوولەكەی ئارسینەدا چاوی لەمن كرد. ئارمەن گەیشتبووە دالان كە دوانەكان بە دوایدا هاواریان كرد « راوەستە!» و لە چێشتخانە وەدەركەوتن.

ئارتووش روا نییه دەرگەی چێشتخانه و گوتی « کوڕەکەمان زۆر بـه ئـەدەب و نەزاکـەت بووە.» پاشان لەجێوە هەستا.

« منداڵەکانم که له سینەما هێناوە، به شوێن تۆ دا دێم. له دایکم و ئالیسـیش تەلـەفۆن بکه ئەوانیش بێن.»

پێم سەیر بوو. ئارتووش زۆر باش دەیزانی دایکم و ئالیس پێویستیان به بانگێشتن نییـه و بێشـك دەهـێن. ئـەمنیش بـاش دەمزانـی ئـارتووش هـۆگری یـەکی ئـەوتۆی بـه هـاتنی هیچکامێکیان نییه. کەوابوو هۆی ئەم دلۆڤانی و خۆشەویسـتیه چـی بـوو؟ لـه داڵانـدا کـه هاواری کرد «منداڵەکانم که دانایه سینەما سەرێك له شاهینده دەدەم.» به خۆمم گوت « ها! ده بڵێ ئیدی ــــ » بانگم کرد « راوەسته!» و به دوایدا هەڵاتم.

له جەرگەی رێگه بەرتەسکەکەدا وێستا و چاوەڕێ ما هەتا بیگەمێ. خەریکی ردێنه بـزن ئاساکەی بوو و له سەر خۆ پێدەکەنی. کەوابوو گومان بردنەکەم دروست بوو. خـەریکی دانـی پیتاك* بوو. بەرەوڕووی وەستام. « ئەدی قەولت نەدابوو به شوێن شاهیندەوە نەچی؟ «قژەکەم لەنێو چاوانم لا دا. «سەدجار گوتم ئەو قسانەی که بیستت دروست نین. شاهیندەی بەستەزمان سیاسەتی له کوێ بوو؟ ئەوە دامنا جار و باره یەك دوو کەس دێنه دووکان و گاڵته دەکەین.» به تلی لەسەری کەپۆمی دا، « نیگەران مەبه. هەر شەربەتی گوڵاو و تۆ شـەربەتی دەخـۆم و دەگەڕێمەوە. شەربەتی بۆ تۆش بێنم؟» و پێکەنی.

هەرکەسێکی دەچوویه دووکانی شاهێنده ، ئەگەر هەوا زۆر گەرم بووایه. شەربەتی گوڵاو و تۆشەربەتی خولێ دەکرد و ئەگەر هەوا گەرم نەبووایه چای بـه لیمـو عـەممانی پێـدەدا. تـەنیا جارێك شەربەتی گوڵاوم خواردبۆوە و تامەکەییم هیچ پێخۆش نەبوو.

به یەکەوە بەرەو دەرگه ئاسنیەکه چووین و ئارتووش گوتی « بەڵکو حەقایەتێکی بـەتام و خوێشی لەمەڕ راوەوە گێڕاوە. ئەگەر هاتمەوە ماڵ بۆتانی دەگێڕمەوە.» گوتم«هەر ئەوە نییه له حەقایەت گێڕانەوەشـدا زۆر شـارەزای.» ئـەو رووداوانـەی کـه شـاهینده لـه راو کردنـەکانی دەگێڕایەوە، تەنانەت ئەوکاته که شاهینده به بێ وازی و سەر سەرەکیش دەیگێڕانەوە هەر بـه تام و خوێ بوون.

له کردنەوەی دەرگـەی کارێـژدا یارمـەتیم دا و گـوتم «بەڕاسـتی هـەواڵێك لـه دووکـانی شاهیندەوە نییه؟ ئەدی بۆ دوای ساڵی نوێ هەتا بەره بـەرەی جێـژنی پـاك داخرابـوو؟ عـەتر

فرۆشی پاڵدەستی گوتی لە تارانـەوە هاتنـە شـوێنی.» تـاو گەییـە سـەر شـۆڤرلێتە بیسـت ساڵانەکەی کە ببوویە دەستاوێزێك بۆ ئالیس هەتا بەم شێوە گەمە بە ئارتووش بدا.

دەرگەی ماشێنی کردەوە. « عەترفرۆش قسەی قۆڕی کردووە. شاهیندەش هەروەك من لـە تافی لاویدا هێندێ کاری کردوون. ئێستا ئیدی هەرتکمان لە شان و پیل کەوتووین.» سوار بوو و گوتی «هەر قسە دەکەین. دڵنیابە.» ماشێن دوای چەند سلفێك هـەڵبوو و ئـاڕتووش ئـەوە بەرەو دواوە لە کاڕێژ وەدەر دەکەوت کە منداڵەکان گەیشتنێ.

ئێمیلی قژەکانی بە هۆی دەرزیلەیەکی سوورەوە لەبەر چاوی لادا بوو. ئێستا کە قـژی بـە نێوچاوانیدا نەهاتبووە خوار، چاوەکانی درشت تر و لێو و کوڵمەکانی لە رووتـر دەیـان نوانـد. دیسان ئەوەم بە زەین گەیی کە لێوی سوور کردوون. ئارسینە و ئارمینە لالووت بوون. « دایە گەورە ئیزنی ئێمیلی نەدابوو بۆ شێو بێتە یانە.» «دایە گەورە گوتی شێوی دەرێ بـە ئێمیلـی ناکەوێ.» هەرتك دەستمیان گرت و رایانوەشاند. « ئەتۆ برۆ ئیزن وەرگـرە.» «تکایـە بـڕۆ.» «تکا دەکەین. ئارمەن چەند هەنگاو ئەولاتر بە نووکی پێـی وردکـە بـەردێکی پـاش و پـێش دەکرد. ئێمیلی سـەری داخسـتبوو، ئـارتووش لـەنێو ماشـێنەوە هـاواری کـرد « زوو کـەن، درەنگە.»

دەستم خستە سەر شانی دووانەکان و بردمنە لای ماشێن. « باشە، بەڵکو چووم ئیـزنم بـۆ وەرگرت.»

ئارسینە و ئارمینە لە پشتەوە دانیشتن. ئارمەن دەرگەی راگرت هەتا ئێمیلی سـوار بـوو. پاشان دەرگەی پێوە دا و چووە پێش و لەپاڵ دەستی بـاوە دانیشـت. ئـارتووش وەرێکـەوت و دەستی راوەشاند. دووانەکان شووشەیان داکێشا و هاواریان کرد «ئیزنـی ئێمیلـی . تکایـە.» سەرم لەقاند کە «باشە،» و دەستم راوەشاند کە «ماڵ ئاوا.»

راوەستام هەتا شۆڤرلێت گەییە ئاخری شەقام و زۆڕیاوە لای سینەما تـاج. بایـەکی گـەرم هات و دارە بێعارەکانی ئەمبەر و ئەوبەری شەقام بێوازانە جووڵانەوە. ئاغـای رەحیمـی، ئـەو هاوسێیەی کە کاڕێژەکانمان دیوار بە دیوارییەکەوە بوو، خەریکی ماشێنەکەی بوو. کوڕە پێنج ساڵانەکەی شاڵواری باوکی دەکێشا و دەگریا. «بچینە ئەستێلك، بچـینە ئەسـتێلك» ئاغـای رەحیمی سلاو و چاك و خۆشی کرد و پێکەنی. «رۆڵەگیان ئەستێرك هێشتا نەکراوەتەوە خۆ.» کوڕە پاکەتی "کول ئێد" بە دەستەوە دەینقاند. دەور و بەری لووتی نارنجی ببوو. لە ئابادان دا گەورەکان بە تۆزی کول ئێدی لیمۆیی یا پرتەقاڵی و تامگەلی تر شەربەتیان دروسـت دەکـرد.

بەڵام منداڵ پێیان خۆشبوو تۆزەکە هەروا بخۆن، زەمانیان پێشانی یەکتر بدەن و بپرسن « نارنجی بووە؟ سوور بووە؟ بنەوش بووە؟»

چۆنیەتی حاڵی خاتوون رەحیمیم لە ئاغای رەحیمی پرسی کە بۆ کڕینی کەل و پەلی زەماوەندی برازاکەی چووبووە تاران. پاشان ماڵ ئاوایيم کرد. دەرگە ئاسنیەکەی حەوشەم کردەوە، داخستەوە و بە رێگە باریکەکەی ناوەندی دوو پەڵە چیمەنەکە دا رۆیشتم. سەیری گوڵە سێوەرەکانی نێوچیمەنم کرد و کەوتمەوە بیر وتەکەی ئارمینە. « هەر وەك ئیسمارتیزەکانی بنەوش، وەنییە ئارسینە؟» هەرتك ئۆگری شەکەراتە خڕ و رەنگاورەنگەکانی ئیسمارتیز بوون. لق و پۆی دارەبیەکە شۆڕ ببۆوە سەرجۆلانە ئاسنیەکە و پنچکە گوڵە سوورەکە خونچەی تازەی دەردابوو.

# ٩

چوومەوە ماڵ و دەرگەم لە پشتەوە را گاڵە دا. لە ئابادان دا کەس لە جەرگەی رۆژ دا دەرگەی ماڵێی گاڵە نەدەدا. ئەمنیش هەر ئەو کاتانە هاچەرم لە قفڵدا دەسووڕاند کە گەرەکم بوو لە تەنیایی خۆم دڵنیابم. لایەنی بیانووگری بیرگەم گەلێك جار پرسیبووی « دەرگە گاڵە دان چ پێوەندیەکی بە تەنیا بوونەوەیە؟» هەموو جارێ وەڵامم دابۆوە « نازانم.»

پاڵم وەدەرگە داو چاوم نووقاند. دوای گەرما و رووناکی دەرەوە و هەرا و هۆریای منداڵان، فێنکایی و بێدەنگی و تاریك و روون بوونی ماڵ خۆش و دڵگر بوو. تەنیا هاشەی یەك چەشنی کۆلێرەکان دەهات و بۆنی ئۆدکۆلۆنی ئارتووش کە هێشتا هەر داڵانەکەی تەنیبوو. حەزم چووە قاوە.

سەیری سەعاتە دیوارییەکەی چێشتخانەم کرد. شتێکی وای بۆ دە نەمابوو. دایکم و ئالیس بێشك هەتا نیو سەعاتی تر پەیدا دەبن. پێم وابوو « دەبێ راوەستم بە یەکەوە قاوە بخۆینەوە.» پاکەتی جگەرەم لە سەلاجە دەرێنا. نازانم لە کوێم بیستبوو جگەرەم لە سەلاجە دا درەنگ وشك دەبێ.

جگەرەم زۆر نەدەکێشا. تەنیا ئەو دەمەی ماڵ چۆل بوو گەرەکم بوو دانیشمە نێو راحەتییە چەرم سەوزەکە، سەر وە پاڵپشتەکەی بدەم، جگەرە بکێشم و بیر بکەمەوە. لەو کاتە تەنیاییە

دەگمەنانە دا هەولّم دەدا بیر لە دۆزگەلی رۆژانــەی وەك شــێو و دەرس نەخوێنــدنی ئارمــەن و هێمنی و فەرامۆشکاری ئارتووش نەکەمەوە.

بیرم لە شتگەلێك دەکردەوە کە دەرفەتی بیر ئانینیان کەمتر بوو. وەك ماڵەکەمان لە تاران کە حەوشەیەکی بچکۆلەی بوو و هۆدەی مــەزن و دالآنێکــی دوور و درێــژ کــە لــە جەرگــەی رۆژیش دا تاریك بوو. بیرم لە باوکم دەکردەوە دوانیوە رۆیان کە دەهاتەوە ماڵ دەست و چاوی دەشورد و لە پشت مێز دادەنیشت و هەر ئەوەی کــە دایکــم دروســتی کردبــوو بــە ئیشــتیاوە دەیخوارد و بە حەوسەڵە گوێی لە دایکم دەگرت کە رووداوەکــانی رۆژانــەی زۆر بــە وردی بــۆ دەگێڕاوە. هەر لە کاڵ بوونی شووتییەکی کە ئەو رۆژە کڕیبووی هەتا گران بوونی لۆبیاچیتی و کێشەکانی من و ئالیس کە بێشك بەشێك لە رووداوەکانی رۆژانە بوو. باوکم لە ژێــر لێویــەوە شتگەلێکی دەگوت کە ئێمە بە باشی نەماندەبیست، سوپاسی دایکمی دەکرد بۆ فراوێنەکەی، بە دالآنە تاریکەکەدا دەڕۆیشت و دەچوویە ژوورەکەی کە لە بنــەبانی دالآنەکــە هەڵکــەوتبوو. ژوورێکی بچکۆلە بە پەردەگەلی مەخمەری قاوەییەوە. پەردە قاوەییەکان هەمیشە دادرابوونەوە و ژوور پڕ بوو لە شتگەلێکی کە دایکم گشت کات و ساتێك پرتە و بۆڵەی بوو « ئــەم زبــڵ و زاڵەت بۆچی راگرتووە؟»

دوای چللەی مەرگی باوکم ، لەگەڵ دایکم و ئالیس کە چووینە ژوورەکــەی بــاوکم، دایکــم گریا و گوتی « خوا دەزانێ ئەم زبڵ و زاڵەی بۆچی رادەگرت.» قەفەسەکانی تەژی لە کتێب و بڕاوەی رۆژنامە و گۆڤار و خشتە نیوە شیکار کراوەکان بوو. نامەگەلێکی تێــدا بــوو کــە نــە ئەمن و نە دایکم و نە ئالیس نووسەرەکانیانمان نەدەناسی. وێنەگەلێکی گشتی لــە ســەردەمی لاوێتی باوکم لەگەڵ هاڤالآنی . دوستگەلێکی کە هیچــکات نەمانــدیبوون. ئــالیس غــەریبی هەستابوو و دایکم دەگریا. ئەو هەموو ساڵە، ئەو هــەموو زبــڵ و زاڵــەی بۆچــی راگرتبــوو؟» کتێبەکانم لێك کردەوە و پێم وەدانەوە. ئەو سەعاتە دەستییانەی کە کاریان نەدەکرد هــەڵگێڕو وەرگێڕم کردن و بیرم کەوتەوە کە دایکم هەموو دەم سکالآی لــە بێبەڵێنیــەکانی بــاوکم بــوو. دەنێو کۆنە قتووی کەوشاندا چاوم بە تیغەی ژەنگــاوی ردێــن تاشــین کــەوت و لــەنێو دۆلابــە دارینەکە دا سەیری شووشە بەتاڵەکانی ئۆدکۆلۆنە جۆراو جۆرەکانم کرد. لــە وەتــا وەبــیرم دێ باوکم ردێنێکی چر و پڕی بوو و قەت بۆنی ئۆدکۆلۆنی لێنەدەهات.

ئالیس لە ژوورە چکۆلەکەی بنەبانی دالآنەکە دا شتێکی نەدۆزییەوە کە بایەخی راگــرتنی ببێ. کتێبەکانم راکرد و دایکم فرمێسکەکانی سڕیەوە و پەردە مەخمەرییە قاوەییەکانی لادا و

هەرچی وەبەر دەستی کەوت تووڕی هەڵدا. دایکم بە دوای بەتاڵ بوونی ژووره چکۆلەکەی بنەبانی دالآن، بەو باوەڕەکە ئەرکە سەرەکییەکەی خۆی بەڕێوە بردووە، بە بیرێکی ئاسوودەوە بۆ باوکم تازییەبار بوو و رستەی « ئەگەر باوکی خوا لێخۆشبووتان زیندوو بووـــــ » بوو بە بنێشتە خۆشکەی سەر زاری.

ورده ورده لەبیرمان چۆوە ئەگەر کوو باوکمان زیندوو بووایە ژیان هیچ گۆڕانێکی بەسەر دا نەدەهات. باوکم کتێبی دەخوێندەوە و خشتەی شیکار دەکرد و چێشتی چەوری دەخوارد و لە هیچ بابەتێکەوە رای دەر نەدەبڕی و ئەگەر دەریشی بڕیبایە ئێمە نەماندەبیست یا دەمان بیست و لەبیرمان نەدەما و درێژەمان بە ژیانی خۆمان دەدا. من هاوڕێی ئارتووش دەهاتمە ئابادان و منداڵەکانم گەورە دەکرد. ئالیس چەند ساڵێك دەچووە ئینگلتەرا، لە دڵی خۆیدا بە هیوای ئەوە کە شووەکی ئینگلیزی بدۆزێتەوە و لە رواڵەتدا بەشی پەرستاری بخوێنێ. دایکم رۆژێ دووجار هەردی چێشتخانەی دەشورد و غەیبەتی ئەو ژنانەی دەکرد کە کاڵەك و شووتی یان  بە نەشوراوەیی دە سەلاجە دەنا و هەموو رۆژێ بەڵگەیەکی بۆ دردۆنگ بوون دەیەناوە.

سەرم وە پاڵپشتییە سەوزەکەی راحەتی کرد و کەوتمەوە بیر سیمۆنیان. دەستە ناسکەکانی کوڕە، پێلاوە بە مووروو درووەوەکەی دایکی و ئێمیلی کە هێشتا وشەیەك لەگەڵ من نەدوابوو. پێم وابوو دایکی ئێمیلی دەبێ چ ژنێك بووبێ؟ دایکم گوتبووی « دین بوو و سەری لە نەماگەرد وەدەرنا.» ئەوەم بیرکەوتەوە ئەو هاوینەی کە چووینە نەماگەرد چەند ساڵانە بووم؟ هەشت ساڵانە؟ یازدە ساڵانە؟ رەنگبێ هاوتەمەنی ئێستای دووانەکان.

جیڕەی دەرگە ئاسنییەکەی حەوشەم بیست. سەرم کێشایە دەرێ و دایکم و ئالیسم لە پەنجەرە را دی کە دەهاتن. خوشکم بە جلکی زەردی فرەوانەوە، لە نێوان دارەکان و شمشادەکان و لە ژێر رووناکانی بە تینی رۆژ، شێوەی گوڵە بەڕۆژیەکی مەزن بوو و دایکم لەڕ و داتەکیاو بە جلکی رەشەوە، چەشنی کوتە دارێکی وشك هەڵاتوو. ئارمەن دەیگوت « پووره ئالیس و نانی کە بە یەکەوە بە رێگا دا دەڕۆن، وەك لۆرێل و هاردین.» خوشکم قتووه مقەبایەکی مەزنی بە دەستەوە بوو. نەدیتوو دەمزانی چییە. رۆژانی هەینی چوونە شیرینی فرۆشی نیگرو و کڕینی نان خامەیی تازە بۆ ئالیس لە چوونە کلێسا لە رۆژانی یەك شەممە پێویست تر بوو.

# ١٠

دایکم گازندەکانی خۆی لە گەرما کرد. ئالیس پشووی هاتەوە بەر. بە یەکەوە لە پشت مێزی چێشتخانە دانیشتن و خوشکم گوتی « دەی؟»

پێویستی نەدەکرد بپرسم « دەی، چی؟» ئەگەر هەڵدەکەوت بە بێ ئالیس بچمە شوێنێ ــــ کە زۆر بە دگمەن هەڵدەکەوت ــــ رۆژی دواتر دەبووایە سەر لەبەری رووداوەکانم گێڕاباوە و بەم حاڵەوە قایل نەدەبوو و قەیافەیەکی دردۆنگی بە خۆیەوە دەگرت کە « هەموو شتێکت نەگێڕایەوە.»

لە پاڵ ئاور و چاو لە قاوە جۆش کە قاوە هەڵنەچێ گوتم « دەی، دەبووایە چووباین . هەرچی بێ دراوسێن.» ئالیس دایە پێکەنین. « واتە ئەو هێندە خراپ تێپەڕ بوو؟ بێ گومان پرۆفیسۆر پرتە و بۆڵەیەکی یەکجار زۆری کرد.» دایکیشم پێکەنی قاوەم تێکرد، دامنایە سەر مێز و دانیشتم.

خوشکم بەنی دەوری قتووە مقەواکەی کردەوە و سەری هەڵگرت. نیو سەعات چاوەڕوان مام هەتا حازر بوو. تازەی تازەیە، هەرچی ئاغای مووسەوی داوای کرد لە جێگەی ئەوە دا شیرینی تەڕ بکرم نەچوومە ژێر بار. گوتم سێ خەروار گوڵاو دەنێو شیرینی تەڕ دەکەی. نەمگوت بە پێچەوانە نان خامەییەکانت هیچ قسەی تێدانیە، روودار دەبوو.» بە دوو تلان نان خامەییەکەی راکرد، قەپاڵی لێدا، چاوەکانی نووقاند و گوتی «خ خ خ ــ» واتە زۆر بەتام و چێژە. پاشان قتووەکەی کێشایە لای من و دایکم و بە دەمی پڕەوە گوتی « ب ب ب» یانی بخۆن. دایکم یەکێکی راکرد و ئەمن سەرم راوەشاند. «ئێستا لەگەڵ منداڵەکان تێشتم خوارد.»

دایکم گوتی « منداڵەکان لە ماڵ نین؟ ها! بڕیار بوو بچنە سینەما. ئارتووش لە کوێیە؟ ها! چووە منداڵەکان بگەیەنەتە سینەما، دەگەڕێتەوە؟ نا! بێشك دیسان بە شوێن شاهێندە داچووە.» و بە دوای ئەم پرسیار و وەڵامە یەك لایەنەیە دا قەپاڵی لە نان خامەیی داگرت، جووتی، قووتیدا و گوتی «سەد جار گوتوومە نابێ بە شوێن ئەم کەزی بڕاوە دابچێ. (شاهێندە قژە درێژ و چەرمووگەکەی وەك کلکی ئەسپی دەبەست.) فرۆتنی کەرەستەی راو بیانووە. (شاهێندە لە نزیك بازاڕی کوێتییەکان کەرەستەی راوی دەفرۆت.) کامە کاسبکارێك

لە رۆژی هەینی دا دووکانی کریاوەیە؟ (جگە لە رۆژانی هەینی کە دووکانی شاهێندە بێ گومان کریاوە بوو، خۆی گوتەنی لە حەوتوو دا تەنیا یەك دوو رۆژ کەرکەرەکەی هەڵدەداوە.) بەو قەڵافەتە زلە و سمێڵ بابڕیەوە شەرمی نەدەکرد وەك گەنج و لاوان جلی دەپۆشی.» (شاهێندە کراسگەلی فرەوان و یاخە ئینگلیزی و رەنگاوڕەنگی لەبەر دەکرد.) وەڵامی دایکم کە نەدواە درێژەی پێدا. «ئەمن قسەی خۆم دەکەم. لە دەس خوالێخۆشبوو و سیاسیەتکارییەکانی کەمم کێشاوە، ئەمجارە نۆرەی زاوامە. لە ئاوێ قوتارمان بوو تووشی لێمشت هاتین.» تا ئەو جێیەی لەبیرم بوو « سیاسەتکاری» باوکم لە چەند جار چوونە ئەنجومەنی ئێران و یەکیەتی سۆڤیەت ئەویش لەسەر داوای ئارتووش و بیستنی بەرنامەکانی رادیۆ ئەرمەنستان تێنەپەڕیبوو.

ئالیس قاوەکەی چێشت و لووتی هەڵقرچاند. « یەق! دەڵێی ژاری مارە.» جێ شەکرەکەی کێشایە پێش خۆی، بەم بیرەوە کە هەر دەڵێی باسی زەماوەندی دکتۆر لەبیر چۆتەوە. دایکم گەشاوە « ئاچۆ!» دایکە ئالیسی هەر جارەی بە ناوێکەوە بانگ دەکرد کە هەر لە منداڵییەوە لە سەری مابووــ خوشکم لەوەی کە بە ناوی ئاچۆ بانگیان دەکرد قوتووی دەبۆوەــ یانی لە ئالیس تووڕەیە. « دیسان لەسەر دەبەی شەکر دانیشتی؟» بێشك هەموو شت بەخێر گوزەرابوو کە دایکم جۆر بزەی دابووە بەر خۆی لەسەر ئالیس ببۆڵێنێ.

ئالیس دوو کەوچکی تەژی لە شەکری دە فینجانی قاوە کرد و لێکیدا. نان خامەیەکی تری راکرد و بێ سەرنج دان بە دایکم لای لەمن کردەوە. «بڵێ بزانم سەر و سەکوتی کوڕە چۆن بوو؟ دایکی جەواهێری تازەی بوو؟» دایکم لێوی کرۆشت و چاوی بڕییە بنەبان « یا مەریەمی پاقژ. دیسان دەستی پێکردەوە.»

لەبیری ئەوە دا بووم کە بە چ شێوەیەك بە ئێمیل سیمۆنیان هەڵ بڵێم؟ ئەو شتەی کە لە بیرم مابوو چاوەکانی بوو کە وا دەردەکەوت لە دوورەوە چاوی لە مرۆڤ دەکرد و دانیشتن، بە رێگە دا رۆیشتن، چێشت خواردن و گشت جموجۆڵەکانی نەرم و بێ پەلەکردن بوو. بەڵام ئەم شتانە بە کەڵکی خوشکم نەدەهات. گوتم « باڵا بەرز و تەڕ پۆش* و ــ جوان چاك.» گوتم و هەر لەجێوە پەژیوان بوومەوە. نان خامەیی سێهەم لە نێوان قتووی مقەبا و دەمی ئالیس وەستا. « چەند ساڵە؟»

فینجانەکەم دانایەوە نێو ناڵبەکی و شانم هەڵتەکاند. «نازانم ، پێم وایە نزیك چل.» دایکم سەری جێنان خامەییەکەی دانایەوە، کێشایە لای من و هێمای سەلاجەی کرد. ئالیس چاوی

له پەنجەرەو هۆشی لای ئێمەی نەبوو. دایکم گوتی « دڵنیام کە هەر هێندەیە.» پاشان دە ئالیس راما. «هەر بیریشی لێ مەکەوە.» ئالیس رووە و پەنجەرە دەستی دە نێو قژی نا.
«سبەی نۆبەی سەلمانیمە.» ئەوجار چاوی دەمن بڕی. « بە بڕوای تۆ قژم کورت بکەمەوە؟»

دایکم لە منی روانی و سەری راوەشاند. هەرتکمان رووداوەکانی دواییمان لەبەر بوو. هەرکات سەرو کەلارەی مرۆڤێکی رەبەن وەدیار دەکەوت، ئالیس بەر لە هەر شتێ شێوە رازاندنەوەی قژی دەگۆڕی، پاشان چەند رۆژ یا چەند حەوتووــ پێوەندی بە درێژەی پێشهاتەکەوە هەبووــ پارێزی رادەگرت و خۆی گوتەنی و دوور لە چاوی ئێمەوە کێشی* کەم دەکردەوە. هەستام قولێنەی میوەم لە سەلاجە دەرێنا. ئەو بەڵێنییەم بیر کەوتەوە کە بە باوکم دابوو و لە دڵی خۆمدا هەر دووپاتم کردەوە « باسی لێ مەکە.»

ئالیس گوتی هۆشت لە کوێیە؟ پرسیم قژی کورت لە منـــ دەستم دایە کۆکردنەوەی فینجانەکان و بە پەلە گوتم «بێ گومان ، بۆچی نا؟»

ناڵەی ئیستاپی شۆڤرلێتی ئارتووش بەرز بۆوە و دوای چەند ساتێ دوانەکان رایانکردە ژوورێ.

« هەلۆو نانی!»

« هەلۆو پوورێ!»

دایکم ئارمینەی لە باوەش گرت. «دیسان گوتیان هەلۆو؟ خۆ ئێمە ئینگلیزی نین؟ بلێ بارێو.»

ئالیس ئارسینەی گرتە باوەش. « دیسان لە منداڵەکانت هەڵپێچا؟ لە ئابادان دا کەست پێشك دێ نەڵێ هێلۆ؟ خۆشت زۆرجار لە وشەی ئینگلیزی کەلك وەردەگری.» ئالیسیش بە روو هەڵماڵاوییەوە. « تۆ؟ هەمیشە!» سەری بۆ لای راست خوار کردەوە و لاسای دایکمی کردەوە. "فەن"ی چێشتخانە خرابووە.» سەری بۆ لای چۆپە خوار کردەوە. « ئالیس چۆتە هۆسپیتاڵ.» دیسان بۆ لای راست، "ئیستۆر" نانی "توێست"ی نەبوو، رۆڵم کڕی.» دیسان بۆ لای چۆپە، « منداڵینە ئاگاداری خۆتان بن لە "بایسکل" نەکەونە خوار.» دە دایکم راما «تێنی سوز»ەکانی ئارمەن کۆن بوونە. کە دیارە تێنی سوزنیە و "تێنیس سوز"ە.»

منداڵ پێکەنین، دایکم خێسەیەکی* لە ئالیس کرد و گوتی « دوێنێیەکێ لە دکتۆرەکان شتێکی بە تام وخوێی گێڕاوە.»

ئارمینە لە هەمبەر ئالیس دانیشت. « پوورێ ئەتو بیگێڕەوە هەتا دوایی ئێمەــــ»

ئارسینه له پاڵ ئارمینه دانیشت. « هەتا دوایێ ئێمه فیلمەکه تاریف بکەین.»

ئـالیس بـه دایکمـی گـوت «نـان خامەییـەکان چـیان لێهـات؟ دیسـان ده سـەلاجەت پەستاوتەوە؟»

ئارمینه گوتی « پووری بیلێ.»

ئارسینه گوتی « بیلێ پووری.»

ئارمینه که بەرەو سەلاجەکه دەچوو دەستم گرت و تلم بۆ لای راداشت که «نـان خامـەیی بێ نان خامەیی.»

ئالیس گوتی «یەکێ له ئەنداز یارانی ئینگلیز چۆته سەردانی بنیاتگەلی نازانم کوێ. سەر کریکار له لای خۆی وەرگێڕی قسەکانی ئەندازیار بووه بۆ کرێکارەکان. ئەنـدازیاره ئینگلیـزی یەکـه گوتوویـە"Tell Them to bend The pipes"" سـەر کرێکارەکـه گەڕاوەتـەوه قیژاندوویەته سەر کرێکاران «ئاغای وۆڵك! گوتی لوولەکان قایم بکە.»

هەموومان پێکەنین جگه له دایکم که خۆی مۆڕ کردەوه و گوتی « زۆریش بێتام بوو.»

ئارمینه گوتی « بەڵام فیلمەکەی زۆر به تام و چێژ بوو.»

ئارسینه گوتی « بەڵام سینەما تاج هەر دەتگوت سەلاجەیە.»

« هێنده سارد بوو.»

« دایه، ئیزنی ئێمیلی چی لێهات؟»

« وەرت گرت؟»

« تەلەفۆن بکه»

« نا، بچۆ ماڵەکەیان.»

« نا، پووری. شیرینی ناخۆین. دەبێ فراوێن بخۆین.»

« دایه، تکایه بڕۆ ئیزنی وەرگره تکایە.»

دەستم نایه سەر سەرم. « دەرفەتم بدەن. ئەوه چووم» و هەستامەوە.

له چێشتخانه که وەدەرکەوتم، ئارمینه و ئارسـینه لـه کۆشـی پـووری و دایـه گـەوره دا دانیشتبوون و رووداوی فیلمەکەیان دەگێڕاوە. به پێچەوانەی هەر جارەی که لـه دڵـی خۆمـدا دەمگوت « بەڵکو ئەم یەکەیان ـــ » ئەوجار چووکترین دڵەڕاوکێم نەبوو که ئەم یەکەیان بـه هیچ کلووجێ به کەڵکی ئالیس نەدەهات . بۆنی لیتاوی * جۆگەلەی شەقامەکەم بۆ هات.

هەر وەك یەكێ چاوەنوارِ بێ، تلم لەسەر زەنگ هەڵنەگرتبوو كە دەرگە كرایەوە و خـاتوون سیمۆنیان هێشتا سلاوی لێ وەرنەگرتبوومەوە گوتی « نا. بە هیچ كلوجێ نابێ. چێشتی دەرێ لەگەڵ مەزاقی ئێمیلی رێك ناكەوێ. ئێستاش دەبێ و چان بدا.» لە كـەلێنی دەرگـەوە چـاوی فرمێسكاوی ئێمیلم بینی.

لە گەرِانەوە دا لایەنی رەخنە گرم تانەی لێدام. «نارەحەت بووی؟ ئیدی هەتا هەی بۆ هەر شتێ بە گوێی مندالەكان نەكەی.» لە وەلامدا گوتم « پشتی دەستم داغ كرد.»

ئارمەن گوتی « وازی هاتنە یانەم نییە.» هەتا گوتم « چ لەوە باشتر، لە مالـێ بمێنیـەوە دەرست بخوێنە،» بەر لە هەمووان چوو سوار ماشێن بوو.

لەگەڵ دایكم و ئالیس لە دواوەی شۆڤرلێت دانیشتین. ئارمینە لە پـاڵ ئـالیس و ئارسـینە دانیشت و دوای ئەوە كە بەلێنی لێ وەرگیرا عەزیەتیان نەكا لە پێشـەوە لـەنێوان ئـارتووش و ئارمەن دانیشت.

دووانەكان لە بواردەی باكوورەوە هـەتا بـرِەیم لووتیـان داهێشـت و قسـەیەكیان نـەكرد. ئارمەن ئاژۆتنی ماشێن لە ئارتووش فێر دەبوو و ئالیس و دایكیشم باسی ئەوەیان دەكرد كـە رۆژوی مەزنی جێژنی پاكی سـالی داهـاتوو لـە كەیـەوە دەس پێـدەكا و رۆژووی چـكۆلە لـە كەیەوە. ئالیس لە ئاخریدا گوتی «جارێ هەتا جێژنی پاك چەندی ماوە. هەرچی بێ خۆ ئەمن بە رۆژوو نابم. ئەو ساڵ پێبووم، بۆ حەوت پشتم بەس بوو.»

دایكم گوتی « دەبێ پێبی.»

ئالیس گوتی « پێنابم.»

« پێنابم و ژەقنەمووت. دەبێ پێبی.»

« پێنابم.»

دایكم وەك پشیلەیەكی توورِە خۆی فش كرد و نقورچێكی گورچ و برِی لە باسـكی ئـالیس داگرت. ئالیس كە قیژاندی « وەی وەی !» دووانـەكان دایانـە پێكـەنین و گەشـانەوە. كێشـە تازەكان یاكوو گالتەی دایكم و ئالیس باشترین رێگەی وەپێكەنین خستنی دووانەكان بوو.

# ١١

ئالیس لەبەر دەرگەی یانە دا دە گوێمی سریواند «تکایە بانگێشتنیان بکە.» هەناسەیەکی دوور و درێژم کێشا و وەڵامی سڵاوی ئاغای سـەعادەت بەرپرسـی نێوخـۆم داوە و لـە حـاڵی هاوسەرەکەییم پرسی کە دوو حەوتوو پێش چوارەمین منداڵی لە دایك ببـوو. ئـارتووش رۆژان ئاسا لەگەڵ ئاغای سەعادەت تەوقەی کرد و وەك هەمیشە ئەم کارەییم بە دڵ بوو. بەدەگمـەن دیبووم ئەندامانی یانە لەگەڵ بەرپرسی نێو خۆ تەوقە بکەن.

دووانەکان زیقاندیان « هۆی ! می می!» و رایانکردە لای کیژە وردەڵەیەکی کە هاوپۆلیان بوو و مارگریتای ناو بوو و دایکی جەختی* لەوە دەکرد کە بە می می بانگی بکەن. می می یا مارگریتا هەتا چەند مانگ بەر لەمە لە بوواردەی باکوور دا دەژیا. منداڵەکان کـە وردتـر بوون لە باوکی مارگریتا کە زۆر باڵا بەرز و قەڵافەتێکی زور زل و ریشـێکی چـڕ و پـڕی بـوو دەترسان و ناویان نابوو "گولێر". لـە ئارتووشـم بیسـتبوو پلـە یـا بـە وتـەی ئابادانییـەکان گرەیدی* "گوریل" چۆتە سەر وماڵیان لە بڕەیم گرتووە. ئەودەم لە بوواردە بوون مارگریتـا گەلێك جار لەگەڵ منداڵەکان لـە قوتابخانـەوە هـاتبووە مـاڵی ئێمـە و لـەوێ مـابۆوە هـەتا ئاخریەکەی دایکی بە شوێنی دا بێ و شـڵەپەتانی داوای لێبـوردن بکـا کـە "ببـوورن ئەگـەر درەنگیشم کرد، کـارم بـوو." هـەموو هەرمەنییـەکانی ئابـادان بـە سـەرقاڵ بـوونی دایکـی مارگرێـتایان دەزانی. قومار کردن و کات رابواردن لـە میلکبـار، قاوەخانەیـەکی کـە تـازە دانرابوو.

ئالیس دەستمی گرت و وەرێکەوت . « وەرە.»

پێویست نەبوو بپرسم بۆ کوێ. بۆ هەر کوێ چووباین یەکـەمین کـاری ئـالیس دۆزینـەوەی نەینووك و دڵنیابوون لە وەی بوو کە قژەکانی ئـاڵۆز نـەبووە و سووراوەکەشـی پـا نەبۆتـەوە؟ پێویستی بەوەش نەدەکرد بپرسم ئەمن بۆچی بێم؟ مەحاڵ بوو ئالیس تەنیا بچێتە دەستشۆری.

دایکی مارگریتا کە ناوی ژوولێت بوو و دەیویست بە ناوی ژوو ژوو بانگی بکەن، قژەکانی لە دەسشۆریدا رەنگ دەکرد. بۆ دوایین جار کە لە شەونشینی بووت کلاب دا یەکترمان دیبوو، قژەکانی خورمایی بوو. هەنووکە سوور بوو، هەروەك رەنگی سووراوەکەی.

لە ئاوێنە دا کە ئێمەی دی زۆریاوە. لـە ناعیلاجیـان سـڵاوێکی کـرد و گـوتی « زۆر بـە جێیە، ئێوە و ئێرە، ئێرە و ئێوە؟» رستە کورتەکەی ئەم مەبەستەی دەنواند ئێوە کە ماڵتان لە

بووارده‌یه و پله‌تان نزم، له یانه‌ی گوڵستان که تایبه‌تی دانیشتووانی بڕه‌یمه، له‌گه‌ڵ پله بـه‌رز و ڕیز داره‌کان چ ده‌که‌ن؟

ئالیس که هه‌ناسه‌یه‌کی دوور و درێژی کێشا و سنگی ره‌پێش خست زانـیم خـۆی گوتـه‌نی هه‌نووکه‌یه که دایکی مارگریتا بشوا و بیکوشی و هه‌ڵیخا. له‌پێشدا چاوێکی له نه‌ینووك کرد و هه‌ر که له ڕێکی قژه‌کانی و پڕ ره‌نگ بوونی سووراوه کـه دڵنیـا بـوو زوریـاوه لای دایکـی مارگریتا و هه‌تا وه‌خۆ هاتمه‌وه پرسی «ببووره، ژوولیێت، پله‌ی شووه‌که‌ی ئێوه چه‌ند بوو؟»

دایکی مارگریتا دوو برۆ که‌وانییه‌که‌ی هه‌ڵته‌کاند. «ژوو ژوو. پازده. چۆن؟»

ئالیس بزه‌ی هاتێ. « زۆر به‌جێیه. که‌وابوو هێشتا سێ پلـه‌ی مـاوه بگـا بـه شـووه‌که‌ی خوشکم.» پاشان ده‌ستی ده‌بن هه‌نگڵم ناو گـوتی «وه‌ی وه‌ی! بـۆنی ئـه‌م تافتـه خنکانـدمی. کلاریس وه‌ره.»

له ده‌سشۆری که هاتینه ده‌رێ گوتم « بۆ قسه‌ی بێ جێ ده‌کـه‌ی؟ شـووه‌که‌ی و ئـارتووش هاوپله‌ن.» ئالیس ده‌ستی له بن هه‌نگڵم ده‌رێنا و بۆ یه‌کێکی راوه‌شاند. « چاکم کرد. هه‌تاکو مه‌یموون خاتوون ئیدی پله‌ی شووه سندان کوشتووه عه‌نته‌ره‌که‌ی به چاوی خه‌ڵکی دانه‌داتـه‌وه. ئه‌گه‌ر پرۆفیسۆر ده‌ستی له‌و رکه به‌ریانه هه‌ڵگرتبا و وه‌ك ئینسـان لـه بـڕه‌یم مـاڵی گرتبـا، مه‌جبوور نه‌بووین زڕه زڕی هه‌ر تازه سه‌رهه‌ڵدراوێکمان قه‌بووڵ کردبا. هه‌روه‌ها بیستت له‌بـه‌ر ده‌رگه چم گوت؟ بانگێشتنیان ده‌که‌ی؟» له پڕ به توندی پێکه‌نی و به ده‌نگی به‌رزه‌وه گـوتی « سه‌للام !» و چووه لای ژن و مێردێکی که بیرم نه‌هاته‌وه کێن. بیستبووم له‌به‌ر ده‌رگـه چـی گوتبوو و پێویستی به‌وه نه‌بوو بپرسم کامانه بانگێشتن بکه‌م.

ئارتووش له‌به‌ر ده‌رگه‌ی ته‌لاری چێشت خۆری له‌گه‌ڵ سه‌رخزمه‌تکار ده‌ئاخۆت. چوومه لای و له‌سه‌ر ڕێگه چاوێکم له ژووری تـه‌لاری کۆبوونـه‌وه‌کان کـرد کـه هـه‌ر دوو لنگـه‌ی له‌سـه‌ر گازه‌ره‌ی پشتێ بـوو. سـی چـل ژن له‌سـه‌ر حـه‌وت هه‌شـت ریـز کورسـی پشـت بـه ده‌رگـه دانیشتبوون. له رووبه‌ڕوودا و له پشت مێزێکی که روو مێزی ماوتی سه‌وزی کێشرابووه سه‌ری و گوڵدانێکی ته‌ژی له گوڵی مینای له سه‌ر داندرابوو، ژنێك نوتقی ده‌کرد. له شینیۆنی درێژی قژه‌کانی و پاپیۆنی سه‌ر سه‌ری را زوو ناسیمه‌وه. خاتوون نوروڵلایی بوو. هه‌موو جـارێ سـه‌رم سووڕ ده‌ما له وه‌ی که چۆن ئه‌م شینیۆنه درێژه دروست ده‌کا. ئارمـه‌ن بـه نه‌وارگـه‌لی شـێوه پاپیۆن که خاتوون نوروڵلایی له جه‌رگه‌ی شـینیۆنی* قـژه‌کانی ده‌دا و هه‌میشـه لـه ره‌نگـی پارچه‌ی جلی بوو ده‌یگوت « نیشانه‌ی تجاره‌تی مـیرزای بـاوکم.» کـه تێمـده خـوڕی* « بـه

عەدەب بە!» ئارتووش پێدەکەنی. « ژنێکی لایەقە. دامنا کەمێ زۆر وێژی دەکا و هێندێ جار لە خۆڕا هەڵدەخرۆشێ.»

ئارمەن کە خەریکی کێشانی قژی ئارسینە بوو پێم گوت «وامەکە.» دەستی ئارمینەم گرت کە خەریك بوو خۆی بۆ لای ئارمەن رادەپسکاند کە بەرگری لە خوشکی بکا.

ئارتووش گوتی « مێزی بەتاڵ نییە. دەبێ نیو سەعات راوەستین.» پاشان رووی دە ئارمەن کرد. « بیستم گەرەکتە چەن دەس پینگ پۆنگم پێ بدۆڕێنی.» ئارمەن پێکەنی. « نا گەرەکمە بیبەمەوە.» دووانەکان خۆیان هەڵاویشت. « هەر کام بردییەوە، دووای فراوێن بۆ هەمووان ساردەمەنی بکڕێ.» ئارتووش دەستی دووانەکانی گرت و لەگەڵ ئارمەن چوونە لای مێزەکانی پینگ پۆنگ ، لە پشت سەریانەوە گوتم « کەوابوو ئەمن لێرە چاوەڕێم،» بەڵام نەیان بیست.

لە ژێر چاومەوە دیم دایکم و ئالیس لەگەڵ ژن و مێردێکی خزمی دوورمان دەئاخۆتن. نە وازی ژنەکەم بوو نە مێردەکە. ئەندامی کۆمەڵەی ئاینی "لایەنگرانی مەریەم" بوون و بەردەوام پرۆ پاگەندەیان دەکرد و جەختیان لەسەر ئەوە بوو کە لە کۆ بوونەوەکانی تاقمەکەیاندا بەشدار بین. بۆ ئەوە کە چاوم بە چاویان نەکەوێ خۆم بە تابلۆی ئاگادارییەکانی تەلاری کۆبوونەوەکان خەریك کرد. " ژن و ئازادی"ـــ نوتقکەر خاتوون پەروین نورولڵایی — سەعاتی دەس پێکردن: یازدە و نیو. چاوم لە سەعات کرد نزیك دوازدە و نیو بوو و بێشك کۆتاییەکانی ئاخۆتن. چوومە ژووری تەلار و ئەوەم بە بیر داهات کە تا ئێستا نەمدەزانی ناوی چکۆلەی میرزای ئارتووش ، پەروینە.

لەسەر یەکەم کورسی بەتاڵ دانیشتم. دوو ئافرەت، یەکیان پیرو ئەویتر گەنج لە کورسییەکانی قەراخەوە چاویان لێم کرد، سەریان راوەشاند و بزەیان هاتێ. پیرێژن لەنێو پاکەتەکەی نێو لینگانیدا بادام زەمینی دەردێنا و دەیخوارد و ئافرەتە گەنجەکە بە پەلە جاجکی دەجاوی. خاتوون نورولڵایی دەیگوت « جارێکی تر دووپاتی دەکەمەوە کە یەکەم خواست و مەبەستی ئافرەتانی ئێران بوونی مافی دەنگدانە.»

دوایین کەڕەت کە نینا و گارنیك میوانمان بوون، گارنیك و ئارتووش باسێکی دوور و درێژیان دەست پێکرد. لە ئاخرییەکەیدا گارنیك گوتی « ئێمە بۆ دەبێ خۆمان دە کێشەکان هەڵقورتێنین؟» ئارتووش گوتی « ئێمە ئێرانین یا نا؟» گارنیك لە وەڵامدا گوتی « ئێمە هەرمەنین یا نا؟» نینا گوتی « مافی دەنگ بۆچی؟»

خاتوون نوروڵلآیی دەنگێکی ناسکی بوو و ئاخری رستەکانی لەبەر یەك دەکێشـاوە. « لـە کۆتاییدا دەبێ بڵێم کە ئێمە هەتا ئێستا لەم رێگەوە هەوڵێکی زۆرمان داوە. ئافرەتی ئێرانـی دەنگی زۆر هەڵبڕیوە. بەڵام ئەوەی لێرەدا بەرچاوە ئەوەیە کە ئەم دەنگانە یەکگرتوو نـەبووە و لە رێگەیەکەوە نەبووە و بەری لە رێگکەوتن بووە‌ـــــ»

پیرێژنە کە داهاتەوە بادام زەمینی خولّق کردم و بزەی هاتێ. بزەم هاتێ و بە هێمـای دەس گوتم کە « نا » ئافرەتە گەنجەکە هۆشی لە لای ئاخاوتنـەکان بـوو و سەریشـی بـە ئاهـەنگی جاجك جاوینەوە دەلەقاند. خاتوون نوروڵلآیی گـوتی «و ئێسـتاش لـە کۆتاییـدا ئیـزنم بـدەن شیعرێك بخوێنمەوە.» بیرم کەوتەوە سەرچەفە ئوتوو نـەکراوەکانم دە کەشـەوی دۆلابـی ژووری خەو نەناوە. خاتوون نوروڵلآیی خوێندییەوە.

رابە خوشکم.

لە دنیایەکی کە جەمیلەکان بە خوێنی خۆیان

فرمانی ئازادی نەتەوەیەك لەسەر لاپەڕەی مێژوو دا تۆمار دەکەن

تەنیا هەبوونی لێوی ئاڵ و چاوی خومار مەرج نییە بۆ ئافرەت بوون.

پیرێژن بە دەنگێکی کە منیش بیستم بە بن گوێی ئافرەتە گەنجەکەی گوت «خۆ مەبەستی جەمیلە خاتوونەکەی ئێمە نییە؟» ئافرەتە گەنجەکە گوتی « نا دایە.» پاشان بە بێ وازی خۆی ئەمبەر ئەوبەر کرد و بۆڵاندی « ئەتۆ دەچی دەگەی؟» دەسـتی پیرێـژن لـەنێو پاکـەتی بـادام زەمینی دا رەق هەڵات. « بۆ تێناگەم؟ زۆر چاکیش تێدەگەم.» دەنگی چـەپڵەو خشـە خشـی پاکەت نوقمی یەك بوون.

ئارتووش و منداڵەکان لەبەر دەرگەی تەلاری چێشت خۆری وێستابوون و دایکـم و ئـالیس ئەوە هەر وا لەگەڵ ژن و مێردەکەی ئەندامی خێڵـی «لایـەنگرانی مەریـەم» دەئـاخۆتن. بـە دەست هێمای ئالیسم کرد کە « ئێمە لە ژووری چێشت خۆرین.» لەگەڵ ئارتووش و منداڵەکان بەرەو لای سەر خزمەتکار چووین کە هێمای دەکـرد «کەرەمکـەن.» ئـارتووش هـەقی بـوو. خاتوون نوروڵلآیی ئافرەتێکی پێکەوتوو بوو. دەمزانی شووی هەیـە بـە سـێ منداڵـەوە. وەك خۆم. بەم شێوەیە هەم کاری دەکرد و هەم لە بەستێنی کۆمەڵایەتیدا تێدەکۆشا. ئەمن جگە لە کارخانە چیم دەکرد؟ وەڵامی سلاّوی سەر خزمەتکارم دایەوە و بە بـیرم دا هاتـەوە « خـاتوون نوروڵلآیی ئافرەتێکی پێکەوتووە.»

چێشت خۆری یانەی گوڵستان وەك هەموو ڕۆژانی هەینی قەرەباڵغ و ڕۆژان ئاسا تەژی لە ناسیاو بوو. لە پشت میزێك دانیشتین کە بە خۆشییەوە لە مێزی مارگرێتا و دایك و باوکی تەریك بوو. دایکم و ئالیسیش سەریان وەدەرنا. دایکم خەریك بوو دەیگوت «ژن و مێردێکی زۆریش باشن.»

« نەمگوت ژن و مێردێکی خراپن، گوتم دەمەوەڕن* »

« بە پێچەوانەی ئەوە ماڵی ژینیان لە پاك و خاوێنیان دەبریسکێتەوە.»

ئالیس روانییە منداڵەکان و چاوی بە لای چۆپە داگێڕاو گوتی « فزوولی؟» منداڵەکان دایانە پێکەنین.

داوای پلاو و کەبابمان کرد و دایکم سێ جار بە ئارتووشی گوت بە خزمەتکار بڵێ کەبابەکەی چاك ببرژێنێ و «ئەم هێلکە سندان کوشتووانەش لێرە لابا.» ئارمینە و ئارسینە بە یەکەوە گوتیان « نا. گەرەکمانە بە ئاردکایە بکەین.» دەفری ئاردو هیلکەکانم دایە خزمەتکار و گوتم « سوپاس . هێلکە ناخۆین.» ڕۆژانی هەینی قاپێکی تەژی لە هێلکە و ئاردیان لەسەر هەموو مێزەکانی تەلاری چێشت خۆری دادەنا. چەند زەردێنەی هێلکەیان دەهێنا هەریەکەیان دە نیوە قاپێلکێك دەکرد و لەسەر ئاردەکانیان دادەنا. کایە بە ئارد لە نێو دەفر دا کایەیەك بوو کە منداڵان هۆگری بوون. یەك دوو جار زەردێنەی هێلکەیان ڕژاندبووە سەر مێز و خزمەتکار مەجبوور ببوو هەم روو مێزە کەتانە چەرمووەکە بگۆڕێ و هەم ماوتە سەوزە وردەکەی. دایکم قینی لە خواردنی زەردێنەی هێلکە لەگەڵ پلاو و گۆشت دەبۆوە.

ئالیس کوتە نانێکی ڕاکرد، چاوی بە چوار سووچی تەلار داگێڕا و دەستی پێکرد. «هاوسەری دکتۆر ساڵحی فەردت دی؟» دکتۆر ساڵحی فەرد بەرپرسی بەشی برینگەری نەخۆشخانە بوو. تازە زەماوەندی کردبوو و هەنووکە بیرم کەوتەوە هەر ئەو کەسە بووە کە ئالیس دەستی بۆ ڕاوەشاند و لەگەڵ هاوسەرەکەی یەکتریان ڕامووسی. دیوتە بەو سەر و سەکوتە بێ نموودە چ شووەکی کردووە؟ سەیری هاوسەری دۆلاتاریان بکە. نازانم بۆ هەموو دەڵێن تەڕپۆش. ئەوەش کڵاوە لەسەری ناوە؟ هەر دەڵەی لەگەنی منداڵە، لای وایە هەر ئافرەتێك کڵاوی لەسەر نا بوویە ژاکلین کێنێدی.» ئەو ژنەی ئالیس باسی لێوە دەکرد دایکی یەکێ لە هاوپۆلەکانی ئارمەن بوو و جارێکیان ئارمەن کوتەکێکی چاکی لە کوڕەکەیانی دابوو، لەبەر ئەوەی بە ئارمینە و ئارسینەی گوتبوو جاشوولەکانی عارەبانە.

ئالیس گوتیە ئارمەن « سەلاتە ناخۆی؟ بیدە من. » سەلاتە ئارمەنی دە قاپەکەی خۆی کرد و روانیە لای دەرگە. «هەیهوو! مانیا و وازگێن لێرە چ دەکەن؟ پیوازیش تێکەڵی میوە بوو؟» مانیا مامۆستای وێنەگەری دووانەکان بوو و وازگێن هایراپتیان بەرپرسی قوتابخانە. ژن و مێردێکی لاو بوون کە منداڵیان نەبوو و فکر و زکریان ببووە قوتابخانە و منداڵانی قوتابخانە. خەریك بوون دەهاتنە لای مێزەکان.

بە منداڵەکانم گوت لەبەر مامۆستا و بەرپرس رابن. ئارتووشیش رابوو و پاش سڵاو و چاك و خۆشی خولقی کردن دانیشن. وازگێن گوتی « تەنیا چەند چرکە سات، » و دانیشت. «میوانی ئاغای خالاتیانین. دەنا ئێمە چکارمان بە یانەی گوڵستان بوو؟» ئالیس حەولی ئەوەی بوو چاوم لێنەکا و گوتی « ئەو قسانە چن. »

مانیا لەگەڵ دایکم و ئالیس خەریکی ئاخۆتن بوو و وەك هەمیشە لەگەڵ دووانەکان بەربوویە گاڵتە کردن کە « ئێوە خوشکن یا وێنەی ئاوەژووی یەکترن؟» وازگێن رووی دە من کرد. « وەرگێڕانی ئەو کتێبەی کە باسم لێدەکرد کۆتایی هات. دەرفەتی ئەوەت دەبێ وەیخوێنی؟ سوپاس دەکەم. »

وازگێن و مانیا گۆڤاری "لۆسابیر"یان کە مانگایەکی منداڵانە بوو دەیەنا دەرێ. چەند جار بۆ گۆڤارەکە چیرۆك و شیعرم وەرگێڕا بوو و وازگێن هێندێ جار بابەتەکانی گۆڤارەکەی بەر لە چاپ پێی دەدام وەیخوێنم و رای لەسەر بدەم. ژن و مێرد کە چوونە سەر مێزەکەیان ئارسینە گوتی «چ کتێبێك ، دایە؟» ئارمینە گوتی « چ کتێبێك؟»

ئەو رۆژەی لەمەر کێشەکەی ئارمەنەوە چووبوومە قوتابخانە، دوای ئەوە کە خاتوون دۆلاتاریان (زەریف و کار جوان بە چاکەت و دامێنی یەشمی و قژی درێژی مۆدیل هارویی) حەقی دا بە ئارمەن و ئەمن حەقم دا بە کوڕەکەی ئەو و هەرتك کوڕەکانمان مەجبوور کرد لە یەکتر خۆش بن، وازگێن باسی کتێبی لۆرد فونتلیرۆی بچکۆلەی کرد و گوتی خەریکە وەری دەگێڕێتە سەر زمانی هەرمەنی.

ئالیس گوتی « لۆرد چی چی بچکۆلە؟» و لە پێکەنینی دا.

دایکم گوتی « وێنەی مانیا زۆر کەمە. بەو گشتە سەرقاڵییەی کە هەیەتی دەبێ ماڵەکەی ببینی. دایم و دەرهەم لەبارو رێك و پێکە. وەك دەستە گوڵ وایە. بەوە دەڵێن ژن. »

ئارمەن باینجانی نێو قاپەکەی خۆی دەنێو قاپی ئارسینە هاویشت. ئارسینە لووتی تێك ناو ئارمینە بۆڵاندی. «دیسان پێت وایە دەوریی ئێمە زبڵدانە؟»

ئارتووش باینجانەکەی لە دەوریی ئارسینە دا راکرد نایە دەوریی خۆی. «وازگێن بەم گشتە کارەیەوە دەرفەتی وەرگێرانیشی پەیدا کردووە؟ ئەتۆ بۆ کتێب وەرناگێڕیی؟» بۆ چەند ساتێ تێم روانی کە بە پێکەنینەوە لێمی دەڕوانی. دایکم گوتی « دەرفەتی لە کوێ بوو؟ زیاتر لە شەش مانگ دەبێ پەردەی ژووری خەوی نەشوردووە.» پاشان زەق چاوی تێبڕیم. « درۆ دەکەم بڵێ درۆ دەکەی.»

کەبابی دووانەکانم لەت کرد. زەردەخەنەی ئارتووش هەروەك سەردەمی دەسگیرانەتیمان بوو یا شێوەی ئاخاوتنەکەی؟

# ١٢

منداڵەکان لە قوتابخانە بوون و ئارتووش لەسەر کار. ژوورەکانی خەوم رێك و پێك کردبوو. تۆز تەکاندن تەواو ببوو و چێشتی شەو لەسەر ئاور. تەلەفۆن زەنگی لێدا.

« ئەمن تەلەفۆنت لێ نەکەم نەکا ئەتۆ لێم بپرسی ها.» نینا بوو.

تا هاتم بڵێم چەند رۆژ بوو لەبیرم بوو و پێوە بووم تەلەفۆن بکەم رێك نەدەکەوت، بە پێکەنینەوە پەڕییە نێو قسەکانم.« لە سەری مەڕۆ. دەزانم سەرقاڵی. قووڵ تێگرتنەکانی خۆت و ڕاڕاییەکانی دایکت و بەدخوڵقی ئارتووش.»

یەکێك لە کارە باشەکانی نینا ئەوە بوو کە هیچکات دڵمەند نەدەبوو. دەیگوت کە «خۆم لە جێی گۆڕین دادەبینم هەقی پێدەدەم.» لە روانگەی نیناوە هەموو هەمیشە هەقیان بوو و هیچ کەس هیچ کات خەتابار و پەست نەبوو و رق و کینی نەبوو و بەم چەشنە — بەم چەشنە بۆ گوتی بەدخوڵقی ئارتووش؟ خەڵکی دەور وبەر بۆچی لایان وابوو شووەکەم بەدخوڵقە؟

باسەکەم گۆڕی. لە حاڵی سووفی و گارنیکم پرسی و هەروەتر لە کوڕەکەی تیگران کە لە زانستگای تاران دەرچوو بوو. نیناش سۆراخی حاڵی منالان و ئارتووش و دایکم و ئالیسی گرت و لە بابەت خۆیەوە گوتی کە لە ماڵی نوێی رازییە و دراوسێکانی مرۆڤگەلێکی خراپ نین. « دراوسێکانی دیوار بە دیوارمان مێرێکی بێ ژنی هۆڵەندییە کە بەژنی دوو میترێك دەبێ و خۆم ئاسایی لە ئاوەزی بەڕێو جێ بێبەرییە.» بە دەم پێکەنینەوە دەیگێڕاوە کە مێرە هۆڵەندییەکە سەعات سێی دوانیوەڕۆ، لە ژێر گەرمای سەرچیمەنی حەوشە بە هەتاو حەمام

دەکا و ژنی جیناری هەمبەرمان کە کەلیمی یە هەموو شەوانی شەممە لـە نینـای دەویٚ بچـیٚ چرای حەوشەکەیان هەڵکا و هێشتا دراوسێکانی تر ناناسیٚ و ـــــ

یەکیٚ لە ئیرادەکانی نینا زۆر وێژی بوو، بەتایبەت ئەگەر بە تەلەفۆن قسەی دەکرد. هۆشم لە لای چێشتی سەر ئاور بوو. گوتم « نینا، چێشتی سەر ئاورـــــ »

بە پەلە گوتی « ئەی ! ببوورە، هەر لە بیرم چوو بۆچی تەلەفۆنم کرد. پێنجشەممەی شـەویٚ وەرنە لامان ، بە دایکم و ئالیسیش بڵیٚ. بۆخـۆم بـە تەلـەفۆن بانگێشـتنی دەکـەم نـەوەکوو خوشکت وێیکەویٚ و لێمان بتۆریٚ. » دیسان پێکەنی « کیژی پووری گارنیك لە تارانەوە هـات چەند حەوتوویەك لێمان میوان بوو. بەستەزمانە تازە تەلاق دراوە. پێم خۆشە ببیینی. هێندیٚ لە ئاکارەکانی لە تۆ دەچیٚ. لەبیرت نەچیٚ. پێنجشەممە. زووش وەرن با منداڵەکان بـە یەکـەوە کایە بکەن، سووفی دڵی بۆ منداڵەکان تەنگ بـووە. هـەر دەڵێـی لـە قوتابخانـە قـەت یـەکتر نابینن. » لە ئاخرییەکەیدا ماڵاوابیمان لە یەکتر کرد.

تەلەفۆنەکەم دانا و چوومە چێشتخانە. هەتا چێشـتەکەم لێکـدا و ئاورەکـەم کوژانـدەوە، تەلەفۆن زەنگی لێدا گەڕامەوە دالان.

«پێم وانەبوو لەو ئافرەتانە بی کە دایم و دەرهەم لەبن تەلەفۆن کورك دەبن. »

یەکێك لە ئیرادەکانم ئەوە بوو کە نەدەشیام لـەجێوە وەڵامـی خـەڵکی بدەمـەوە. هەرکـە قسەیەکی بیٚ جێم دەبیست بێدەنگیم لێدەکرد. بێدەنگیم لێکرد و خاتوون سـیمۆنیان درێـژەی پێدا. « ئەو شەوە گوتت ئەم ژنەتیوە دەنێرییە ماڵی ئێمە. چ باسی لیٚ نـەبوو. هـیچ دەزانـی لەگەڵ بێبەڵێنی دانیم. »

وەڵامی خەڵك نەدانەوە و گرینگی پێنەدانەکانی منیش تاڕادەیەك بوو. هەناسەیەکی دوور و درێژم کێشا، سیمی تەلەفۆنم توند لە دەوری دەستم پێچا و بە دەنگێکی بەرزتر لـە دەنگـی ئاساییم گوتم هەوەڵیٚ ئاشخێن "ژنەتیو" نییە و ژنێکی رێـزدارە کـە بـۆ دابینکردنـی بـژێوی ژیانی تێدەکۆشیٚ ، ئەوجار تەلەفۆنی نییە و دەبیٚ هەتا شەممە سەبر بگرم کە نۆرەی ماڵە منە و سەرەڕای ئەوەش ـــــ

پەڕییە نێو قسەکەم « ئیمڕۆ شەممەیە. »

ترسم ریٚ نیشت. « دوێنیٚ تەلەفۆنی کرد بۆی ناکریٚ بیٚ چونکەـــــ»

دیسان پەڕییە نێو قسەم. « تۆ گوتت تەلەفۆنی نییە؟»

خەریك بوو بتەقم « کوڕەکەی تەلەفۆنی کرد. »

بۆ چەند ساتێ بێدەنگ بوو، پاشان شێوە ئاخاوتنەکەی گۆڕا. « کەوابوو تکایە لەبیرتان نەچێ و ــــ شووشەیەك چاتینم بۆ وەلا ناوی.»

زمانم لە گۆ چوو. لە ئاکارە دژ بە یەکەکەی نەدەگەیشتم. گوتم لەگەڵ ئاشخێن دەئاخۆم، سوپاسی یەکەییم کرد و تەلەفۆنم دانا. لە بیری ئەوە دابووم کە دەبووایە هەر لە هەوەڵەوە بە ئاشخێن بڵێم لەگەڵ چ سەیر و سەمەرەیەك تێکەوتووە.

# ١٣

مامۆستای پیانۆی منداڵەکان ئافرەتە ئینگلیزی یەکی سپی و بەڵەك بوو، شووی بە مێرێکی ئێرانی کردبوو و دوای چەندین ساڵ بە یەکەوە ژیان لە ئێراندا، فارسی لە ئێمە هەرمەنییەکان خراپتر دەئاخۆت. بەر لە دەس پێکردنی کلاسی منداڵان پرسی « ژمارەی تەلەفۆنی ئێمە ئێوە بە هانومی — هانومی — ناوی چیە؟ جیناری ئێوە.» گوتم « سیمۆنیان.» دەستی دانایە سەر نێوچاوانە شڵەکەی*. « ئا، سیمۆنیان ئیمڕۆ تەلەفۆنی کرد، زۆر خاتوونێکی سەیرە. گوتی وەرە پیانۆکەی ئێمە کووك بکە، گوتم ئەمن پیانۆ کووك کەرەوە نیم. زۆر قسەی بێشەرمانەی کرد.» برۆی ناسك و شانە زەریفەکانی هەڵتەکاند. تلەکانی بەو نینۆکە سووراندەوە چەند جار لە حەوادا راوەشاند و منداڵەکانی بردە ژووری پیانۆ.

بۆخۆم هەروەك کارێکی خراپم کردبێ بە شەرمەوە لە ژووری میوانان دانیشتم. چاوم لە راحەتییە چوار خشتەکان و پەردەی گوڵدار و پەیکەرەی چکۆڵە و تابلۆی مەزن و قاپ و قاچاغە زێو و فەغفوورییەکان دەکرد و چاوەڕوانی تەواو بوونی کلاسی منداڵەکان بووم و خۆم سەرکۆنە دەکرد کە « بە تۆ چی؟ خۆ ئەتۆ وەکیلی کارە چەوتەکانی دیتران نی. هەق بە ئارتووشە. نابێ زۆر هاموو شۆی ئەم بنەماڵەیە بکەی.» چاوم بە دەوری ژوورەکە داگێڕا. تەکاندنی تۆزی ئەو گشتە پەیکەرە ورد و درشتە و تابلۆ و قاپ و قاچاغ بێگومان زۆر وەخت گرە.

لەکاتی گەڕانەوە بۆ نێو پاس هەوڵم دا بۆ دووانەکان روون بکەمەوە کە بۆ نابێ زۆر بە شوێن ئێمیلی دابچن. « دەرسی ئێمیلی لە دەرسەکانی ئێوە فرەتر و دژوارترە، پێموایە دایە

گەورەی ئێمیلیش پێی خۆش نییە ئێمیلی زۆر لە ماڵ بچێتە دەرێ. هەر کەسەی خووخدەی تایبەت بە خۆی هەیە. دەبێ لەبەر چاوی بگرین.»

ئارسینە بەشێك لە قژە لوولەکەی بە فوو لەبەر نێوچاوانی لادا. «بەڵام ئێمیلی هاوڕێی ئێمەیە. زۆرمان خۆشدەوێ.»

ئارمینە کتێبی نۆتی دانایە سەر کورسی پاس و دەستی خوشکی گرت. «بۆخۆی هەموو رۆژێ دەڵێ خۆزگە دەهاتمە ماڵی ئێوە.»

کەوتمە بیر ئێمیلی بەستەزمان. ئەمنیش بوومایە پێم خۆش بوو لە چنگ ئەو زیندان و زیندانەوانە رزگاریم بێ.

ئارمینە گوتی «بچینە توستۆر؟»

ئارسینە گوتی «ئیسمارتیز بکڕین.»

لە ئیزگەی نزیك ئوستۆر دابەزین.

نێو فرۆشگا وەك هەمیشە خۆش و فێنك بوو. دووانەکان رایانکردە لای قەفەزەی شەگەڵاتەکان. کارمەندی فرۆشگا پرسی «ترۆلی یا بەسکێت ؟» گوتم «تکایە بەسکێت.» قولێنەی شت کڕینم دەسدایە و راست چوومە شوێن بەشی کەرەستەی تەندروستی و لەشساغی. ژنێك پاڵی وەچەرخی دەستی شتە کراوەکانی دابوو و چاوی لە قەفەسەی سابوون و کرێمەکان دەکرد. چەرخە دەستییەکە تەژی لە شەگەڵاتگەلی کەد بێری بوو. بە یەکتر پێکەنین و وەك ئەوەی لە سەری پێویست بێ شتەکە روون بکاتەوە گوتی «دیاری بۆ تارانییە شەگەڵات نەدیتووەکان دەبەم.» پێکەنی و پێکەنیم و گوتی «سابوون و کرێمی دەستیشیان خواستووە، نازانم سابوون چ هەڵگرم.» دوو بەستە سابوونی وینۆلیام هەڵگرت نامە نێو قولێنەکە. «ئەمن هەمیشە وینۆلیا بە دیاری دەبەم.» چوار بەستە سابوون و سێ قوتوو کرێمی دەستی یاردلی هەڵگرت. ماڵ ئاوایی کرد و چەرخە دەستییەکەی بە زەحمەت وەپێش خۆیدا ، قوتووەکی کرێمی یاردلیم هەڵگرت و نامە نێو قولێنەکە.

خولێکم لە فرۆشگا دا لێداو دوو قوتوو بیسکویتی نایس کە ئارتووش پێی خۆش بوو و شەربەتی هالی بۆرانژم بۆ منداڵەکان هەڵگرت. ئارسینە و ئارمینە بە دەستی تەژی لە شەگەڵات پەیدا بوون. ئارمینە گوتی «گوتت وەبیرت بخەمەوە کە ـــ» ئارسینە گوتی «نان و شیر لە دێیری بکڕی.» پێم گوتن کە نیوەی شەگەڵاتەکان بەرنەوە نێو قەفەسە و چووینە ژووری پاڵدەستی فرۆشگا یا ئابادانی گوتەنی دێیری و نانی رۆڵ و شیرمان کڕی.

له گەرمان جاڕز ببووین، کە گەیشتینەوە ماڵ، ئارتووش لە کاڕێژ بوو.

ئارمینە گوتی « ئەی گیان ، باوکم هاتۆتەوە. » ئارسینە گوتی « باوکم هاتۆتەوە ئەی گیان. » دەنگی قسە کردن لە ژووری دانیشتنەوە دەهات. ئارمینە کتێبی نۆتی دانایە سەر مێزی تەلەفۆن. « میوانمان هەیە؟» تا هاتم بڵێم جێی کتێبی نۆت سەر مێزی تەلەفۆن نییە، ئارسینە زووەکی کتێبەکەی راکرد و گوتی « میوانمان هەیە. »

گوتم دەبێ کێ بێ هاتبێ؟ ئالیس کە ئەم حەوتووە ئێواران لەسەر کار بوو. دایکیشم کە هەموو دەم لە چێشتخانە دا دادەنیشت. ئارمەنیش کە بێگومان لە ژوورەکەی خۆیدا بوو چونکوو دەنگی گڕامی تێپاز هەتا سێ ماڵ ئەولاتر دەڕۆیی. ئارمینە روانیە من « بەڵکو لە ناسیاوانی باوکم بن. » ئارسینە گوتی «کادیلاکە سەوزەکە خۆ لە کاڕێژ دا نەبوو. » پاشان دەستی کردە نێو پاکەتی شت کڕین و یەکێك لە ئیسمارتیزەکانی راکرد. ئارمینە دەستێکی بە چەناگەیدا هێنا کە یانی خەریکی ردێنێتی و لاسای ئارتووشی کردەوە. «بەراست، لەبیرم چوو. چەند کەس لە ناسیاوان هاتن. » ئارسینە دایە پێکەنین و هەتا تێم راخوری کە « بە حەیا بە!» پێکەنینەکەی قوتداوە.

« چەند کەس لە ناسیاوان» سێ مێری گەڕاوە بوون کە جاروبار دەهاتنە ماڵمان. هەرمەنی نەبوون، لە جێگەی راحەتی لە پشت مێزی فراوێن خۆری دادەنیشتن و هەر کە چاییم دەبرد چەند جار سوپاسیان دەکرد. ئارتووش بە دوامدا دەرگەی دادەخست و هەتا یەك دوو سەعات هەر دەنگی سرتە سرتم لە پشت دەرگەوە دەبیست.

ئارمینە رووی دە خوشکی کرد و لاسای یەکێك لە سێ کەسەکەی کردەوە کە لە دووەکانی تر باڵا بەرزتر بوو و پچڕ پچڕ قسەی دەکرد، «ب — بوو- رن. دە — کرێ — کا- دی — لاك — لە — کاڕێژ — دابێ؟» مێرە باڵا بەرزەکە جاری هەوەڵ کە هات داوای کرد کادیلاکە سەوزەکەی بەرێتە کاڕێژ چونکو رەنگی ماشێن لە ژێر هەتاو داکاڵ دەبێتەوە. ئەم کارە بوو بە عادەت و هەر جارەی کە دەهات تەنانەت ئەگەر رۆژاواش بووایە و تاو بە دەرەوە نەبا کادیلاکی دەخستە کاڕێژ و دەرگە دوو لنگەکەی دادەخست.

لە دەس ئارتووش تووڕە بووم کە لەبیری چووە بڵێ میوانم هەیە تێم راخوری « دەست و چاو شۆردن و کارگەلی قوتابخانە. » دووانەکان کە رایانکردە ژووری خۆیان چوومە چێشتخانە.

کادیلاکە سەوزەکەم چەند جار لەبەر دووکانی شاهیندە لە ژێر سوورەتاو دا دیبوو. کە بە ئارتووشم گوتبوو، شانی هەڵتەکاندبوو کە «باشە، نزیك دووکانی شاهیندە هیچ کاڕێژی لێ نییە. »

ئەو کەلوپەلانەی کڕیبوومن تاقەتم کردن. ناوی سێ کەسەکەم نەدەزانی و نەشمدەویست بزانم. جارێکیان کە ئەوان رۆیشتن لە ئارتووشم پرسی هاتنە ئێرەیان جێی مەترسی نییە؟ گوتی « نیگەران مەبە تەنیا بە یەکەوە دەمەتەقە دەکەین.» نانەکانم دەنێو کاسەی نانی نا و لە دڵی خۆمدا گوتم «دەمەتەقە ناکەن» و چوومە ژووری دانیشتن.

لە ژوورێدا دووانەکان گوتەنی لە باتی «ناسیاوانی باوکم» ئێمیل سیمۆنیانم دی کە تا وەژوور کەوتم لەبەرم هەستا، سڵاوی کرد. دەستی وێدام. دەستم وێدا و توند دەستم کێشاوە. قوتووی کرێم لەسەر مێزی چێشتخانە بوو. چاك و خۆشیمان کرد و پرسیم « قاوە دەخۆی؟»

هەتا قاوە حازر بوو دەستم لە ژێر شێرەی قاپشۆری شۆرد، دەرگەی قوتووی یاردێلیم کردەوە و کرێمم لە دەستم هەڵسوو.

کەشەفی قاوە بە دەستەوە بەرەو ژووری دانیشتن چووم و ئەوەم بە زەین گەیی « چۆن بووە ئارتووش ئێمیلی بانگێشتن کردۆتە ماڵ؟» ئارتووش لێمی پرسی « دەتزانی ئێمیل شەترەنج باش کایە دەکا؟» وەڵامم وەرگرتەوە. کەوتمەوە بیر سەفەری مانگی هەنگوینمان* بۆ ئیسفەهان و شیراز، ئارتووش زۆرجار بە سەبر و تاقەتێکی زۆرەوە هەوڵیدا شەترەنجم فێر بکا و فێریشی نەبووم.

ئێمیل سیمۆنیان فینجانی قاوەی راکرد و چاوی دە پەنجەرە بڕی «ئەو پەردانە چەند جوانن.»

بۆخۆم داوێنی پەردە کەتانییەکانم بەگوڵ چنی بوو و زۆرم خۆش دەویستن. بەڵام جگە لە دایکم کە گوتبووی «سەلیقەت وەخۆم چووە» کەس هیچکات پەردەکانی پەسند نەکردبوو. ئارتووش کە مۆرەکانی شەترنجی ریز کرد لە ژوورەکە وەدەرکەوتم. گوتمە دووانەکان دەفتەری ئیملاکەیان بهێننە چێشتخانە و بە ئارمینم گوت دەنگی گڕام کەم کاتەوە. لەبیری ئەوە دا بووم شێو چ دروست بکەم کە ئارمینە و ئارسینە بە قینەوە وەژوور کەوتن. «دەفتەری ئیملای من دیار نییە.» «قەڵەمدانی منیش دیار نییە» بە یەکەوە پێیان دە عەرزی کوتا. «وەی لە چنگ ئارمەن.» گوتم « لە چنگ ئارمەن.» و رابووم.

دەرگەی ژووری ئارمەن رۆژان ئاسا داخرابوو، لە باتی ئەوە لە دەرگە بدەم دەسگیرەکەییم چەندجار توند راوەشاند و هەتا گوتم «دیسانیش ئەتۆ ـــ» لە ژوورەوە هاواری کرد «دۆلابی ژووری دانیشتن.» رووە و دەرگەی داخراوە گوتم «بە خودای نەخۆشی.» و چوومە ژووری دانیشتن.

ئێمیل سەری هەڵێنا. زنجیرێکی زێڕینی زەریف بە نێوان پشکۆژە کراوەکـەی کراسـیدا بـە دیارە وە بوو. دەرگەی دۆلابی قاپەکانم کردەوە.

ئێمیل بە ئارتووشی گوت « باس و خواسی ئیمڕۆ؟ هەموو زوو چوونەوە» ئارتووش چـاوی لە سەفحەی شەتڕەنج بڕیبوو و خۆی بە ریشـەکەیەوە خافڵانـدبوو.«نوتـق کـردن بـوو. بۆچـی نەهاتی؟»

« نوتق کردن؟»

« پێگوف نوتقی دەکرد.»

« پێگۆف؟»

« باڵوێزی یەکیەتی سوڤیەت.»

« ئەها!»

دەفتەری ئمیلا و قەڵەمدانم لەسەر دەوریەکانی نێو دۆلاب راکرد و گەڕامەوە چێشتخانە.

ماکارۆنیم بۆ شێو دەپاڵاوت کە لە زەنگیانـدا. ئێمیلـی بـوو، لەلایـەن دایـە گەورەیـەوە هەواڵی هێنابوو کە بۆ شـێو چـاوەنواری باوکینـە. ئێمیـل لـەجێوە هەڵبەزییـەوە. « هۆشـی سەعاتم نەبوو.» دروست شێوەی کیژەکەی بوو، یەکەم جار کە دایە گەورە هاتبووە شوێنی.

هەیبەتی ئارتووش لە چەشنی منداڵێك بوو کە لەیستۆکیان لە دەس ستاندبێ. دووانـەکان پاڕانەوە « بۆ شێو لامان بمێننەوە.» لەبەرچاو گـرتنی رادەی هامووشـۆ و پشـتی دەسـت داغ کردنم لەبیر چوو و گوتمە ئێمیل سیمۆنیان « بۆچی بۆ شێو لە لامان نامێننـەوە؟ تەلـەفۆن لـە دایکت دەکەم.» ئارتووش بانگێشتنەکەی دووپات کردەوە و دووانەکان دەستمیان گرت و بەرەو تەلەفۆنیان بردم. ئارمەن پاڵی وەشیپانەی هۆدەکەیەوە دابوو.

ئێلمیرا سیمۆنیان نەك هەر رازی بە مانەوەی کوڕ و نەوەکەی بوو بەڵکو رازی بـوو خۆشـی بێ. بە دوای رازی بوونە لەناکاو و چاوەڕوان نەکراوە دووانـەکان لـە خۆشـیان هەڵبەزینـەوە و ئێمیل و ئارتووش گەڕانەوە سەر شەتڕەنجەکەیان. بە بینینی بەرمزەی ئێمیلـی دەبـاڵ خـۆم دا گوتم «بەستەزمان»، چونکوو پشـتم دە ئارمـەن دا بـوو نـەمزانی ئـەم منداڵـە بەسـتەزمانە خۆشحاڵ بوو یا نا.

# ١٤

ئیشی و راپۆنزێل خۆیان خڕ کردبۆوە و لەنێو قەرەوێڵەدا دانیشتبوون.

ئارمینە گوتی « تۆ نەتگوت بەڵام ئاخرییەکەی بۆ خۆمان تێگەیشتین دایە گەورەی ئێمیلی بۆچی هەروا بچکۆلە ماوەتەوە.» ئارمینە زۆر بەڕاستی گوتی « چونکو ڤاکسێنی لێنەداوە.» هەر جارەی کە نۆرەی لێدانی ڤاکسێنی دووانەکان دەهات ئەم رستەیەش کە «ئەگەر ڤاکسێن لێنەدەن هەتا هەتایە بچکۆلە دەمێننەوە.» بەشێك بوو لە تکاو رجاو هەڕەشەکانم.

دوای نیو سەعات کە رووداوەکەم بۆ ئارتووش گێڕایەوە پێکەنی. لە پاڵی دانیشتم و گوتم « خاتوون سیمۆنیان لە دکتۆر جکیل و مستر هاید نامێنێتەوە. هەتا دێ پێت وابێ چ بوونەوەرێکی لەخۆڕازی و ترسێنەرە، کارێ دەکا خۆشت بوێ و دیارە بە پێچەوانەشەوە. چ رووداوگەلێکی بە تام و چێژی گێڕاوە و مرۆڤ هەق بڵێ پیانۆ ژەنینەکەشی قسەی تێدا نەبوو.»

دوای خواردنی شێو لە پێشدا ئێمیلی و دووانەکان پیانۆیان ژەندبوو. پاشان خاتوون سیمۆنیان مەشقە دژوارەکانی منداڵانی ژەندبوو، ئەوجار هەر ئاهەنگێکی کە داوایان کردبوو و لە کۆتاییدا چەند ئاهەنگی کۆن. پێم وایە تەنانەت ئارمەنیش ئاگای لێنەبوو پێیەکانی خاتوون سیمۆنیان ناگاتە پێداڵەکانی پیانۆش.

ئارتووش باوێشکی هاتی. « مرۆڤگەلێکی چەوت نین. شەترەنجی ئێمیل قسەی تێدا نییە.»

گوتم باسە سیاسییەکەتان بە کوێ گەیی؟ دەستەکانی لە پشت سەرییەوە تێك خست. «هیچ کوێ. ئێمیل لە عالەمی خۆیدایە.» توێکلی فستقێکم لەسەر فەرش هەڵگرتەوە. « کام عالەم؟» دەستەکانی هێنایە خوار و بەردێنە بزن ئاساکەیدا هێنا. چووزانم. چیرۆك و شیعر و لەم چەشنە بابەتانە.» توێکڵە فستقەکەم ئەو دەس ئەو دەس کرد. خاتوون سیمۆنیان گوتبووی « هەر چەند هەوڵم دا فێری پیانۆ نەبوو. لە جێگەی ئەوە هێشتا نەدەچوو قوتابخانە دەستی بە خوێندنەوەی کتێب و هۆنینەوەی شیعر کرد.» توێکڵە فستقەکەم خستە نێو تەپلەك. «باشە خوێندنەوەی کتێب چ ئیرادێکی هەیە؟»

پێیەکانی درێژ کردە سەر مێزی پێش ڕاحەتی و دە سیمای کوژاوەی تەلەویزیۆن ڕاما. «هیچ ئیرادێکی نییە. بەو مەرجە قازانجێکی ببێ ، ڕێ نیشاندەربێ، شت فێری مرۆڤ بکا، تەنیا بە مەبەستی کات بواردن و خۆ خافڵاندن نەبێ. دەڵێی ئێمیل لەسەر ئەم دنیایە نییە.» برێ لە قژەکەمم بە دەوری تلم دا بادا. « هەر کەس کتێبی خوێندەوە و شیعری پێخۆش بوو یانی لەسەر ئەو دنیایە نییە؟» باوێشکی هاتێ. «شیعر و چیرۆك خۆ نەبوو بە نان و ئاو. بەڕاستی! خاتوون نورولّلایی گوتی کاری پێتە. گوتی تەلەفۆن دەکا.»

خاتوون نورولّلایی چ کاری پێم بوو؟ خاتوون سیمۆنیان گوتبووی «گۆڤارێکی زۆر گرینگ برێك لە شیعرەکانی ئێمیلی بڵاوکردەوە. یەکێ لە چیرۆکەکانی خەڵاتی وەرگرت.» «خاتوون نورولّلایی چ کاری پێم بوو؟

ئارتووش گوتی «ئاخرییەکەی تێنەگەیشتی کێشەی ئیشی و ڕاپۆنزێل لە ژێر سەری کێ دابوو؟»

بە دوای ڕۆیشتنی سیمۆنیانەکاندا ئیشی و ڕاپۆنزێل ون بوون. هەموومان وەك جاران شکمان لە ئارمەن بوو، بەڵام ئارمەن بە پێچەوانەی هەمیشە کە لە پێشدا زەردەخەنەگەلی ڕەمزاوی دەهێنایە سەر لێو و ئاخرییەکەی دانی پێدا دەهێنا کە لەیستۆکەکانی لە کوێ داناوە، ئەمجارە هەوڵیدا و تەنانەت فرمێسك لە چاوانیدا پەنگی خواردەوە کە « بە خوا، بە مەسیح، بە حەزرەتی مەریەم، ئەمن نەمشاردۆتەوە.» هەتا ئەوەی کە ئارتووش ، ئیشی و ڕاپۆنزێلی لە حەوشە لە ژێر پەنجەرەی ژووری دووانەکاندا دۆزییەوە.

ئەو بەشە قژەی کە لە دەوری تلم دەهاڵاند خستمە پشت گوێم ، «پێم وا نییە ئارمەن ئەم کارەی کردبێ.» ئارتووش چاوی نووقاند و پاڵی وە پاڵپشتی ڕاحەتیدا. دە سیما ڕەشەکەی تەلەویزیۆن ڕامام یانی دەکرا کاری کیژۆڵەکە بێ؟» ئارتووش چاوی هەڵینا، ڕاوەستاو خۆی لەبەر یەك کێشاوە. «ئەتۆ چراکان دەکووژێنیەوە یا من؟» گوتم « ئەمن.»

مێزی شێوم خڕ دەکردەوە ئێمیل گوتبووی «کلاریس، یارمەتیت بدەم؟ پێشنیاری یارمەتییەکەی بە دڵم بوو یا ئەوەی کە بە ناوی چکۆڵەمەوە بانگی کردبووم؟ چرای ژووری دانیشتنم کوژاندەوە و بەر لە چوون بۆ ژووری خەو ئەو شووشە چاتنیەی کە خاتوون سیمۆنیان هێنابووی نامە بنەبانی یەکێ لە قەفەزەکانی چێشتخانە. ئەم قەفەزانە شوێنی شتگەلێك بوون کە بەدەگمەن پێویستیم پێیان بوو.

# ١٥

ئالیس لە پشت مێزی چێشتخانە دانیشت. قژی چین چین کورت کرابــووە و وەك بــەرد رەق هەڵاتبوو و سەریشی دەتگوت تۆپە. « لە ئارایشــگەری را یەکڕاســت گەڕامــەوە ئێــرە.» زوو گوتم «قژەکانت فرە جوان بوونە. چوویە لای ئانژێل؟» بزەی هاتێ. « نا بابە. خۆ ئانژێل نازانێ قژ کورت کاتەوە. چوومە تەلاری شمشاد. ئارایشگەرێکی تازەی لە تارانەوە هێناوە.» چاوی وە قاپە شۆراوەکانی شەوی پێشتر کەوت کە خرابوونە نێو جێ قاپــەکان. گەشــاوە و بــە چەشــنێ پرسی «میوانتان بوو؟» وەك ئەوەی کە بپرسێ « پیاوت کوشتووە؟»

قاپەکانم دانایەوە سەر جێگای خۆیانەوە. لایەنی بەڕێو جێی زەینم بۆ هەزارەمین جار گوتی « پێویست بە روون کردنەوەی تۆ نییە. هەر بلّــێ ئــا میوانمــان بــوو. هــەر هێنــدە.» دوامــین کەوچکم نایە نێو چەکمەجەوە. کــە چــەکمەجەکەم گالّــەدا و زۆڕیامــەوە لای ئــالیس. « ئــا، میوانمان بوو» و پێم گوت کێ بوون. خۆی گرژ کرد. « بۆ منت ئاگادار نەکرد؟» هەتا هاتم بیر لەوە بکەمەوە، روونکردنەوە بدەم، لایەنی شەرمن ئەمکارەی کرد. « هەموو شت زۆر لەناکاو پێش هات. ئەتۆش کە دوێنێ شەو لە نەخۆشخانە بووی.»

بە پێچەوانەی هەمیشە کە بۆڵەی دەهات یا شەڕی ساز دەکرد. ئەمجارە لە قوڵێنەی میــوە سێوێکی دەس دایە و هیچی نەگوت. لەخۆم تووڕە بووم کە بۆ دیســان لــە ســەری ڕۆیشــتم و لەوەش سەیر مابووم کە چۆن بوو ئالیس هەڵلاو بگری ساز نــەکرد. لــە هەمبــەری دانیشــتم. سێوەکەی هەموو خوارد و گوتی «بریا گوتبات پێنجشەممە بۆ شێو بێنە ماڵە نینا.»

بۆ ئەوە هێمنایەتیم بپارێزم، هەوڵم دا بیر لە بابەتێکی تر بکەمەوە. دە گوڵدانەکــەی ئــەو دیوی پەنجەرە رامام. قەت نەشیابووم خوشکم حاڵی بکەم ئەگەر کەسێك میوانی جێگایەك بوو جوان نییە لە خۆڕایی میوانێکی تر لەگەڵ خۆی بەرێ. ئەمجارەش بۆم نەکرا رازی بکەم، بــرۆی هەڵتەکاند کە « هەی لەو قسانە. خۆ ئــەتۆ لەگــەڵ نینــا شــەرمە حزووریــت نییــە. بــەڵام چ قەیدییە، زۆر گرینگ نییە. ئەمن کە هەڵوێستی خۆمم گرتووە. جگەرەت هەیە؟» بــێ ئــەوە هیچ بڵێم رابووم پاکەتی جگەرەکەم هێنا. کەوابوو خوشکم لێبڕابوو خۆی کز کاتەوە. شــقارتەم بۆ لێدا.

ناشارەزایانە قومێکی لە جگەرە داو دووکەڵەکەی دایە دەرێ. « هەتا دایکم لێرە نییە هەراو هوریا بکا با بڵێم سیمۆنیان هەر عەیب و ئیرادێکی هەبێ گرینگ نییە. قسەی خۆمان بێ لە تەنیایی و بۆڵە بۆڵی دایکم وەڕەز بوومە ئەوجار ئەگەر پێشوو ژنی بووە گرینگ نییە. قسەی تۆ راست بوو. خوا و خورما بە یەکەوە نابن. لە بنەماڵەیەکی خراپ نییە و خوێندەواریشە. ئەوە هۆشت لە کوێیە؟ دەستت سووتا. ئەوە بۆ مات بوویە؟»

دەنکە شقارتە کە هەتا بنی سووتا بوو بە پەلە خستمە نێو تەپلەك. دایکم لە پاڵ تەلەفۆن گوتبووی « ئەگەر سەرو گێلێگەی ئالیس پەیدا بوو هەرچی گوت پێدا مەچوو. ئەوجار ئیدی بە تەواوی لە سەریداوە.» شکم کردبوو دیسان کێشەیان بووە. تازە تێدەگەیشتم. ئەم گاڵتەیەم بیر کەوتەوە. پیاوێك دەیگوت « لێبڕاوم لەگەڵ کیژی پاشا زەماوەند بکەم.» گوتیان «خۆ پاشا کیژەکەییت پێنادا.» گوتی « ئەمن هەڵوێستی خۆمم گرتووە، پەنجا لە سەدی کارەکە جێبەجێ بووە.» خوشکم بە تەما بوو لەگەڵ ئێمیل سیمۆنیان زەماوەند بکا و بە بڕوای خۆی سەدا لە سەدی کارەکە تەواو ببوو.

ئالیس سێوێکی تری دەسدایە. « دایکی ئەگەر بمرێ جەواهێراتەکەی بە من دەگا.» لە قاقای پێکەنینی دا. «تەنیا گرفتی ئەو کیژەکەیەتی. بەڵام گوتت منداڵێکی بەدفەڕ نییە. وازی منداڵداریم نییە بەڵام ئەتۆ یارمەتیم دەدەی.» پاشەوەی کە بەم چەشنە و دایکم گوتەنی هەموو شتێکی بڕی و درووی و دەبەری کرد لەجێوە رابوو. « دەی، ئەمن رۆیشتم. بۆ چاکەت و دامێنە چەرمووەکەم کەوشی سوورمەییم گەرەکە.» خەریك بوو سەرم دەگێژوە دەهات. پێم وابی وەڵامی ماڵاواییەکەیشم نەدایەوە و ئالیس بە پێکەنینەوە رۆیی.

هەتا گەیمە دالآن تەلەفۆن لە دایکم بکەم ، تەلەفۆن زەنگی لێدا. دایکم دەستی رەپێش خستبوو. « دەزانم. دەزانم. لەدوێنێ شەو هەتا ئێستا ئەوە بە گوێیدا دەچرپێنم. هەر گوێشی پێناچێ. هەرچی زووتر ئەو هەتیوە ببینێ، باشترە. بەڵکو لە کەری شەیتان هاتە خوار.» گووشییەکەم کە دانا، لە دەس دایکیشم تووڕە بووم. بە چ حەقێ نەدیتوو نەناس دەیگوت "هەتیوە؟"

لە پشت مێزی چێشتخانە دانیشتم و دەستم بۆ سەرم برد. قژم لە دەوری تلم هاڵاند و کردمەوە، هاڵاندم و کردمەوە. بیرهێنانەوەی یەکەم تووش بوونم لەگەڵ ئێمیل سیمۆنیان کارێکی دژوار بوو.

خوشکم خۆی تا ئەوپەڕی رازاندبۆوە، هەر لە نیـو سـەعاتی هەوەڵـەوە راپـۆرتێکی تێـرو تەسەلی لە چاکی و خووخدە و خوێندەواری و سەرکەوتنە کۆمەڵایەتییـەکانی خـۆی دەدا. لـە بابەت هەموو شتێکەوە هەر لە چێشت لێنان و کابانییەوە بگـرە هـەتا سیاسـەت و ئـابووری جیهانییەوە رای دەردەبڕی. بە دوای خوازبێنی یەك لـە دوای یـەك و دیـارە خەیاڵییەکانیـەوە دەیگوت ویستەکانیان جواب کراوە و لە کۆتاییدا لە مەڕ سەفەری ئینگلیزتانییەوە دەدوا. قژە لێك و لووسەکەم وەك فەنەر لووڵ ببوو. دامە پشت گوێم و بەشێکی ترم گرتە دەس.

زەماوەندی ئالیس یەکێك لە مەزنترین ئاواتەکانم بوو. گەلێك جار خۆم کەسانێکم پێشنیار کردبوو بەڵام خوشکم هەروەك ئەوە شەربەی ژارم خولّق کردبێ، لووتی تێك نابوو کە «حەی!!!؟ واتا ئەوەندە چارە رەشم کە تۆ شووم بۆ بدۆزییەوە؟»

هەر کە قژم لە دەوری تلم دەهاڵاند، نینا دەیگوت «دیسان بوویە لوویی شـازدەهەم؟ لـەو قژە لانەوازانە* دەس هەڵگرە.» دەستم لە قژەکانم هەڵگرت و رابووم. بە نێو ژوورەکاندا گەڕام و بە شوێن رێگا چارەوە بووم. هیچ رێگا چارەکەیم پێ شك نەهات، نەزرم کرد ئەگەر خوشـکم لە کەری شەیتان هاتە خوار خەرجی رۆژێك فراوێن و شێوی ماڵە پەککەوتەکان بدەم.

# ١٦

منداڵ کە لە قوتابخانە گەڕانەوە ئێمیلییان لەگەڵ بوو.

بەر لە هەر شتێ پرسیم « بە دایە گەورەت گوتووە هـاتووی؟» ئێمیلـی سـەری هەژانـد و چاوی دە عەردی بڕی. ئەو هەموو شەرمێوینییەی خەریك بوو جاڕزی دەکردم.

ئارمینە گوتی « خۆمان چووین ئیزنمان لە دایە گەورە وەرگرت.» ئارسینە گوتی «ئێمیلی لە ماتماتیکدا چەند گرفتێکی بوو. هاتووە ئارمـەن یارمـەتی بـدا.» هـەتا ویسـتم چـاوێکی سەرسوڕهێنەر لـە کوڕەکـەم بکـەم، ئارمـەن گـوتی « هەنووکـە دەگەڕێمـەوە.» و رایکـردە ژوورەکەی. لە دڵی خۆمدا گوتم ئەوڕۆ هـەر دەڵێـی رۆژی رووداوە سـەیرەکانە. ئارمـەن دوای ئینشا یا هەر بەو رادەیە دوژمنی ماتماتیك بوو.

منداڵ کە گوتیان « بەرشێو چیمان هەیە؟» تازە بیر بەرشێو کەوتمەوە و بیانووم هێنـاوە.» کارم بوو، دەرفەتی ئەوەم نەبوو شتێ دروست بکـەم.» سـەری دووانـەکان چـەماوە لایـەك و چاوەکانیان گەورە دەینواند.

« چ کارێکت بوو؟»

« بۆ دەرفەتت نەبوو؟»

بە بێ وازی گوتم « نان و پەنیرمان هەیە. بخۆن. هێندەش مەپرسن.»

هەنگاوێك کشانەوە دواوە و لە یەکتریان روانی. دەستم بە نێوچاوانم گرت، پـاڵم وە دیـوار داو چاوم لێك نا.

ئارمینە هاتە پێش و دەستمی گرت. «حاڵت باش نییە؟» ئارسینە دەستی دیکەمی گرت. « حاڵت باش نییە؟ چەندم پێخۆشبوو بڵێم « ئا، حاڵم باش نییە.» دەرفـەت نـەبوو لـە خـۆم بپرسم بۆ حاڵم باش نییە. لە زەنگیاندا.

دەستەکانم لەنێو دەستی دووانەکان راکێشاو بەرەو دەرگە چووم و لـە دڵـی خۆمـدا گـوتم «خوایە بۆ خۆت وەخێری گێڕی.» دەتگوت چاوەڕوانی قـەومانی رووداوێکـی سـەیرتر بـووم. دەرگەم کردەوە و بە مێشکم دا رابرد « لە وڵاتێکـی سـەمەرە دابـووم بـە ئـالیس.» ئەگـەر دەرفەتێکی تر بووایە بە هاو ناو بوونی قارەمانە چکۆڵەکەی کتێب لەگەڵ خوشـکم پێکـەنینم دەهاتێ. دەرفەتێکی تر نەبوو و حاڵم خاس نەبوو و پێکەنینم نەهاتێ.

وەستای کارەبای شەریکە بوو. هاتبوو چراکانی حەوشە دروست بکاتەوە. مێرێکی لاو کـە هەتا ئەو رۆژە نەمدیبوو. زۆر لەڕ بوو و خاڵێکی مەزنی لە سەر روومەتی بوو.

هەتا حەوشەی پشتەوە لەگەڵی چووم و گەڕامەوە. تا یەك یەکی چراکانی تاقیکردەوە و لە ژێر هەرکام لە چراکان دەستی بە قسە کرد کە تازە لە کۆمپانیای نەوت دامـەزراوە و هەنووکە کە کاری باشی چنگ کەوتووە لێبڕاوە زەماوەند بکا و دایکی کیژی پووری بـۆ بـە دەسـگیران کردووە و هەر لە منداڵییەوە پوورزاکەی خۆش ویستووە و ئاخرییەکەی بەم ئاکامە گەیی کـە «سیمەکانی یەکێ لە چراکان بە یەکەوە لکاوە.» کە خۆم دەمزانی. پاشان گوتی فازمێترەکەی لە کار کەوتووە و ئیشەڵڵا فازمێترمان هەیە.

لە هەبوونی فازمێتر دڵنیابووم، بەڵام هەرچی نێو قوتووی ئەمرازم پشکنی نەمدۆزییـەوە. بێگومان دیسان ئارمەن هەڵیگرتووە. لە دەرگەی ژوورەکـەییم دا و وەژوور کـەوتم. «فـازمێتر لای تۆیە؟»

لەگەڵ ئێمیلی لەسەر مێزی نووسین دانیشتبوون و پێیەکانیان رادەوەشاند. هەردوو بازیاندا خوار. ئارمەن بە پەشۆکاوی گوتی « نا، لای من نییە.» لە رێگە دا بیرم بۆ حەوشە چوو.

«عەجەب دەرس خوێندنێ.» کارەباچی گوتی «ناکرێ لە دراوسێکان وەرگری؟»

خاتوون رەحیمی کە لە تاران بوو. ئاغای رەحیمیش بێگومان لەو دەمەی رۆژێدا لە ماڵ نەبوو. ناسیاویم لەگەڵ دراوسێکانی تریش بەو رادەیە نەبوو لە رووم بێتەوە شتێ بە قەرز وەربگرم. گوتم « بۆچی، سەبرێك بگرە.»

لە شەقام تێپەڕیم و لە زەنگی سیمۆنیانەکانم دا. بێشك ئێمیل هێشتا لە کۆمپانیا نەگەڕابۆوە. خوا خوام بوو دایکی لەسەر کەلەکەی چۆپەی نەبێ و فازمێتری هەبێ. ئێمیل سیمۆنیان دەرگەی کردەوە. فازمێتری هێناو خۆشی لەگەڵم هات. «بەڵکو کارەباچی هاوکاری گەرەك بوو.» نازانم بۆ ئەگەر بە مەبەستی خولك کردنیش بووبێ دژایەتیم لەگەڵ هاتنەکەی نەکرد و بە بیریشمدا نەهات چۆنە لەو دەمەی رۆژێدا لە کۆمپانیا نییە هەستم کرد حاڵم خاستر بووە. ئالیس شتێکی گوتبوو. بێگومان تا ئەو رادەیەش نەزان نییە.

# ۱۷

ئێمیل گرفتی واپەرمەیتی (سیم کێشییەکەی) زووتر لە کارەباچییەکە دۆزییەوە و لە تەواوی ئەو ماوەیەی کە خەریکی سیمەکان بوو کارەباچی بێکار وێستا و لە چۆنایەتی زەماوەندی خۆی دواو هەروەها لەوە کە بەڵکو بتوانێ لە بەهمەنشیر یاکوو پیرۆزاوا ماڵ بگرێ و ئەگەر خوا مەیلی لەسەر بێ دوای زەماوەند بۆ زیارەت دەچنە مەشەد. لە ئاکامدا کەرەستەکانی کۆکردەوە و لەکاتی رۆیشتن دا بە پێکەنینەوە گوتی« بە هەبوونی هاوسێیەك وەکو ئاغای مەهەندیس، بۆچی تەلەفۆن لەمن دەکەی؟» نەگەیشتبووە بەر دەرگە ئاسنیەکە بانگم کرد «راوەستە.»

رامکردە ژوورێ. قەفەزەی چێشتخانەم کردەوە و قوتووەکەم دەسدایە. گەڕامەوە حەوشە و دامە دەستی کارەباچی. دە قوتووەکە راما. «شەکەراتی ئوستوور؟» و گەشایەوە. گوتم « بۆ بووکە خانی ببە» کەیفی پێ ساز بوو، سوپاسی کرد و رۆیی. ئێمیل سیمۆنیان چاوێکی لێکردم. دەستی خۆڵاوی و رەش بوو. خولقم کردە ژوور دەستی بشوا. و هەتا دەستی شورد

دوو شەربەی شەربەتی ویمتۆم دروست کرد کە لە بازاڕی کوێتییەکانم دەکڕی و لە ماڵدا جگە لە خۆم کەس پێی خۆش نەبوو.

هەرکە پێی نایە چێشتخانە دە دەوروبەری روانی. پاشان دەستەکانی بۆن کرد.«سابوونێکی چەند بۆنخۆشە، چێشتخانەیەکی چەند ژیکەڵە، ڕەنگی شەربەتەکە چەندە جوانە.»

نازانم بۆچی بە بۆنی سابوونی وینۆلیا دەکەوتمەوە بیر باوکم و داڵانە کەم نوورەکەی ماڵەکەمان لە تاراندا.

لە پشت مێز دانیشت و چاوی دە پەنجەرە بڕی. «خۆتان ئەم قەڕنیزەتان دروست کردووە، وەنییە؟ پەنجەرەی چێشتخانەی ئێمە قەڕنیزی نییە.

هیچکام لە پەنجەرەکانی ماڵەکانی بوواردە قەڕنیزیان نەبوو. تازە هاتبووینە ئابادان و ئارمەنم دە سکی دابوو کە ئاغا مورتەزا قەڕنیزی چێشتخانەی بۆم دروست کرد.

ئێمیل فڕێکی لە شەربەتەکەدا. چاوەڕێ بووم بڵێ تام خۆشە. نەیگوت. هێشتا هەر چاوی لە پەنجەرە بوو. «گوڵە نۆکەکان هەر دەتگوت گیانیان بە بەرەوە نەماوە.»

ئاغا مورتەزا دەستە قرتماغە گرتووەکانی بە سەر قەزنیز دا هێنابوو کە هێشتا پڕ لە تۆز و خۆڵی خشتە بوو. گوتبووی « ئەم قەڕنیزە بۆ گوڵە نۆکە دەناڵێ. مرۆڤ بە بۆنی عەترەکەی لەخۆ دەبێتەوە.» نەمدەزانی گوڵە نۆکە چ گوڵێکە و هەتا ئەوکاتە ناویشیم نەبیستبوو. یەك دوو حەوتوو دوای لە دایك بوونی ئارمەن، ئاغا مورتەزا ئەو رۆژی بڕیار نەبووبێ هات. گوڵدانێکی لە پاشتەرکی دووچەرخەکە کردەوە، داینایە سەر قەڕنیز. جێی بۆ کردەوە و گوتی «گوڵە نۆکە دیارییەکی بێ بایەخ.»

یەکەمجار بوو گوڵی بچکۆلەی شین و پەمەیی و چەرمووم دەبینی. ئێمیل ناوی ئەو گوڵانەی لە کوێ دەزانی؟ گوتم «دەبێ گڵەکەیان بگۆڕم.»

شەربەتی خوارد. «لە مەسجد سولێمان گوڵە نۆکەیەکم لە حەوشە چاندبوو. رامسپارد خۆڵ و کوودم بۆ باغچەکەی خۆمان بۆ بێنن. هێنایان، گڵی ئەوانەش دەگۆڕم.»

گوتم « باغەوانەکەی کۆمپانیا ئەمکارانە دەکا.»

شەربەکەی دانایە سەر مێز. زنجیری ملی دەپشکۆژی کراسی هاڵابوو. زنجیری لە پشکۆژەکە کردەوە. «زۆرم پێخۆشە بە گڵ و گوڵ و گیاوە خەریك بم. کاتێ دەبینی ئەو شتەی بە دەستی خۆتت داچاندووە وردە وردە باڵا دەکا کەیفی پێدەکەی، وەنییە؟»

بزەیەکی گەمشۆیانەم نیشتە سەر لێو.

پێکەنی.«دیارە لە داچاندنی گوڵدا وەك تۆ شارەزانیم.»

نیشانەی پرسیاری کە لە چاوانمدا دی گوتی « لە دووانەکانم بیست ئەو گوڵانەی ئەوشەوە بۆ دایکمت هێنابوو خۆت چاندبووتن.» هەستم بەوە کرد ئەوە دێ سوورهەڵگەڕێم. لەوەی کە گوتبووی تۆ، یاخووم بەوە نەگرتبوو کەسێ بە کارەکانم هەڵبلێ؟

پرسی «کارەباچیتان دەناسی؟» دیسان ئەوە دەیگوت ئێوە، گوتم «نا، یەکەمجار بوو دەمدی. تازە لە کۆمپانیای نەوت دامەزرا بوو.» دە خاچەکەی ملم راما. « ئەدی لە کوێ دەتزانی زەماوەند دەکا؟ خاچەکە خوار ببوو و راستم کردەوە. «خۆی گێڕایەوە.»

چاوی لە گوڵە نۆکەکان کرد. «دەزانم بۆ. گشتیان گەرەکیانە لەگەڵ تۆ باخۆن. ئاخۆتن لەگەڵ تو سانایە.» لێم ورد بۆوە. «دەڵێی مرۆڤ سەدساڵە دەتناسێ.»

ئارسینە و ئارمینە بە هەڵبەز دابەز پەیدا بوون. «کاری قوتابخانەی ئێمە تەواو بوو.» «ئێمیلی خەلاسی نەهات.»

تازە وەبیرم هاتەوە زیاتر لە سەعاتێکە هیچ دەنگێ لە ژووری ئارمینەوە نەهاتووە. هەتا ویستم لە جێوە رابم، ئێمیلی بە کتێب و دەفتەری ژێر هەنگڵییەوە وەژوور کەوت، ئارمینە و ئارسینە لەهەر دوو لاوە بە شان و ملی دا نووسان. « ماڵماڵێن بکەین؟» «یا بازەڵێن؟»

ئێمیلی دە باوکی رووانی ئێمیل دووایین فڕی لە شەربەتەکە دا و شەربەکەی نایە سەر کەشەف . «دایە گەورە تەنیایە. ژانە سەرەکەی گرتۆتەوە. بەڵکو باشتر بېێ —— »

ئارمینە پەڕییە نێو قسەکانی «با، دایە گەورە ئیسراحەت بکا. ئێمیلی لە لای ئێمە دەمێنێتەوە.» ئارسینە گوتی «دەجا ئەتۆش بمێنەوە. بەم چەشنە دایە گەورەش پشوویەکی چاکی بۆ دەدا.»

ئێمیل پێکەنی و لەمن راما. «زەحمەت دانی دوو شەو لەسەر یەك نابێتە روو هەڵماڵاوی؟» دڵنیا بووم کەوتبووە شەرمە حزووری، گوتم «بمێننەوە. ئارتووشیش لەهەر کوێ بێ دێتەوە.» قسەکەم تەواو نەببوو، دەنگی پڕخە ئاسای شۆوەرلێت لە شەقامەوە هات.

ئارمینە و ئارسینە وەك کێچ هەڵبەزینەوە. «بمێننەوە. بمێننەوە. تکا دەکەین.» پاشان زەق چاویان لەمن کرد.

گوتم «تەلەفۆن لە خاتوون سیمۆنیان دەکەم.» گشتمان زۆر زوو فێر ببووین کە نەك هەر ئیزنی ئێمیلی بەڵکو ئیزنی باوکی ئێمیلیش هەر لەدەس دایە گەورە دایە.

سلاوی ئارتووشم له کاتێك دا وەرگرتەوە که دووانەکان بەسەر و گوێلاکی هەڵدەزنان و لە حاڵێکدا که لەبیری دژ کردەوەی ئێلمیرا سیمۆنیاندا بووم ژمارەم گرت. دەنگی بێواز و ماندوو بوو. «ئەمن کارم پێیاندا نییە. بۆخۆیان دەزانن.» و گووشییەکەی دانا.

خەریکی دروست کردنی شێو بووم. کۆتلێت لەگەڵ پەتاتەی سوورکراوە. رووداوی دووا نیوەڕۆ و هەڵوێستی سەرسووڕهێنەری خوشکم له زەینم دا شۆرابۆوە. بۆچی هێندە تووڕە ببووم؟ یەکەم جار نەبوو ئالیس لەم هەڵوێستە سەمەرانەی گرتبوو. مەگین دکتۆری هەرمەنی نەخۆشخانە نەبوو؟ یا برای ئەو دۆستەی که له تارانەوە هاتبوو؟ هۆی بێ حاڵ بوونی ئەمجارە رەنگە هەر ئەوە بوو کە — لایەنی خۆ تێهەڵقوتێن سنگی رەپێش خست، «ئەوە بوو کەچی؟» رۆنم دەتاوە کرد. ئەوە بوو کە ماندوو بووم. ئەوە بوو کە — نازانم. ئێمیل و ئارتووش لە ژووری دانیشتن دا شەترەنجیان دەکرد و دەنگی راکە راکەی مندالآن له حەوشە دەهات.

هەر بەو بیرەی ئێلمیرا سیمۆنیانەوە کوتلێتەکانم وەردەگێڕا. دایکم گوتبووی ماڵە باوکی وەك کۆشك وابوو، پەنجا شێست هۆدە، باغی مەزن، دەست و پێوەند. پەرستارێکی کە خۆ کوژی کرد ئینگلیزی بوو. دەیانگوت خاتوون هەر بەم بەژنە کورتەیەوە سەد بەندەواری* هەبوو، چ بەر له شوو کردن چ پاش هەنگی. مرۆڤانی سەر و سەکووت وێچووی فرەنگی کە دەهاتنە ئیسفەهان بۆخۆی و ئەو میواندارییانەی که دەیدا سەر و دەستیان دەشکاند.»

پەتاتەم پاکرد و بیرم بۆ ئەوە چوو که بێشك زێدەڕۆییان کردووە. ئاخر بەو بالآیەوە. ـــــ

ئەوە خەریك بووم خاتوون سیمۆنیانم لەسەردەمی لاویدا دەهێنایە بەرچاو کە ئارمەن و ئێمیلی به هەناسە بڕکێ و ئارەق کردوو له چێشتخانە وەژوور کەوتن. ئارمەن شووشەی ئاوی له سەلاجە دەرێنا و لەپێشدا ئاوی بۆ ئێمیلی تێکرد و دوایە بۆخۆی. قژی ئێمیلی بە نێو چاوانییەوە نووسابوو و چاوەکانی دە درەوشانەوە. ئەوەم بە زەیندا هات که دایە گەورە ئەگەر شێوەی ئێستای نەوەکەی بووایە ـــــ »

شووشەی ئاو که ئارمەن لەسەر پێشخان جێ هێشتبوو خستمەوە سەلاجەکەوە.« ـــــ رەنگبێ قسەی خەڵکی دروستیش بووبێ.»

پەتاتەکانم خستە نێو رۆنی داغەوە بوو. دایکم گوتبووی «باوکی بەستەزمانم چ شاییەکی بۆ زەماوەندی کیژەکەی وەڕێخست ئۆرکێستی له تاران و چێشت لێنەری له فەڕانسەوە هێنا. کۆنترین شەڕابەکانی له لیونی شەڕابگر کڕی. گەلێك لە گەورە پیاوانی دەربار و باڵوێزە بیانییەکان بانگێشتن کرابوون.» پەتاتەکانم لێکدا و بیرم لەوە دەکردەوە که دوای ژیانێکی کە

دایکم پەسندی دەکرد، ماڵێکی بــوواردەی بــاکوور دەبــێ چــەندە چــکۆڵە بــێ. ژووره چــۆڵ و رووناکاییە کەم هێزەکانی ماڵم بــیر کەوتــەوە و روو مێــزی و پــەڕۆی ســفرەکەتانییەکانی کــە سەردەمێ جوان بوون و بێشك گران. کەوتمەوە بیر کەوچك و چەنگاڵە زێوینــەکانی کــە کــەم و زۆر رەش هەڵگەڕابوون و هەر وەتر فەخفوورییە لێو کەتەکان. تەنیا هەر دوو شەمدانییە چەند لقەکە بێگومان هێشتا ئەو تروسکەیەی ساڵانی زۆر دوور و درێــژیان هــەر مــابوو و هــەروەتر دۆلابە دارینەکەش.

لەسەر پەتاتەکان وێستا بووم هــەتا نەســۆژێن و کەوتبوومــە نێــو بــیرو خــەیاڵ. ئــێلمیرا سیمۆنیان بۆ یەکەمجار روو مێزییەکەی لە کوێ بەسەر مێز داداوە؟ لە ماڵەکەیدا لە کەلکەتە؟ یا لە ئاپارتمانەکەی پاریسدا کە دەیگوت رووبەڕووی کلێسای نۆتر دام بوو؟ وەبیرم هاتــەوە روو مێزییەکە لە هەر لایەکەوە لە عەرزی دەخشا کەوابوو هی مێزێکی زۆر مەزنتر بووە. رەنگبێ دوازدە نەفەرە، بە کورسی پاڵپشت بڵێندی روو مەخمەری. خانە خوێ بە قژی یەکــدەس رەش، سوور و سپیاو کــردە، دەجلێکــی پێســیرتۆڕیدا، گــوارەی داهێڵــڕاو لــە گوێــدا و ســینەبەری ئەڵماسی لە ملدا، پیاڵەی کریستاڵی لێك و لووسی لــە لێــوە ســوورەکانی نزیــك دەکــردەوە و چاوانێکی رەش کە بێگومان هەر بەو درەوشاوەییەی چاوەکانی نەوەکەی بووە. چەند ساتێك لە مەوبەر، لە سەرەوەی شەربە ئاوەکە دا.

بە دەنگی ئێمیل سیمۆنیان کە گوتی « ئەم بۆنانە چەند خۆشــن،» لــە گومــانی میــوانی خەیاڵی گەنجایەتی دایکی هاتمەدەر و لە پەتاتەکان ورد بوومەوە کە دەهات بسوژێن.

هاوارم لێ هەستا « وەەەی!» وەك گێژان تاوەکەم بە هەر دوو دەست راکرد و دامنایە سەر پێشخان. دوای ئەوە تاوەکەم بەر دا هەستم بە زوورانەوە کرد. ســووتاندنی دەســت لــە کــاتی لێنانی چێشت یا ئوتوو کردن بەشێك لە کارە باوەکانی من بوو. خووم بــە ئــێش و زوورانــەوە گرتبوو و بەدەگمەن دەنگم لێوە دەهات. بەڵام ئەمجارە ئیتر نەشیام بەری ئــاخ و ئــۆخم بگــرم. شەلاڵی ئارەقە ببووم.

ئێمیل هاواری کرد «چ بەڵایەکت بەسەر خۆ هێنا؟» پیلی گرتم و رایکێشــامە لای مێــز و نزیکترین ئەسکە ملی کێشاوە دواوە. «کوا بزانم.»

لەسەر کورسی دانیشتم بۆ دیسان گوتی ئەتۆ؟ چاوم لە لەپی دەستەکانم کرد، هەروا ســوور هەڵدەگەڕان. ئاوی دە شەربە کرد و لە زارمی نزیك کــردەوە. «نیگــەران مەبــە. هــەر ئێســتا

چاکی دەکەمەوە.» شەربەکەی لەسەر مێز دانا و لە چێشتخانە وەدەرکەوت دیسـان گوتبـووی ئەتۆ.

خراتر لە ئێش و نیگەرانی ئەوەی کە هەتا چـەند رۆژی تـر ناشـێم هـیچ کارێـك بکـەم و چێشتی سبەی چی لێدێ و قاپەکان کێ دەشوا و دەیان «چ دەبێ» و "کێ دەیکا" یـەکی تـر، بۆڵە بۆڵی ئارتووش بوو کە بە بیستنی دەنگی ناڵە ناڵم خۆی گەیاندبووە چێشـتخانە، لەسـەر سەرم وێستابوو و وەك هەموو دەم بۆڵاندی، ئەو دەمانەی کە ئەم چەشنە کارانـە روویانـدە دا. «سەدجار گوتوومە ئاگات لەخۆ بێ، پەتاتە سووتا کە سووتا. بۆ دە فکری خۆتـدانی؟ بۆچـی بەو گەرمایە کۆتلێت و پەتاتە سوور دەکەیـەوە؟ چێشـتم لـە دەرەوە دەهێنـا. دڵنیـا بـە کـە چێشتی دەرێ کەسی نەکوشتووە. ئەم راڕاییە بێ هۆیە لە دایکتەوە بۆت بە میرات ماوەتەوە. بریا خوشکیشت بڕووسکەیەك* لەو راڕایی تۆی بووایە کە ـــ »

هەوڵم دا نەیبیسم. گەلێك ساڵ بوو ئەوە تێگەیبووم ئـارتووش بـە تاوانبـار کردنـی هـەر کەسێکی کە رووداوێکی لێدەقەومێ خۆشەویستی یەکەی دەنوێنێ. هەر جارەی کە منـداڵ وە عەردی دەکەوتن یا نەخۆش دەبوون یا جێگەیەکیان دەیەشا ئـەم بـەزم و هەرایـەمان هـەبوو. ئەوەش کە بۆ تانە و تەشەر لێدان لە دایکم و ئالیس لەهـەر دەرفـەتێك کـەلکی وەردەگـرت، لەمەڕ ئەمە بوو دایکم و ئالیسیش هەر ئەم کارەیان لەگەڵ ئـارتووش دەکـرد و لـەو نێـوە دا ئەمن گەلێك ساڵ بوو دەوری نێوبژیکەرم دەگێڕا. ئێستاش لە دەوری من و مێزیی چێشـتخانە دا هەڵدەسووڕا و یەکبین دەئاخۆت. سەرم دەگێژەوە دەهات و زوورانەوەی دەسـتەکانم زۆرتـر و زۆرتر دەبوو کە ئێمیل سیمۆنیان بە خۆی و شووشەیەکی قاوەیی گەورەوە پەیدا بوو. بێ ئـەوە قسەیەك بکا چەند جار دەستی کردە نێو شووشە و بە مادەیەکی رەش و لیچـقی شـێوە کـرێم هەر دوو دەستمی چەور کرد. ئارتووش کـپ و بێـدەنگ لەسـەر سـەرمان چـەقیبوو و چـاوی لێدەکردین. هەروا کە دە دەستەکانم راما بووم لە ناکاو هەستم کرد. گـەرم داهـاتم، لام وابـوو دیسان دەستەکانم بە تاوە نووسا و سووتا. لەپی دەستەکانم کەوتنە چـڵدان، پاشـان وردە وردە سارد و ساردتر بوونەوە و کۆتایی بە چڵدانەکە هات، لە ئارەقە دا شەڵاڵ ببووم. هەرکە سـەرم هەڵێنا ئێمیل چاوی لێم بـوو، بـە زەردەخەنەیـەکی کـە دەتگـوت دەڵـێ «نـەمگوت چـاکی دەکەمەوە؟»

# ١٨

هەر سێکمان لە پشت مێزی چێشتخانە دانیشتبووین. ئێمیل لــە بابــەت مــاجوومی دژی سووتانەوەی هیندی دەدوا و پەتاتەی پا دەکرد. پەتاتە ســووتاوەکانی خســتبووە نێــو ســەتڵی زبڵ، لەنێو قوڵێنەکــەی پــاڵ ســەلاجە چــەند پەتاتــەی درشــتی دەســدابۆیە و پــاکی دەکــرد. ئارتووشیش لەکنە خۆ یارمەتی دەدا. دەمگوت ئاخۆ ئارتووش لە عــومری خۆیــدا چــەندجار پەتاتەی پاك کردووە؟ دەستەکانم هەروا راگرتبوو و گوێم بۆ ئێمیل شل کردبــوو. « یــەکێ لــە چێشت لێنەرەکانمان کە خەڵکی باشووری هیند بوو، چەندین ساڵ لەمەو بەر دوو شووشــە لــەم ماجوومەی بۆ دایکم هێنا.»

دووانەکان خۆیان بە ژوور داکرد.

پرسیم « رامۆ؟» و لە جێوە لە پرسیارەکەم پەژیوان بوومــەوە. بیرهێنانەوەیــەکی نــاخۆش بوو. کاردەکەی لەسەر مێز دانا، گوتی « باوکی رامۆ بوو.» چەند ساتێ کپ ماوە، کێردەکەی دەسدایەوە. «چەند جار دام لە جێگاگەلی جیاواز دا تاقییان کردەوە، بەڵام کەس ســەرە دەرەی لە پێکهاتەکەی دەرنەکرد. هەر ئەوەندە تێگەیین کە لە ریشــە و گــەڵای گیــا جۆراوجۆرەکــان دروست کراوە کە خۆم لەپێشدا دەمزانی.»

ئارتووش دەرگەی سەلاجەی پێوەدا و لە پشت مێز دانیشت. پرسیم « منداڵ چیان گەرەك بوو؟» گوتی « ئاو.»

هەتا ئارتووش یەك دوو پەتاتەی بێ سەرە و بەرە پاکرد، ئێمیل ئەوانی تری پا کرد و قاش قاشی کرد و خستیە نێو پاڵوێنە و لە جێوە رابوو. لە بنەماڵــەی رامــۆ دا تــەنیا یــەك کــەس شارەزای شێوەی دروست کردنی ئەم ماجوومەیە کە بەر لە مردنی هەر فێــری کەســێکی تــری ئەو بنەماڵەیە دەکا.» پاڵوێنەی نایە نێو قاپشــۆری و شــێرەی ئــاوی کــردەوە. لام وابــوو کــە دایکی لێرە نییە زەلام زەلام نائاخوێ.

تەلەفۆن زەنگی لێدا، یەکێك لە دالانەوە گووشییەکەی راکرد و چەند سات دواتــر ئارمــەن بانگی کرد «دااایە! تەلەفۆن . خاتوون نوورولڵایی.»

هاوارم کرد « لەگەڵ من یا باوکت؟»

« لەگەڵ تۆ.»

رابووم. ئارتووش گوتی « گووشی به دهستهوه بگری ئێشت پێرا ناگا؟» ئێمیل له پاڵ قاپشۆرییهکهوه ئاورِی داوه. ئاوی شێره دهرِژایه سهر پهتاته قاشکراوهکانی نێو پاڵوێنه. ئهمن پێم وابوو، یا ئهو به نیگهرانیهوه دهیرِوانی؟

دهستهکانم لێك کردهوه و پێکم وهناوه. ئێشی زۆر کهم ببووه. سهرم هەژاند که « نا. ئێشی نییه.» بهرهو دالان تێههڵبووم. ئێمیلی به جوولاندنهوهی سهر و دهستی شتێکی دهگێراوه. ئهگهر نهمزانیبا پێم وابوو خاتوونێکی گهنجه نهك کیژۆڵهیهك. ئارمهن دهستی نابووه ژێر چهناگهی و له راحهتییهکهی ههمبهرهوه ده ئێمیلی رامابوو.

بهم بیرهوه که خاتوون نوورولڵایی ئیشی چییه و چاوم لههەر دوو دهستم بوو که دهتگوت تازه به گرینگییهکانیانم زانیوه، گووشیم دهسدایه.

خاتوون نوورولڵایی رۆژان ئاسا سڵاو و چاك و خۆشییهکی دوورودرێژ و گهرمی کرد و ههتا له یهك یهکی منداڵهکانی نهپرسی نهپرِژایه سهر باسی سهرهکی. یادهوهرییهکی سهیری بوو. نه تهنیا ناوی منداڵهکانی لهبیر مابوو و ئهوهشی ههر له یاد بوو پۆلی چهندهمن. تهنانهت سهرما لێدانی چهند مانگ لهمهو پێشی دووانهکانیشی ههر لهبیر مابوو. له ئاخریدا گوتی « ههینی رابردوو له نوتقی یهکێ له کۆبوونهوهکانی گوڵستاندا دیمی. ببووره که دهرفهت نهبوو بێمه سڵاوت.»

هیچ نیشانێك له تهوس و پلار له ئاخۆتنهکهیدا بهدی نهدهکرا. به خۆدا شکامهوه. ئهمن دهبووایه به دوای ئاخاوتنی دا چووبامه پێش و پیرۆزباییم پێ گوتبا، بهڵام نهچووبووم و پێم نهگوتبوو. خاتوون نوورولڵایی نه ئیزنی ئهوهیدا بۆی باس بکهم و نههێشتی داوای لێبووردنی لێبکهم و نه ههر دهتگوت چاوهرِوانیشی لێم بوو. « مهبهستم ئهوه بوو تکاتان لێبکهم خۆشهویستی بنوێنن و له کۆبوونهوهکانی داهاتووی ئهنجومهنی ئێمه بهشداربن. خاتوونه ههرمهنییهکان مهرحهمهتیان سهبارهت به ئێمه کهمه. دهزانم خۆتان ئهنجومهنتان ههیه و چالاکی فره باشیشی ههیه. بهڵام ههروهك ئاگادارن ههڵبژاردنهکانی پارلمان نزیکه و بێشك لێتان روونه ئهمساڵ به هۆی دۆزی مافی دهنگ بۆ ئافرهتانی ئێرانی ساڵێکی گرینگه و ـــــ»

نهمدهزانی ههڵبژاردنهکانی پارِلمان نزیکه و لهمهرِ مافی دهنگی ژنان تهنیا شتگهلێکم بیستبوو. لام وابوو ههروهك زۆربهی ههرمهنیهکان ههر دهڵێی لهم وڵاتهدا ناژیم. به خۆ داشکامهوه و رهنگبێ بۆ قهرهبوو کردنهوه، ههتا خاتوون نوورولڵایی گوتی «چهند پرسیارم

هەبوو. ئیزنم بدەن هەرکات دەرفەتتان بـوو بێمـە خزمـەتتان؟» گـوتم «بێشـك ، بـەو پـەڕی تاسەوە.» بەر لە ماڵاوایی گوتی: «بەراست ، بۆ ٢٤ی ئەپڕێلی ئیمساڵیش بۆنەتان هەیە؟»

گووشییەکەم دانا و چوومە چێشتخانە. خاتوون نوورولڵایی خۆ هەرمەنی نەبووە ئاگـاداری ٢٤ی ئاوریلی ئێمە بوو و ئەمن کە لەم وڵاتە دا لە دایك ببووم ئەیزەن بـە خـۆدا شـکامەوە. گوتبووی «ئێمە دەبێ زۆر شت لە خاتوونـە هەرمەنییـەکان فێـر بـین.» بێگومـان کـەوتبووە شەرمە حوزووری.

لەسەر جێگاکەم دانیشتم و دە دەستەکانم رامـام. هـەر دەتگـوت نەسـووتاون. ئـارتووش داهاتەوە لام، دەستمی لاواندەوە و هێدی چرپاندییە گوێم «نایەشـی؟» پێدەکـەنی و دەمزانـی دەیەوێ دڵم بداتەوە، بزەم هاتێ و سەرم لەقاند کە «نا.»

چاوم لە ئێمیل کرد. پالۆێنە بەدەس لە هەمبەرمان وێستابوو و چاوی لێم دەکرد. شـێرەی ئاوی قاپشۆری گیرابۆوە. بۆ چەند ساتێ چاومان لەسەر یەك هەڵنەگرت. پاشان گوتی «ڕۆنەکە لە کوێیە؟»

لە جێوە دەرپەڕیم. «ئەتۆ بۆ؟» و دەستم برد پالۆێنەکە وەرگرم، پالۆێنەی کشاندەوە.

ئارتووش دانەدەسەکنی « هەر ئێستا دەبێ پەتاتەی سوورکراوە بخۆین؟»

گوتم «بچوو سەرێکی منداڵەکان بدە.» رۆیی، هەر دەتگوت لە خوای دەوێ.

چاوم لە ئێمیل کرد. پەتاتەکانی دە پالۆێنە دا لێکدا. «وابزانم لەو مرۆڤە دەگمەنانەم کـە چێشت لێنانیان پێخۆشە.» دوو پشکۆژی سەرەوەی کراسەکەی کرابـۆوە و زنجـیرە زێڕەکـە بـە دیارەوە بوو. چاوی دە چێشتخانە بڕی و دەنگی هێنایە خوار. بە پێچەوانە لە سیاسەت بێزارم . بەڵام هەر دەڵێی ئارتووش ـــ»

چاوەنوار تێم راما.

گوتم «نا. یانی ئا. یانی تا ئەو رادەیە کە هەواڵەکان وەخوێنی و هێنـدێ جـاریش ـــــ » وەرسووڕام و قوتووی رۆنم لە قەفەزەی پشت سەرمەوە راکرد.

قوتووەکەی لە دەستم وەرگرت «قەت ئارام لەگەڵ سیاسەت نەهاتووە. سەرەدەرە لـە هـیچ کام لەوئیسم و مەرام و ئایینگەلە دەرناکەم. لەباتی ئەم قسانە پێم خۆشە کتێـب بخوێنمـەوە. ئەگەر بڕیار وایە دنیا باشتر بێ، من کە گومانم لێی هەیە بە سیاسەت کاری نییە ها؟ تۆ چۆن بیر دەکەیەوە؟» لەجیاتی وەڵام گەوجانە پێکەنیم.

بە یەکەوە پەتاتەمان سوور کردەوە و سالادمان دروست کرد.

له بابەت چێشتگەلی هیندی و بەهاراتە جۆراوجۆرەکـان و تایبەتمەنـدی هـەرکامیان دوا. لەمەڕ نووسەرانی دڵخوازی خۆمان و ئەو کتێبانەی کە خوێندبوومانەوە باسمان کرد.

تکای لێکردم لەجیاتی ئاغای سیمۆنیان "ئێمیل"ی بانگ بکەم.

دیسان فکرم کردەوە دایکی لێرە نییە چەند راحەت و قسە خۆشە.

مێزی شێوم رازاندەوە و ئارتووش و ئێمیل سەریان بەسەر رووپـەڕی شـەترەنج دا گرتبـوو. گوتم «ئیرادی نییە چێشت بۆ دایکت ببەم؟ رەنگبێ لەبەر سەرئێشە وازی دروست کردنی شێوی نەبووبێ.» ماوەیێ چاوی لێکردم دوایە گوتی «بەڵێ، رەنگبێ ، نازانم.» ئەگەر قسـە دەهاتـە سەر دایکی تەنانەت شێوە ئاخاوتنەکەشی دەگۆڕا.

# ١٩

دەوریی کۆتلێت و پەتاتەم لەگەڵ دەفری چکۆڵەی سەلاتە دانایە نێو سنی و بۆ ئەوەی هەتا دەگەمە ئەوبەری شەقام پێنسەد هەزار دەعبـا دە چێشـتەکە نەکـەوێ، سـەری سـنیەکەم بـە پەڕۆیەکی گەورە داپۆشی. ئەگەر کوو چراکانی حەوشـە دایسـا، لـە تـەواوی درێـژایی رێگـە باریکەکەدا کەشەف بە دەست هەنگاوی پتەوم نایەوە و پێم دە عەرزی کوتا. ئەمە شـێوەیەك لە داهێنانەکانی خۆم بوو بۆ ئاگادارکردنەوەی بۆقە نەفامەکان هەتا خۆ ناوێنـە بـەر پێیـانم و زراو بردووم نەکەن. ئارتووش و منداڵەکان بەم کارەم پێکەنین.

ئاغای رەحیمی خەریکی ئاودانی حەوشـە بـوو وەك هەمیشـە بـە دەنگـی بـەرز گـۆرانی دەچڕی. ئارمەن دەیگوت «ئاغای رەحیمی دەنگی ئەوەندە ناخۆشە خـاتوون رەحیمـی رێگـەی نەدەدا لە ماڵەوە گۆرانی بچڕێ. هەر بۆیە ئاغای رەحیمی رۆژێ سێ جار باغچـە و حەوشـە و بەشێك لە شەقامی ئاو دەدا.» هەرچەند رۆژ نەبوو ئارسینە و ئارمینە لەگەڵ ئارمەن بە کێشە نەیەن و شەڕیان لێ پەیدا نەبێ، تەنانەت گاڵتە بێتامەکانی براگەورە دووانـەکانی وەپێکـەنین دەخست. بەم بیرەوە کە دەنگی ئاغای رەحیمی هیچ ناخۆشیش نییە، بە شـەقامدا تێدەپـەڕیم کە لاقم خوشی. ئارمەن راستی دەگوت. ئاغای رەحیمی پانایی شەقامیشی ئاو دابوو.

دەرگە ئاسنییەکەی جی چوارم کـردەوە. چـراکانی حەوشـە دانەییسـان. بـەڵام رووناکـایی مانگ بەو رادەیە بوو کە باغچە بێ گوڵ و چیمەنە زەرد و وشك بووەکانی حەوشە ببینم. لقـە

وشك هەڵاتووەکانی لاو لاو وەك تەونی داپیرۆشك لە دیواری ماڵــەوە هــاڵابوون. پارەکــە ئــەم دیوارە یەکسەر سەوز بوو. لە باتی زەنگ چەند جار سەبرۆکە بە دەست لە دەرگەم دا. نێو ماڵ تاریك بوو. پێم وابوو دەبێ خەوتبێ. دەمویست بگەڕێمەوە دەرگە کرایەوە. بە جلی خەوی قۆڵ درێژ و یاخە داخراو چاوی دە سنیەکەی دەستم بڕی کە دروست بەرەو رووی بوو. ئەوجار سەری بەرز کردەوە، گوتم «ببوورن، چەند کۆتلێتم هێناوە. بەڵام ئەگەر پێتان خۆشە و چان بدەن ــــــ »

رووناکایی مانگ لە دەم و چاویدەدا. لام وابوو چــاوەکانی ســوور هەڵگــەڕاوە و ئەســتوور بووە. بزەیەکی بێوازانەی هاتێ. «گەورەتییان نواندووە. کەرەمکە ژوور.» لەبەر دەرگە لاچوو. دەنگی لەگەڵ دەنگە ماندوو و بێ واز و تووڕەکەی سەر تەلەفۆن جیاواز بوو. ماندوو بوو بەڵام تووڕە و بێ واز نەبوو. خۆ قەیدی نییە راکشێم؟ زۆر لەسەر واز نیم.»

چرای داڵانی هەڵکرد و بەرەو ژووری خەو چوو. باسێك لە چەمەدانە ئاســنییەکان نــەبوو، بەڵام فیلە خورتووم شکاوەکە هەر لە جێی خۆی بوو دەرگەی ژووری ئێمیلی کریابۆوە. هێنــدێ قاقەزی دڕاو و چەمۆڵە کراوی نۆت و مقەست و کوتە پارچــەی دڕاو و بــڕاوی ســپی لەســەر عەردی پرش و بڵاو ببوو.

تەنیا چرا چکۆڵەی پێتەختی ژووری خەوی خاتوون سیمۆنیان دایسا. پەنجەرە بێ پەردە بوو و لایەکی فەرش قەد ببۆوە. چەند وێنە لەسەر قەرەوێڵە بــوو و چــەند ئــاڵبۆمی نیــوە ئــاوەڵا لەسەر عەردی. سنیەکەی لە دەستم وەرگرت و نایەسەر پێتەختی و پەڕۆکــەی لەســەر لابــرد. ماوەیێ دە دەوریی چێشت و دەفری لاسەتە راما. پاشان گەڕاوە «سوپاستان دەکەم کە ئێمەتان لەبیر بوو.» رووناکی چرای خەو وەدەم و چاوی دەکەوت. ئەمجار دڵنیابووم کە گریاوە.

بۆ ئەوەی قسەیەکم کردبێ گوتم «چ دەخۆن . دەڵێن چێشــت خــواردن بــۆ ســەر ئێشــە بــە قازانجە.» بۆچی زەلام زەلام دە ئاخۆتم؟

وێنەکانی سەر قەرەوێڵەی وەلانا. دەستێکی بە قژیدا هێنا. لەســەر قەرەوێڵــە دانیشــت و لێمی ویست دانیشم. یەکێ لە وێنەکانی راکرد. «سەرم نایەشــێ.» چــەند ســاتێ دە وێنەکــە راما. ئەوجار دەلای منی کرد.

لەو وێنانە بوو کە پێشوو لە وێنەگریدا دەیانکێشا. لە یەکەم نیگادا وەمزانی ئێمیلییە بە جلی یاخە داخراوی بۆرەوە لەسەر کورسی پشــت بڵێنــدی رەق و تــەق دانیشــتووە. نــەوارێکی

فۆكلّداری مەزنی بە سەرەوە بوو و قژە لوول دراوەكانی بەولاو بەو لای شانیدا داهێشتبووە خوارێ. پشیلەیەك لەسەر ئەژنۆی دانیشتبوو. لە ئەژنۆ بەرەو ژێرەوە لە وێنەكە دا نەهاتبوو.

وێنەی لە دەستم وەرگرت. «ئێمیلی نییە، خۆمم. كەمێ مەزنتر لە ئێستای ئێمیلی بووم.» چاوێكی لەو لاو لەو لای وێنەكە كردو دایەوە دەستم. لە پشتی وێنەكە نووسرابوو: ئێلمیرا هاروو تونیان — پاییزی پازدە ساڵانە. خەتەكە یەكدەست و درشت و پتەو بوو.

پاڵی وە دەستەی قەرەوێلە دا و دە ساپیتە* راما. «باوكم ساڵێ چەندجار وێنەگری دەهێنایە ماڵ یا منی دەبردە وێنەگری. جەختی لەسەر ئەوە بوو وێنەكان هەموو بە دانیشتنەوە و هەتا ئەژنۆیان بێ، بۆ ئەوە كورتی بەژنم بە دیار نەكەوێ. لای وابوو، چونكە بەژنم كورتە زوو دەمرم. دەیگوت گەرەكیە دوای مردنم وێنەی منی ببێ.» بە دەم رامان دە ساپیتەوە بزەی هاتێ. «بە باوكم سەلماند جارێ دەبەر دانیم بەر لە خۆی بمرم. لە دكتۆرانیشیان كە دەپرسی دەیانگوت ئەگەر منداڵم ببێ دەمرم، هەر لە خۆڕا.» چەند وێنەی تری پێشاندام، دیسان سەری وە دەستەی قەرەوێلە كرد و چاوی لێك نا. لەبەر خۆمەوە گوتم چۆنە قسەی قەڵەمی ناكا؟

وێنەكانم چاو لێكرد، هەموویان كەم و زۆر شێوەی وێنەی یەكەم بوون. لەسەر قەنەفەیەكی نێوباغی، لە پاڵ پنچكێكی مەزن كە پێدەچوو نەستەرەن بێ. لەبەر دەم كوورەی دیواری گێچ بڕی كراوە، لەسەر ئەسكەمل باوەشێن بە دەستەوە و سەگێكی كە هەر سەری لەسەر ئەژنۆكانی بە دەرەوە بوو. پشتی گشت وێنەكان بە دەسنووسێكی پتەو و یەكدەست نووسرابوو: ئێلمیرا هاروو تونیان، چاردە ساڵانە یا شازدە یا دوازدە ساڵانە.

هەر واچاوم لە وێنەكان دەكرد كە چاوی هەڵێنا، پشتی راست كردەوە و دەستی بە نێوچاوانیدا هێنا. «ببوورن كە زۆر وێژیم كرد. هێندێ جار وەبیر رابردوو دەكەومەوە. خۆشەویستیتان نواند كە هاتن، ئێستا — ئەگەر ئیزن بدەن — هەر كە ماڵاواییم كرد پرسی «زوورانەوەی دەستت چابۆوە؟» سەرم لەقاند و بە بزەیەكی بێ وازانە سەری هەژاند.

شەو لەنێو قەرەوێڵە دا بە ئارتووشم گوت «هەر دەڵێی لە هەموو تەمەنیدا تۆڵەی لە خەڵك كردۆتەوە.» كە وەڵامی نەدامەوە سەرم وەرسووڕاندو چاوم لێكرد. خەوتبوو. چرای خەوم كوژاندەوە و گوێم دایە دەنگی یەك چەشنی كۆلێرەكان. زۆرم پێخۆشبوو بەشەكەی تری وێنەكان ببینم.

# ٢٠

مالّی نینا یەکێ لە ماڵە مەزنەکانی گەڕەکی بڕەیم بوو. لە چەند هەنگاوی ئەستێرك.

کاتێ لە ماشین دادەبەزین ئارمینە گوتی «خۆزگەم بە سووفی.» ئارسینە گوتی «بۆ ئەستێرك دوو چرکە ساتیش نابێ.»

ئارتووش ماشێنی پاڕك کرد و ئارمەن هاواری کرد«وریابە شێوی گیان خەتی تێنەکەوێ.» کیژەکان پێکەنین . رۆژ نەبوو منداڵەکان تەوس و پلار بە شۆڤرلێتە کۆنەی ئارتووش دانەدەن.

پێمان لە حەوشە نەنابوو، سووفی لە ژوورێ را رایکردە دەر و هاواری کرد «کەروێشکمان کڕیوە.» چووینە ژوورێ.

نینا مالّی پیّشان دەداین و دایکم لەبن گوێمدا بۆڵەی دەهات «چاو چاو، ماڵ دەڵێی کەڵ تێیهەڵداوە. هەر دەڵێی دوێنێ ماڵی گوێستۆتەوە.»

گەیشتینە چێشتخانە کە مەزن و بەرفرەوان بوو. نینا شەربەتی دە شەربەکان کرد و گوتی «چاوتان لێیە؟ هێشتا ئەو گشتە کەلوپەلە جێبەجێ نەکراوم ماوەتەوە. یەکی ناشارەزا بێ لای وایە دوێنێ ماڵم گوێستۆتەوە. شڵەپەتەترین ئافرەتی دنیایان بەسەردا بڕیوم.» و قاقا پێکەنی.

دایکم و ئالیس روانینە یەکتر و گارنیك کە هەر ئەودەم لەگەڵ ئارتووش هاتبووە چێشتخانە گوتی « بە تۆ دەڵێن مەشرەف خۆشترین ئافرەتی دنیا.» و کەشەفی شەربەتی لە دەس نینا وەرگرت «بیدە بە من بیبەم ، ئازیز گیان.»

ئالیس لە ژێر لێوەوە گوتی «دەنکە جۆیەك چانس.» ئارتووش هەولّیدا بەری باوێشکەکەی بگرێ و دەس دەگێرفاندا بە شوێن گارنیك داچوو. هێشتا شەو دانەهاتبوو وازی بە سەرچوو بوو.

ژووری میوانانیش مەزن و بەرفرەوان بوو. کیژەکان ئەو لەیستۆکانەی کە بۆ سووفیمان بە دیاری هێنابوو، بە گۆڕێیان وەرکردبوو و کایەیان پێدەکرد.

گارنیك سینی شەربەت بە دەستەوە بە نێو منداڵەکاندا تێپەڕی ، وای پێشان دەدا کە پێ لە لەیستۆکەکان دەنێ. دووانەکان و سووفی قیژاندیان و پێکەنین و نینا گوتی «چ دیاریگەلێکی کەشخەن. سوپاس منداڵینە.» پاشان روویدە ئارمەن کرد کە لە نزیك پەنجەرە وێستا بوو. «بۆ

وێستاوی؟ کوڕە چەندە باڵا بەرز بوویە، زۆر کەشخە بوویە ها. بێ شك لەنێو کیژەکانی قوتابخانە دا ئۆگری زۆرت هەن، وەنیە؟»

کیژەکان روانینە ئارمەن، دەستیان بە زاری گرت و ورد ورد پێدەکەنین. ئارمەن لەهەر سێکان زەق بۆوە و لەسەر ئەسکەملی نزیك پەنجەرە دانیشت. دایکی دامێنی کێشایە سەر ئەژنۆ و لێوی لەسەر یەك دانا. ئالیس لە نەینۆکی جێ گەردەوە روانیە خۆی. بە بۆنی گەردی "کۆتی" پێگژیم.

نینا روویدە من کرد. «ئێستا دیارییەکەی تۆ دەکەمەوە. بەستەیەکی چەندە مەزنە. شەرمەزارت کردم کلاریس.» بەستەکەی دانایە سەر مێزی بەردەم راحەتییەکان و قاقەزی بەستەبەندییەکەی دڕاند.

سەیری ریکۆردەرە مەزنەکەی سووچی ژوورەکەم کرد کە لە عەردی داندرابوو. چەند ئاڵقە نەواری گەورە بە گۆڕێ وەر ببوو. ویگێن گۆرانی دەچڕی، ئەی رەقیب، ئەی خەنیمی مـن - » ئێمەش چەشنی ئەم ریکۆردەردمانە لە ماڵدا هەبوو. ئالیس لەبن گوێم دا گوتی «دیتووتە؟ بەخیل خاتوون زووەکی چووە تای رێکۆردەکەی ئێوەی کڕیوە.»

نینا لە پاڵ مێز چۆکی دادا، قاقەزی بەستە بەندییەکەی چەمۆڵە کرد و دەمن راما. ئەم زەبتەت دیوە؟ هێشتا نەڕەخساوە مێزی ژێری بۆ بکڕم گارنیك بەڵێنی داوە شیعر و گۆرانیگەلێکی سووفی دەیانچڕی زەبتیان بکا. گوتم لە ئارتووش فێر بە کە هی دووانەکان زەبت دەکا. لە منداڵی تیگرانەوە جگە لە چەند وێنە کە ئەویش دەبێ بە هورك بین* چاویان لێبکەی هەتا بزانی چی بە چیوەیە، شتێکمان نیە. هەر نەبێ بیرەوەرییەکمان لە سووفی هەبێ.»

گوتم «تەنیا هیوادارم گارنیك وەك ئارتووش کۆکردنەوەی نەوارەکان و تۆز تەکاندنی دەزگاکە لە تۆ بار نەکا.»

نینا دایە پێکەنین. «بێخود. لە رۆژی هەوەڵەوە تێگەیوە کە ژنەکەی گوێی بەم کارانە دا نەچووە. ئەمن هەر دەزانم دەستوور بدەم. گوتم دەبێ هەر وەك زەبتەکەی کلاریس و ئارتووش بێ.»

کە روانیمە ئالیس چاوی لێم وەرگێڕا، جێ تۆزەکەی وا توند پێوە دا کە تەقفەی لێوەهات و ئالیس کە کەشەفی شەربەتی لەپێش راگرتبوو پێی گوت «ناخۆم. پارێزم هەیە. لە ئاهەنگ گەلی ئینگلیزی چیتان هەیە؟»

گارنیك سینی لەپێش دایکم راگرت و گوتییە ئالیس «نـات کیـنگ کـۆل» ت پێخۆشـە؟ کیژی پوورم نەوارەکەی لە تارانەوە هێناوە. ئەمشۆش پارێز بێ پارێز . ئـەتۆش وەك ئافرەتـە تارانییەکان فێرە ئۆین بوویە؟ ئافرەت دەبێ پەردە گۆشتێکی هەبێ.»

سەرو بنی قسەی دایکمی دووپات کردەوە، خاتوون وسکانیان ئەگەر درۆ دەکـەم بلّـێ درۆ دەکەی.» و قاقا پێکەنی.

یەکێ گوتی « ئەوە دیسان لە پشت سەری ئافرەتانی تارانی دە ئاخۆی.» هەموو چـاومان دە دەرگەی ژوورەوە بڕی.

بەژنی مام ناوەندی بوو. نە لەڕ بوو و نە گۆشتن، قژە بۆرەکانی هەتا سەر شانی دەهـات و چاوهەنگونی بوو. پێلاوی پانیـە بلّینـدی پشـت ئـاوەلاّی دەپێـدابوو و فانیلـە چـەرمووە بـێ قۆلّەکەی خالّگەلی سووری تێدابوو. گارنیك کەشەفەکەی دانایە سەر مێـز و هـەردوو دەسـتی لێك کردەوە. «ئەمـەش ویۆلێت، کیژە خالّە تارانییەکەی مـن.»

کیژە خالّە تارانییەکە هاتە پـێش، لەگـەڵ هـەمووان تەوقـەی کـرد و دووانـەکان بـە دەم کریاوەیی تێی رامابوون، ئەوانیشی راموسی. ئارمینە گوتی «ئێوە چەن دەلالن.*» ئارسینە گوتی «هەروەك راپۆنزێل.» ویۆلێت سەری کێشا دوواوە و پێکەنی. «راپۆنزێل ناناسـم، بـەلاّم بریا هەموو وەك تۆ بە مشوور بوونایە.»

نینا قاقەزی بەستەبەندییەکەی چەمۆلّە کرد. «هەموو دەزانن وەك مـانگ جـوان چـاك و دەلالی، تەنیا شووە نەزانەکەت تێنەگەیی. بزانە کلاریس چ دیارییەکی هێنـاوە.» و پەیکـەرە فەخفوورییەکەی لە قوتوو دەرێنا. «ئای ! چەن جوانە.»

ویۆلێت روو دە ئالیس و دایکم و پشت دە ئارتووش و ئارمەن داهاتەوە سەر مێز و دەستی بە پەیکەرەکە داهێنا. پشت دامێنەکەی کەمێ هەلّتلّیشا بوو. ئارتووش ئاوڕی لە لای پەنجەرە داوە. ئارمەن لەسەر ئەسکەملەکە ئەو تەنیشت ئەو تەنیشتی کرد. ئالیس دە ویۆلیت و دایکم رامابوو و بە پەلە شەربەتی دەخواردەوە.

گارنیك و ئـارتووش و وێولێـت لەگـەڵ مندالّـەکان چـوونە حەوشـەی پشـتەوە چـاو لـەو کەروێشکانە بکەن کە گارنیك ئەو رۆژە کڕیبوونی. دایکم لە تیگرانی کوڕەکەی نینای پرسی. «لە بەشەناوخۆیی زانستگا دەمێنێتەوە یا کرێگرتەیە؟»

نینا بەسەر ئەو لەیستۆکانە دا تێپەڕی کە بە گۆڕێ وەر ببوون و هات لە روو بـە روومـان دانیشت. «چەند حەوتوویەك لە بەشەناوخۆیی زانستگا بوو. پاشان هاتە نك پـووری گارنیـك.

واتە دایکی ئەم ویۆلێتە. ڕاستیەکەی پێم خۆش نەبوو زۆر ئۆگری خوێندکارەکان بێ. ئەم ڕۆژانە هەموو خوێندکارەکان سەریان لە گێچەڵ دەخورێ. ئێمەچی و سیاسەت چی؟ دەست بە کلاومان بگرین بانەیبا ئیدی ئەو پەڕێتی.»

دایکم داهاتەوە شتێکی لەسەر فەڕش ڕاکرد کە لەبەر وردبوونیەوە دیار نەبوو چ بوو دەتەپلەکی هاویشت. «بەڵێ. ئێمە چکارەی وڵاتین؟ هەزار جار ئەمەم بە خوالێخۆشبوو گوت بەڵام ـــــ »

ئالیس لاسای باوێشك هاتنی کردەوە و گوتی «ئای، دیسان دەستی پێکرد.» دایکم نقورچێکی لە باسکی گۆشتنی ئالیس داگرت. «دیسان دەستی پێکرد و دەرد و بەڵا. درۆ دەکەم؟» ئالیس چاوی لێم کرد و پێکەنی.

سووفی لە پشت پەنجەرەوە بێچووە کەروێشکێکی نیشاندا و نینا دەستی بۆ ڕاوەشاند. ویۆلێتی بەستەزمان چەند مانگ نابێ تەڵاق دراوە. شووەکەی شێتێك بوو هەر مەپرسە. ئەو کیژە فەقیرە هەقی ئەوەی نەبوو بە تەنێ هەتا سەری کۆڵان بچێ. ئیرەیی دەبرد و کێشەی دەنایەوە. هەیهات ئەگەر یەکێ لە شەقام یا لە میوانی چاوی لە ویۆلێت کردبا. دەیگوت بێ گومان شتێك هەر هەیە. دەیگوت بۆ چاویان لێکردی؟ سەگێکی هێندە جوانی چاوت لێدەکەن؟ بە کورتی وەگیانی هێنابوو. ئەو بەڵێنیانەی کە بەر لە زەماوەندیش دابووی بە جێی خۆی، گوتبووی خانووبەرە دەکڕم، زێڕ دەکڕم. دەتبەمە لەندن و پاریس. هەر یەکێك لەوانەی بەجێ نەگەیاند هیچ، خەریك بوو شێتی دەکرد. چاکی کرد خۆی تەڵاقدا. سەرەڕای ئەوانە دوای تەڵاقیش هەموو ڕۆژێ قسە و باسێکی تری دەیەنا گۆڕێ. تەلەفۆنی دەکرد، سەر ڕێگەی لەو کیژە ماڵوێرانە دەگرت. هەرچەند حەوتوو لەمەو بەر لە شەقامی نادری، ڕاست لەبەردەم پیراشکی خوسرەوی بەری بەو کیژە فەقیرە گرت و ئابڕووی برد. هاتینە سەر ئەوە چەند مانگێ بێتە ئابادان هەتا ئەو شێت و شوورە دەستی لێ هەڵگرێ. نازانن کیژێکی چەندە باشە. خوابکا شووێکی چاکی دەسکەوێ.» دایکم زەق چاوی لە نینا کرد و ئالیس دە شەربە نیوە تەژی شەربەت ڕاماو. تەمام گرت یەکێ لەو ڕۆژانە پیراشکی بۆ منداڵان دروست بکەم.

ینا قتووی پەیکەرەی فەخفووری و قاقەزی بەستەبەندی خڕ کردەوە. چاوێکی لە دەرگەی ژوور کرد، بەرەو پێشەوە داهاتەوە و ویستی ئێمە بێینە پێش. دەنگی هێنا خوار و گوتی «هەر خۆمان بزانین، هێشتا ویۆلێت خۆشی نازانێ بەڵام ـــــ» ڕووی دە من کرد «ئەو

هولەندییەی کە لە تەلەفۆندا باسم لێکرد لەبیرتە؟ ئەگەر لەگەڵ ویۆلێت رێك کەویَ خراپ نیە. ئەوشۆ بانگێشتنم کردووە.»

هەستا راوەستا و پێکەنی. «پێم وایە بانهەڵبانی* بە کرێداوە. بەڵام باشە، لە روانگەی ئێمەوە زۆربەی بیانییەکان گێژ و حۆل دەنوێنن. ئەگەر لەگەڵ ویۆلێت زەماوەند بکا و لە ئێران برۆن فرە خاس دەبیَ. ویۆلێت بە دەردی ژیان لە ئێران ناچاریَ.» قوتووی بەتاڵ و قاقەزەکانی نایە بن هەنگڵی. «بچم ئەوانە توورِ هەڵدەم.»

کە لە ژووریَ دەرکەوت بە دایکمی گوت «ئەگەر زانیتان شێو چیم دروست کردووە؟ لۆبیا پلاو. دەیبینن؟ ئەو پەرِی کابانیمە. سەردەمی شووکردنم هاتووە، وەنییە؟ و قاقا پێکەنی. چاوم لە ئالیس کرد کە دەم و چاوی تێك نابوو. لە دڵی خۆمدا گوتم «دیسان باسی زەماوەند هاتە گۆڕیَ. ئەمشەو خوا هەر بۆخۆی فریامانکەویَ.»

هەر کە نینا لاقی لە دەرێنا، دایکم لە ژێر لێوەوە دەستی پێکرد «هەزار جار گوتوومە هاودەمی لەگەڵ ئەم ژن و مێردە دروست نییە. مخابن بۆ مسقاڵێك خولَق و خوو و نەجابەت. هەرچی لە زاری دێتە دەریَ لە لای منداڵان دەیدرکێنیَ. لە بابەت زەماوەند و تەڵاقەوە دەدویَ کە هەر دەڵێی یەکیَ جلی کرِیوە و چونکە پێی جوان نەبوو بردوویە وێیداوەتەوە. هەر لە خۆرِایی هاتین. لە هەوەڵەوە خەتای کلاریس بوو کە ــــ» تێگرِا بووم. «یارمەتی نینا بدەم مێزەکە برِازێنێتەوە.»

نینا لە چێشتخانە دا پرسی «تەنیای؟» رووانییە دەرگە و کە زانی دایکم و ئالیس لەویَ نین لە تریقەی پێکەنینی دا و سەبرۆکە گوتی «راستییەکەی ویۆلێتم لەگەڵ خۆم هێناوەتە ئابادان، چونکە ــــ» دیسان رووانییە دەرگە و هێدی تر گوتی «ئەوکی تیگران لای ویۆلێت گیری کردبوو.»

بە زاری کریاوە و چاوانی فرەوانەوە لە نینام رووانی و گوتم «چی؟»

سەر و سەکووتی تێگرانم هاتە بەرچاو.

لەرِو کەم دویَ و شەرمن بوو. چاویلکەی لە چاو دەکرد و بێ نێوبرِ دەرسی دەخوێند و هەمیشە قوتابی پلەی یەکەم بوو. نە دەچووە سینەما، نە دەچووە یانە و نە هاورِێی بوو. هەر بە کەرەستەگەلی کارەباوە خەریك بوو. دایکم گەلێك جار گوتبووی «سەیر نییە؟ لە دایك و باوکێکی بەو بێ سەرە و بەرەیە، کورِێکی ئاوا بە شەرم و حەیا.»

نینا دەیگوت « ئەوکاتە ویۆلێت تەلاق درا و زۆریاوە لای دایکی، تیگرانیش لە ماڵە پووری گارنیك بوو. کە چەند رۆژ تێپەڕی دیم نا، کوڕیژگە تەواو تێکەڵی کردووە. یا گوێی دەدایە ئاهەنگ گەلی ئەویندارانە یا چەشنی سەگ کە دەخاوەنی بڕوانی، لە سووچێك وەردەکەوت و لە ویۆلێت زەق دەبۆوە. نە ئەوەی پێت وابێ ویۆلێت خەمزە و نازی دەکرد یا بە جۆرێك خۆی دەنواند. بەستەزمانە هیچ کام لەو شتانەی نیە. خۆم ئافرەتم، کەریش نیم و تێدەگەم. نا. هیچ خەتای ویۆلێت نییە. کەشخەیی و جوانی تاوان نییە. چونکە رواڵەتی لەگەڵ ئافرەتانی تر تۆفیری هەیە خەڵك غەیبەتی دەکەن. هەر بۆیە گوتم ئەورووپا بە دەردی ئەو دەچارێ. لەو لا ئافرەتی قژ بۆری پێست چەرمووگ لە شەقامدا هەڵڕژاوە. لێم کۆڵیوەتەوە، هولەندی هێندەی نەماوە مەعمووریيەتی تەواو بێ. جارێ بزانین ئەمشەو چ دەکەین.» دەفری سالادی لە سەلاجە دەرێنا. بەڵکو بووینە هۆ و بنیاتنەری کاری خێر.» لە دڵەوە پێکەنی.

دووانەکان رایانکردە چێشتخانە. ئارمینە بە قینەوە گوتی «ئاپۆ گارنیك بۆ سووفی ــــ » ئارسینە لووتی هەڵقرچاند. «"هۆلاهۆپ*"ی بۆ سووفی کڕیوە.» ئەوجار بە دووان دەستیان پێکرد. «ئاپۆ گارنیك گوتی هۆلاهۆپ بۆ پشت هیچ خراپیش نییە.» «هەر هیچ خراپ نییە.» «منالێ هەموو هولاهوپیان هەیە.» «بۆ ئێمەش بکڕە.» «ئەتۆ خوا بکڕە.»

گارنیك لە ژووری میوانان قیژاندی. «خۆم دەیکڕم. جارێ وەرنە ئێرە. کەروێشکەکان بە میوانی هاتوون.» دووانەکان هاواریان کرد «ئەی گیان!» و «گیان گیان!» و رایانکردە دەرێ.

نینا قوڵێنەی میوەی دەسدایە. «نازانم کێ ئەم قسەیەی دە زاری خەڵکی ناوە کە هۆلاهۆپ دەبێتە هۆی پشت ئێشە. پێت وایە بیست و چوار سەعات یەك بین هۆلا هۆپ هەڵدەسووڕێنن؟ خەمت نەبێ، دوو سێ رۆژ کایەی پێدەکەن و تووڕیدەدەنە سووچێکی حەوشە. پێشدەستییەکان راکە بێنە.» و بەرەو ژووری میوانان وەڕێکەوت.

ویۆلێت لەسەر فەرش دانیشتبو و یەکێ لە منداڵان کەروێشکەکانی گرتبووە باوەش. دامێنە رەشە تەنگەکەی هەڵکشابوو و بەلەکە چەرموو و بێ گۆرەوییەکانی بە دەرەوە بوو. سووفی و دووانەکان هەر یەکەی کەروێشکێك لە باوەشدا لە دەوری دانیشتبوون. ئارمەن بێچووە کەروێشکەکەی ویۆلێتی دەلاواندەوە.

دایکم شەق و رەق لە شەربە بەتاڵەکانی شەربەت زەق ببۆوە. ئالیس تا رادەیێ پشتی دە دایکم کردبوو و لە دیواری رووت رامابوو. ئەو پێیەی کە دایبابووە سەر پێیەکەی دی لێکدا لێکدا دەهەژا. بە خۆمم گوت «دایکم و ئالیس شەڕیان بووە.» گارنیك لە بابەت شوێنی

کولێرە نوێیەکەی کە خەریکی دامەزراندنی بوو لەگەڵ ئارتووش راوێژی دەکرد. بەر لــە هــاتن گوتبوومە ئارتووش «باسی سیاسی دانامەزرێنی.»

لە رێکخستنی مێزی شێو دا یارمەتی نینام دەدا کە لە زەنگیاندا.

مێرە باڵا بەرزەکەی هولەندی بوو. بە قژی لێك و لووسی فرە کورتی لە رەنگی کـا. دەم و چاوە شڵەکەی سوور دەینواند. بێ گومان بە هۆی حەمامی هەتاوەوە بووە. لەگەڵ هەرکام لــە ئێمە تەنانەت منداڵەکاندا بە لەز تەوقــەی کــرد و گــوتی «ســەلام و عــەلێك. ئــەمن یــووپ هانسێنم. لە ناسیاریتان فرە خۆشحاڵم.»

ویوڵێت هەر بەو چەشنەی کە لە عەردی دانیشتبوو، دەســتە بــێ کەروێشــکەکەی کــەمێ هەڵێنا و گوتی «چاو کەروێشکێکی چەند کەشخەم هەیە.»

یووپ هانسێن بۆ ئەوە لەگەڵ ویوڵێت تەوقە بکا، تا رادەیێ چــۆکی لەســەر عــەری دادا. «فرە فرە جوانە کەروێشك.»

ویوڵێت تەنیا بزەی هاتێ. ئاخاوتنە بێ سەرە و بەرەکەی هولەندی نە پێ ســەیر بــوو، نــە پێکەنینی پێهات. قسەکەی نینام بیرهاتەوە کە گوتبــووی « کیــژە پوورەکــەی گارنیــك وەتــۆ دەچێ.» لام وابوو نینا لە سەریداوە. چووکترین وێچوونێکم لە نێوان خۆم و ئەو ئافرەتەدا بەدی نەدەکرد. نە لە رووالەتدا، نە لە ئاکار دا. هیچ پێم ناخۆش نەبوو برووسکەیەك شــێوەی ئــەوم دابا، هەم لە روالەتدا و هەم لە ئاکاردا.

یووپ هانسێن مەشرەف خۆش و دەم بەبزە بوو. داوای لە ئارتووش کرد بە مستر هانســێن بانگی نەکا و لەباتی ئینگلیزی، فارسی باخۆن «فرە ئۆگری فارسی ئاخوتنم.» لەســەر مێــزی شێو کاتێ تەبەقی لۆبیا پلاوی خولۆق کردە خوشکم، دایکم و ئالیس لە ســەرەتای شــەوەوە بــۆ یەکەمجار زەردە یان هاتێ.

ئالیس سوپاسی کرد و گوتی هەر سالاد دەخوا. یووپ بــرۆ بۆرەکــانی هەڵدایــەوە. «بــۆ؟ لۆبیا پلاوت پێخۆش نییە؟» ئالیس گوتی «بۆنا، بەلام ــــــ »

یووپ تەبەقی لۆبیا پلاوی دانایەوە سەر مێز و دەفری سالادی لــە پــێش ئــالیس راگــرت. «ها! بێشك پارێزتان هەیە.» ئەســکەملەکەی کێشــاوە دوواوە. بــە وردی دە ئــالیس رامــا و گوتی. «تۆ هیچ پێویستیت بە پارێز نییە. بە بڕوای من هەر ئاوا زۆر زۆر باشی.»

کە گەڕاینەوە ماڵ جلەکەم هاوێشتە سەر قەرەوێڵە، ئارتووش رایکرد و چەند جــار ئــەولاو ئەولای پێکردو گوتی «ئەگەر ئەمشۆ لەبەرتدا نەمدیبا وەمدەزانی هی دووانەکانە.»

جلەکەم لە دەستی ستاند و لەنێو دۆلابدا هەڵمواسی. تەوسم پێدامەدەن «بڵێ کزییەکەم لەڕادە بەدەرە.» لە پشت سەرمەوە گوتی « بە بڕوای من ئەتۆ هەر ئاوا زۆر زۆر باشی.» ئەوجار دایە پێکەنین. «لەو کاتە دا بە بریقەی چاوی خوشکت دەکرا بیست گلۆپی سەد ڤۆلت هەڵکەی.»

روو تەختییەکەی لای خۆمم وەلانا.«قەڵافەتی ویۆلێت جوان بوو، وەنا؟ ئارتووش روو تەختی لای خۆی وەلانا. «قەڵافەتی جوان بوو؟ سەرنجم پێنەدا.» دەستی کرد بە زەمزەمەی ئاهەنگی مۆنالیزای نات کینگ کۆل، گوتم بۆ وەی کە باسی سیاسیتان لەگەڵ گارنیك نەکرد سوپاست دەکەم.» خۆی ریچ کردەوە. «ئەمن هەرچی ئەتۆ بڵێی دەڵێم فرە فرە بە چاوان.»

هەوڵم دا بەرز پێنەکەنم و بیرم بۆ ئەوە چوو خەڵك بۆچی لایان وایە ئارتووش خووخدەی باش نییە؟ پرسیم «پێنجشەممە دێیە بۆنەی ٢٤ی ئەپڕێل؟» چاوەکانی لێك نا، باوێشکی هاتێ و گوتی «م م م ـــ » بە گومانم بە واتای «نا» بوو. چرای خەوم کوژاندەوە.

# ٢١

تەلاری کۆبوونەوەی قوتابخانە تەژی بوو، گەلێك تاجی گلایۆلی چەرموو کە بە نەوارگەلی پانی رەنگ رەش پێکەوە بەسترابوون. بە مەودایەکی دیاری کراو لەسەر دیوار ریز کرابوون. دایکم ورتاندیە سەر ئالیس «گوتم وەدرەنگ کەوتین. ئێستا ئەورۆ نەچووبایە ئارایشگەری دنیا خرا دەبوو؟»

نینام پێشانی دایکم دا کە لە ریزی دووهەمدا هێمای دەکردین کە جێگەی بۆ گرتووین. بە نێوان خەڵك و ئەسکەملەکاندا تێپەڕین، هەتا گەیشتینە نینا دە پازدە بیست جار گوتمان «ببوورن.» ئالیس هێشتا جێی خۆش نەکردبوو سەرێکی بە دەوری تالار داگێڕا و دەستی بە راپۆرت دانی ئەوە کرد کە ئەمە کەی هاتووە و کێ چی لەبەر کردووە. نینا ریزی بەرنامەی رێوڕەسمەکەی پێدام و پرسی «بۆ وەدرەنگ کەوتن؟» دایکم گوتی «ئالیس خاتوون چوو بووە ئارایشگەری.» بۆڵاندی «رۆژی تازییە و ئارایشگەری.» نینا دەگوێمدا چرپاندی «بەڵکو لە رۆژی تازییە دا بەختی بکرێتەوە. هیچ شتێك لە خوای دوور نییە» قاقای لێدا و چاوی بە دەور و بەریدا گێڕا. «ئەگەرچی جگە لە هێندێ پیر و پاتاڵ کەسێ نەهاتبوو. مندالەکانت بە

ئارتووش ئەسپارد؟ (نەیپرسی  ئارتووش بۆ نەهاتووە. هۆی نەهاتنی ئـارتووش پێویسـتی بـە روون کردنەوە نەبوو) گارنیك جەنەی گرتبوو سووفیش دەبێ بێ.» دەنگی بـۆڕ کـرد و لاسـای گارنیکی کردەوە. «منداڵ هەر لە ئێستاوە دەبێ بزانن نەتەوەکەیان چی بەسەر هاتووە. بـەڵام ئەم قوڵە فیتنەیە هەڵڵاو بگرێکی وای ساز کرد کە باوکی نەوی کێشا. بە بیـانووی ئـەوە کـە سووفی تەنیا نەمێنێتەوە ویۆلێتیشم نەیەنا. هاتبا چی کردبا؟ وەڕەز دەبوو. راستییەکەی ئەگەر گارنیك بەڕێوەبەری بەرنامە نەبووبا ئەمنیش نەدەهاتم. «باشە. دەنگوبـاس؟» تـا هـاتم بڵـێم «هیچ باس نییە.» لەگەڵ ئافرەتێکی کە لە ریزی پێشەوەی ئێمە دانیشتبوو و شووەکەی یەکەم قسەکەری بەرنامەکە بوو، بەریدایە سڵاو و چاك و خۆشی. ریزی بەرنامەم خوێندەوە.

نوتقی رۆبێرت ماداتیان سەبارەت بە کوشتاری ٢٤ی ئاوریل.

راپۆرتی ئەنجوومەنی کڵێسا و قوتابخانە لەمەڕ دروست کردنی بنیاتی بیرەوەری.

پشوودان.

بیرەوەرییەك لە خاتوون یەرمیان، شاهێدی ئەو رۆژە تاڵانەیە.

چراکانی تالار کووژایەوە و گارنیك چـوویە پشـت بڵێنـدگۆ، بـەخێرهاتنی کـرد و یەکـەم قسەکەری ناساند. ماداتیان دەستی بە قسان کرد. وەبیر ٢٤ی ئەپڕیل چەند سـاڵ لەمەوبـەر و باسە توندەکەی ئاڕتووش و ماداتیان کەوتمەوە. ئەگەر گارنیك نەبووایە کە بە گاڵتە و پێکەنین سەر و بنی مەبەستەکە وێك بخاتـەوە، کارەکـە خـراپتر دەبـوو. دوای ئـەو سـاڵە زۆرجـار بـە ئارتووشم گوتبوو «ئەم روژە چ پێوەندییەکی بە ناکۆکییە سیاسییەکانەوە هەیە؟ چی بە دەستە چەپی و دەستە راستی بوونەوە هەیە؟ ئەم گشتە خەڵکە کوژراوە. ئەرمەنیش نـەبی دەبـێ بـە داخ بی و لە رێوڕەسمەکەدا بەشدار بی» و ئارتووش هەموو جارێ وەڵامـی دابـۆوە «بـەداخم و بەشداری ناکەم.»

گوێم بە قسەکان دەدا و نەدەدا. هەموو ساڵێ  هەر ئەو قسـانەم دەبیسـت: بـڕێ ژمـارە، هێندێ دروشم و هیچی تر. نینا چەند جار چاوی لـەمن کـرد و بـە چـاوان هێمـای خـاتوون، ماداتیانی کرد و تلی خستە سەر لێوی. یانی ناچارە بێدەنگ بێ چونکە بێشك ژنە وێیدەکەوێ یەکێك لە نێوان ئاخاوتنی شووەکەیدا قسە بکا. خاتوون ماداتیان چەند جـار رووانییـە پشـت سەری خۆی کە بێ گومان نەیاندەزانی قسەکەر شـووی ئـەوە و دەبـێ بێـدەنگ بـن. هـەموو پچەپچیانبوو و بە هۆی  قاقەزی ریزی بەرنامەکـەوە خۆیـان باوەشـێن دەکـرد. منـیش خـۆم باوەشێن کرد و هەوڵم دا بیرم بێتەوە بەیانی شەربەتی "هالی بۆرانژ"م  دا بە دووانەکان یا نا؟

وەبیرم هاتەوە پێم داون، چونکە بۆڵەیان دەهات کە «ئەدی ئارمەن چی؟» «ئەدی ئێمە دەبێ هەتا کەی شەربەت بخۆین؟» «ئەگەر ئێمە دەخۆین تا سەرمامان وێنەکەوێ ئەدی ئارمەن چی؟»

ئاغای ماداتیان بە جۆش و خرۆشەوە نووسراوەکەی دەستی رادەوەشاند و دوای چەند رستەی دوور و درێژ کۆتایی بە قسەکانی هێنا. ئەمنیش هاوڕێی هەموو خەڵکەکە چەپڵەم لێدا. لە بەشدارانی دەور و بەر چەند کەسێ پیرۆزباییان لە خاتوون ماداتیان کرد و خاتوون ماداتیان دەتگوت بۆخۆی نوتقی کردووە بزەی هاتێ و سوپاسی کرد و هەرکە چاوی بە من کەوت رووی دەولای کرد.

دایکم لەگەڵ ژنیك سلاو و چاك و خۆشی دەکرد کە دوو ریز لە دوای ئێمەوە بوو. ئالیس بە پێش دایکم دا داهاتەوە لای من «بە گومانی تۆ کێ هاتووە؟ خاتوون نوورولڵاهی لەو سەری تالار دانیشتووە.» هەتا ویستم سەرم وەرسووڕێنم گارنیك هاتە سەر شانۆ و دەستی بە خوێندنەوەی راپۆرتی چێکردنی بنیاتی بیرەوەری کرد. جارێکی کە لەبەر بەدفەڕییەکانی ئارمەن بانگ کرابوومە قوتابخانە، وازگێن هایراپتیان پرۆسەی بەنای بیرەوەریەکەی پێشانم دابوو. چوار گۆشەیەکی مەزن بوو لە بەردی کەوگ*. لایەکی کاردۆژەی* ئافرەتێك بوو کە منداڵێکی لەسەر هەر دوو دەست راگرتبوو و لایەکەی تر مێژووی رەشەکوژی. گارنیك گوتی بنیاتەکە ئەوە خەریکە تەواو دەبێ و ساڵی داهاتوو لە حەوشەی قوتابخانە، لەبەر دەم دەرگەی کلێسا دا دایدەمەزرێنن. پاشان سوپاسی بەشدارانی کرد کە یارمەتی ئەنبووژەنی* و واتاییان داوە و پازدە چرکە ساتی پشوودان راگەیاند.

دایکم گوتی لەنێو تالار دا دەمێنێتەوە تا لەگەڵ دۆستی ریزی پشتەوەی دمەتەقێ بکا. نینا گوتی دەچێتە پشت شانۆ تا بزانێ گارنیك چ دەکا و ئالیسیشی لەگەڵ خۆی برد. بەرە و لای یەکێ لە چەند دەرگاکانی تالار چووم کە بەرەو حەوشەی قوتابخانە دەکراوە. لەبەر دەرگە خۆم دا قەراخێ و رێگەم بۆ پیاوێك کردەوە کە چەند بابۆڵە و پێپسی بە دەستەوە بوو. لە سووچێکی حەوشە، لە دەور و بەری بووفە دا هەرا و هوریا بوو. لەگەڵ چەند ناسیاو سلاو و چاك و خۆشیم کرد و مانیام دی کە بۆ لام دەهات، وەك هەمیشە پەشۆکاو و ترس و دڵە خورپەی بوو و یاخەی فانیلە رەشەکەی خوار ببۆوە. سلاوم کرد و یاخەیم راست کردەوە و گوتم «تاجە گوڵینە و نەوارەکان فرە کەشخەن ، بێ گومان بیرەکە هی خۆت بووە.»

قژە چەتر ئاساکەی لە تەوێڵە ئارەقاوییەکەی لادا. «قوڵ بەندی کوڕی چاودێرت دیوە؟»

دیارە کە دیبووم. شەوی پێشتر ئارمەن تەلەفۆنی بردە ژووری خۆی و دەرگەی گاڵە دا و نێو کات ژمێر قسەی کرد. پاشان هاتە چێشتخانە و بە من و دایکم کە خەریکی سەوزە پاکردن بووین گوت کە لێبڕاوە لە ڕێورەسمی سبەیدا یەکێ لە ئەندامانی کۆڕی چاودێری بێ و خاتوون مانیا گوتوویە بۆ ئەوەی ببێ بە ئەندامی کۆڕی چاودێری دەبێ قۆڵبەندی ڕەش لێبدا. هەتا ئەوەی ورتاندمە سەری کە « دیسان هێشتتەوە ئاخری؟ بەو نیوە شەوە پارچەی ڕەشت لە کوێ بۆ پەیدا بکەم؟» دایە گەورە گەییە فریای نەوەکەی. ئەو شتەی کە دەنێو سندووقە تاق و جووتەکانی دایکم دا کەم نەبوو پارچەی ڕەش بوو. بە مانیام گوت «هەمووشت تەواوە. ماندوو نەبی. بەرنامەی دوایەش بێشك جێژنی کۆتایی ساڵی منداڵانە.»

سلاوی یەکێکی وەرگرتەوە و گەڕاوە لای من. «ئا. جێژنی کۆتایی ساڵ لە حەوشەدا بەڕێوە دەبەین. ئەوە خەریکی ڕێکخستنی گۆڕەپانی شانۆین.» بنەبانی حەوشەی پێشاندا کە پڕ لە خشتە و دار و تەختە بوو. پاشان دەستی نایە سەر شانم کە بە بەژنی کورتی مانیا و شانی بڵیندی من کارێکی سانا نەبوو. «مەشقەکەمان لە سبە و دووسبەی را دەس پێدەکەین.» دەستی کێشایە سەر باسکم. «فیکرێکی تازەم بۆ دووانەکان کردۆتەوە. وازگێن شیعرێکی جوانی دۆزیوەتەوە لە - لەبیرم نەماوە هی کێیە. ناوی شیعرەکە چوار وەرزە. بیرم بۆ ئەوە چوو چەند خۆش دەبێ دووانەکان نێو بە نێو ببنە چوار وەرز و شیعرەکە بخوێننەوە. ئارمینە بەهار و پایز و ئارسینە هاوین و زستان. بەم چەشنە دەرفەتیان دەبێ بچنە پشت شانۆ و جلیان بگۆڕن و جلەکان ـــــ »

لەبەردەم یەکێ لە دەرگەکانی تالار چاوم بە ئارمەن کەوت کە لەگەڵ ئێمیلی و دوو کوڕە دەبیرستانی قسەی دەکرد. شاڵواری سورمەیی و کراسی چەرمووی لەبەر دابوو کە وە مێریکی گەنج دەچوو نەك کوڕەکەی من. پێم وابوو ئێمیلی لەگەڵ باوکی هاتووە؟ نەکا ئالیس ئێمیل سیمۆنیان ببینێ. گوتم «و بێ گومان ئەمن دەبێ جلەکان بدروم.»

دەستی لەسەر باسکم لابرد، بە بەر دەمی گرت و پێکەنی. «ئا. هەر لەمەڕ ئەمە بە شوێنت دا دەگەڕام. دژوار نییە. چوار جلی سانای درێژ بە فەقیانەی* فرەوانەوە. تەنیا ڕەنگەکان لەگەڵ یەك جیاواز بن. بۆ وێنە بەهار چێرەیی، هاوین سەوز، پایز نارنجی و زستان چەرموو.»

لەو بەری حەوشە را ئێمیل سیمۆنیانم دی کە لەگەڵ قەشەی کلێسا و ژنەکەی دەئاخۆت. دیسان لە دڵی خۆمدا گوتم «خۆزیا ئالیس لەو لایانە پەیدا نەبوایە.» پاشان بیرم کەوتەوە کە

به خۆشییەوە یەکتر ناناسن. بە مانیام گوت «بێ جێ نییە شت گەلێك لەسەر جلەکان بدرووین کە دیاردەری وەرزەکان بێ. بۆ وێنە گوڵ بۆ بەهار، چڵەگەنم بۆ پایز.» دەرزیلەی سەری ئێمیلی کەوتە خوار. ئارمەن زووتر لە دوو کوڕەکەی دی داهاتەوە دەرزیلەکەی هەڵگرتەوە. ئێمیل سیمۆنیانم لەنێو حەشیمەتەکە دا ون کرد.

مانیا گوتی «چ بیرێکی نوێ. ئەرێ وازگێن وەرگێڕانی لۆرد فۆنتێلرۆی بچکۆلەی خەلاس کردووە و ــــ»

قسەکەی بڕی و دە پشت سەرم راما. بەم زەردەخەنە سووکەوە لەچی رادەما؟

هەرکە سەرم وەرسووڕاند ئێمیل سیمۆنیان چاوی لەسەر مانیا دزیەوە و سڵاوی لێم کرد. هەردوویان بە چاوەنواڕییەوە لێم رامان. بە یەکتریم ناساندن و دەستیان وە دەستی یەکتر دا. مانیا کە پێسیری فانیلەکەییم لێك و لووس کردبوو دیسان دەستی پێداهێنا. گوتم «باسی وەرگێڕانەکەی ــــ»

وەك ئەوە لە خەو رابووبێ گوتی «چی؟ ئەها. وەرگێڕانی کتێبەکە خەلاس بووە. بە منداڵەکاندا بۆتی رێدەکەم. تکایە زوویەکی وەیخوێنەو بینێرەوە لە بەر داین تا بەر لە جێژنی کۆتایی ساڵ چاپی بکەین.»

ئێمیل سیمۆنیان گوتی «گۆیا ئێوە بەرنامەکەتان بەڕێوە برد. پیرۆز بێ. فرە خاس بوو.»

مانیا سوورهەڵگەڕا و یەکێ لە ئەندامانی چاوەدێری بانگی لێکرد، گوتی «هاتم.» پاشان لەگەڵ سیمۆنیان تەوقەی کرد و گوتی «لە ناسیاوی لەگەڵ ئێوە فرە خۆشحاڵ بووم.» و رۆیی. ئەمن پێم وابوو یا هەر بەڕاستی دەستیان زۆر لەنێو دەستی یەکتردا مایەوە؟

روانیمە دەوروبەرم. بە خۆشییەوە هەواڵێك لە دایکم و ئالیس لە ئارادانەبوو. ئێمیل سیمۆنیان چاکەت و شاڵوارێکی چەرمووی خەتخەتی باریکی شینی لەبەر کردبوو و بۆینباخێکی رەشی لێدابوو.

چاوی لە ئاپۆرەی دەوروبەر بوو کە قسەیان دەکرد و جگەرەیان دەکێشا و بابۆڵە و ساردی یان دەخواردەوە. گوتی دایکی نەهاتووە و خۆشی بۆ ئەوە هاتووە کە ئێمیلی تەنیا نەبێ کە دیارە برێکیش بە هۆی ورد ئاژنیەوە. *«پێم خۆشە لەگەڵ هەرمەنیەکانی ئابادان ناسیاویم بێ.» ئەوجار رووی دەمن کرد. «ئەگەر گشت خاتوونەکانی ئێرە وەك تۆ و خاتوون مانیا بن، ئابادان شوێنێکی ناخۆش نییە.» بە گاڵتەی خۆی پێکەنی، «بەڵام خۆمانین، رێوڕەسمەکە مرۆڤی ماندوو دەکرد.» گوتی گەرەکیە بەرەو ماڵ بێتەوە و دووایە بە شوێن ئێمیلی دا بێ. بە

ڕۆیشتنەکەی خۆشحاڵ بووم و بۆ ئەوە نەکوو بگەڕێتەوە و چاوی بە ئالیس بکەوێ جەختم کرد ئێمە ئێمیلی دەبەینەوە.» سوپاس و ماڵاوایی کرد و ڕۆیی.

بە نێو ئاپۆرەکە دا گەڕام بەڵکو خاتوون نووروڵلایی بدۆزمەوە. نەمدۆزییەوە و زۆریامەوە تالار. بەشقەم ئالیس هەڵەی کردبێ. خاتوون نورووڵلایی بۆ دەبا هاتبا؟ نە هەرمەنی دەزانی نە ٢٤ ی ئەپڕیل بەرنامەیەکی خاس بوو.

جەماوەر وردە وردە دەگەڕانەوە تالار. دایکم لەگەڵ دۆستە جولفاییەکەی ئاخۆتبوو و حاڵی خاس بوو. نینا و خاتوون ماداتیان بۆ شێو وادەی میوانییان دادەنا و تا هاتم دانیشتم ئالیس گوتی «شووشانیك و ژانت چ گاو گەردونێکیان* کردووە. خاتوونە ئازیزەکان گشتیان جلی نوێیان پۆشبوو، ئێستا دامانںا ڕەش.» شووشانیك و ژانت دوو بەرگ درووی ناسراوی ئابادان بوون.

گارنیك چۆ پشت بڵیندگۆ و چاوەڕێی بێدەنگ بوونی جەماوەر مایەوە. پاشان بە تەرزێك کە شێوەی ئاخاوتنە خۆش و پێکەنین ئاساکەی جارانی نەدەدا خاتوون یەرمیانی ناساند کە خەڵکی شاری وان و دانیشتووی تاران بوو. چەند ڕۆژێك میوانی خۆشەویستی ئێمە لە ئابادان و شاهێدی ئەو روژە تالانە بووە. دەستی بۆ لای پشت شانۆ ڕاداشت. هەموو چاومان دەوێ بڕی. یەکێ لە کوڕەکانی چاوەدێر ئەسکەملێکی دەسکداری هێنا داینایە پشت بڵیندگۆ، ئافرەتێکی بە ساڵاچوو خۆی بە باسکی یەکی دیکە لە کوڕەکانی چاوەدێر هەڵواسیبوو بە هەنگاوی کورتەوە هاتە سەر شانۆ. وردبین و لەڕ بوو. دامێنێکی ڕەشی لەبەردابوو. کە هەتا سەر گۆزینگی داکشابووە خوار و شاڵێکی ڕەشی گەورەی بەسەر قژە چەرمووگەکانیدا دابوو. بە یارمەتی کوڕەکان دانیشتە سەر ئەسکەمل و گارنیك بڵیندگۆکەی بۆ نەوی کرد. ئافرەتەکە دەستە ئێسکنەکەی دانایە سەر سەری کوڕەکان و لە ژێر لێوە وە شتێکی گوت کە بە من دوعای خێر بوو.

هەموو بە بێدەنگی چاومان تێ بڕی کە ماوەیێك چاوی لە ئێمە کرد و ئەوجار بە دەنگێکی ماندوو دەستی بە قسە کرد. زاراوەی هەرمەنییەکانی شاری وان بوو کە بە "کەمێك" یان دەگوت "کەمی یەك" و بە "خۆش"یان دەگوت "نەمەکین." گوتی دەیەوێ بەر لەوەی باسی ئەو ڕۆژانەی وانفسا بکا "کەمی یەك" لەو ڕۆژە "نەمەکین (خۆشانە) بدوێ. گوتی گەرەکیە لەگەڵمان بەرەو ڕۆژانی ڕابردوو بگەڕێتەوە.

لەمەڕ ماڵەکەیانەوە لە شاری وان دوا کە دوو دارە هەنار و چەند دارە زەیتوونیان لە حەوشە دا بوو. قوژبنی حەوشە تەندوورێکی لێ بوو کە دایکم نانی لەواشی تێدا دەکرد و لە باغچە چکۆڵەکە دا گوڵی هەمیشە بەهاریان دەچاند. باسی باوکی کرد کە ئێوارانە لە دووکانی کووتاڵفروشی، بە بازاڕی واندا دەگەڕاوە و پاکەتگەلی میوەی لەگەڵ خۆی دەهێنایەوە ماڵ. جار و بارە پاشماوەی تۆپە کووتاڵەکانی بۆ خاتوون و خوشکی دەیەنایەوە و دایکم بۆ کیژەکان بووکڵەی پارچەیی چا دەکرد. براگەورەم بە رەژی دەموچاوی بۆ بووکڵەکان دەکێشایەوە. برا گەورە لەسەر هەر شتێکی دەستی کەوتبایە وێنەگەری دەکرد. رۆژانی یەکشەممە خاتوون هاوڕێی خوشك وبرا و دایك و باوکم دەچوویە کلێسای شار کە لە شەقامێکی پان و پڕ هەڵکەوتبوو بەریزە داری بی و پەڵکەوە.* کیژەکان بووکڵە پارچەییەکانیان دەبن هەنگڵی دەناو دەستیان دەخستە نێودەستی دایکم و دەڕۆیشتن و لەنێوان دارە بی و پەڵکەکانەوە کڵاوە سوورەکەی پیاوەکانیان دەژمارد کە هێندێ جار دەوێستان و لەگەڵ باوکم چاك و خۆشیان دەکرد. باوکم دەیگوت «مشتەری دێرینەی دووکانن. بەویژدان و لە خواترس.» رۆژانی هەینی دەنگی بانگ لە مزگەوتەکانەوە بەرز دەبۆوە. جینارەکان کە لە نوێژی جەماعەت دەزۆڕیانەوە، باوکم دەیگوت «خواپەرستیتان قەبووڵ.» دایکم ئاشی بە ماستی لێدەنا دە قاپی گڵی دەکرد و بۆ جینارەکانی دەنارد، سەری ئاشەکەی بە گەڵای گوڵی هەمیشە بەهار دەڕازاندەوە. جینارەکان لە وەڵامدا پاقڵاوەیان دەنارد.

خاتوون ماداتیان دەسماڵێکی رەشی لە جانتا بریقەدارەکەی دەرێنا. لە ژووری تالار داکەس خۆی باوەشێن نەدەکرد.

خاتوون یەرمیان ماوەیێ بێدەنگ ما، سەری بەرداوە و هەردوو سەری شاڵەکەی لە دەوری دەستی هاڵاند. «پاشان رۆژانی رەش سەریان هەڵدا، رۆژێ داهات کە باوکم لە هەمیشە زووتر گەڕایەوە ماڵ دەس بەتاڵ و شێواو. بە دایکمی گوت هەرمەنییەکان دووکانەکانیان داخستووە. عەسکەرەکان چەند دووکانی کریاوەیان سووتاندووە. تا برنج و گەنمی دووکانێکی تریان تاڵان کردووە. باوکم گوتی دەبێ بڕۆین. دایکم دەم و چاوی رنی کە "ماڵمان بە قوڕ گیرا."»

خاتوون کپ بوو. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، چەندجار بە دەس لە ئەژنۆیدا و بەژن و باڵا لەڕ و لاوازەکەی بەراست و چۆپدا لەرییەوە. ئەوجار سەری راوەشاند و گوتی«ماڵوێران بووین.»

هاتم کیفەکەم بکەمەوە کە ئالیس بەستەیەکی چکۆلەی دەسماڵ قاقەزی بۆلام راداشت. دەسماڵێکم راکرد و بەستەکەم بۆ لای نینا درێژ کرد. دایکم سەری رادەوشاند و لە ژێر لێویەوە دەیگوت «وەی لە دەس ئەم رۆژگارە زاڵمە.»

لە ژووری تالار دا تەنیا دەنگی هەناسەگەلی بڵێند و کورت و دەنگی ماندووی خاتوون دەهات. «دەرگەی ماڵ لەسەر گازەرەی پشتێ بوو. دایکم دەگریاو بوخچەو سندووقی پڕ دەکرد و گاڵەیدەدا. باوکم هاواری دەکرد «جێ نییە، ئافرەت. واز لەم شڕە بڕەیە بێنە. وەختی ئەوە نییە دەس ببزێوە. دایکم دەگریا. «بڕێ سەبر گرە. هەر بڕێ». بووکڵە پارچەییەکان لەبن هەنگل دا لەگەڵ خوشکم بە پەشۆکاوی لە ژێر دار هەنارەکاندا وێستا بووین. برام جوونی دەدا، هەمیشە بەهارەکانی باغچەی پێشێل دەکرد و لە بابەت تۆڵەوە دەدوا. سوار عارەبانە بووین، لەسەر بوخچە و سندووقەکان دانیشتین و وەڕێکەوتین. شەقامەکان تەژی لە عارەبانەگەلی تر بوون، داشقە، ئەسپ، هێستر و هەر چییەکی کە دەبوو مرۆڤ یا بوخچەیەکی لێ بار بکەی. قیامەتێك بوو لە گڵ و تووك و نزا. بووکڵە پارچەییەکان ون بوون و من و خوشکم گریاین. لەپێشدا بۆ بووکڵەکان، دوایە بۆ باوکم ، بۆ دایکم، بۆ برا و یەکدی.»

بەستە دەسماڵ قاقەزیەکەی ئەودەس ئەودەس پێکرد و بەتاڵ بوو.

شەو لە ژووری دانیشتن دا پێیەکانم دانایە سەر مێزی پێش راحەتی و سەرم وە پاڵپشتەکە کرد. قژم لە دەوری تلم هاڵاند و دە وێنەگەرییەکانی سەرووی تەلەویزێون رامام. ئاو رەنگێك بوو لە کلێسای ئێجمی ئازین لە ئەرمەنستان. لەبیرم نییە لە کێ بیستبووم کە کلێسای ئابادانیان هەر لە شێوەی ئەم کلێسایە دروست کردووە. نەمزانی بۆچی هەر کە ئێمیلی هات مانیا خۆی لێ ون بوو؟ زۆرباش بوو کە ئالیس ئێمیلی نەدی و بۆ بە منی گوت بەرنامەکە ماندوو کەرەوەیە و گوتیە مانیا خۆشە؟ بە دەم روانینی وێنەگەریەکەوە گوتم «خاتوونی بەستەزمان.»

ئارتووش لە پشت رۆژنامەوە گوتی «چی؟»

گوتم « خاتوونی بەستەزمان ، دایکی ، باوکی، گشتی ئەو مرۆڤانە. دەبووایە بهاتبای.»
رۆژنامە هەڵدرایەوە.

چاوم لە ئێجمی ئازین دەکرد «ئەم گشتە مرۆڤە، ئەو هەموو ساڵە بە شایی و خۆشی لەگەڵ یەکدی دەژیان. چی روویدا؟ چی بوو؟ خەتای کێ بوو.» قژم لوول دەدا «ئێمەش کە

جگە لە ڕێز دانانێکی وشك و سەرەکی و بەڕێوە بردنی بۆنەی بیرئانین کارێکمان لە دەس نایە. دەبووایە بهاتبای.» ڕۆژنامە هەڵدرایەوە.

گوتم « بە گومانی تۆ چ کەسێ هاتبوو؟ خاتوون نووروڵڵایی. ئالیس دیتی. ڕەنگبێ سەهووشی کردبێ.»

ڕۆژنامەی نوشتاندەوە، دەستی دەرادێنی وەردا و پێکەنی. «کەوابوو هەرهات؟ ڕۆژ و کاتی بەرنامەکەی لێم پرسی. کە دیتی نازانم بە شوێن هەرمەنییەکانی تر داچوو. ئەمن چراکان بکووژێنمەوە یان ئەتو؟»

گوتم «بۆچی ڕۆژ و کاتەکەت نەدەزانی؟ بۆچی بۆت گرینگ نییە؟ بۆ نەهاتی؟»

ئارتووش وێستا، دەستی بە ردێنی داهێناو ڕوانیە وێنەگەری ئێجمی ئازین. پاشان گوتی «دەزانی "شەتیت" لە کام شوێنە؟» کە وەڵامیم نەدایەوە دەستی خستە گیرفانی شالواری و بەرەو پەنجەرە چوو. چەند ساتێ دە حەوشە ڕاما. ئەوجار وەرسووڕا. نووکی پێڵاوەکەی بە دەوری یەکێ لە گوڵەکانی فەرش دا هێنا. «دوور نییە. لە بنا گوێمان . چوار کیلۆمێتری ئابادان.» دیسان ڕوانیەوە حەوشە. «گەرەکت بوو دەتبەم بیبینی. لە ماداتیان و ژنەکەی و نینا و گارنیکیش بگێڕەوە.» زۆریا و چاوی لێکردم. ژن و مێرد و منداڵ و گامێش و بزن و مەڕ گشتیان دە کەپرێکیدا دەژین.» دەستی لە گیرفانی دەرخست و بەندی کات ژمێرەکەی کردەوە. « دەبێ بە ڕۆژ بچین، چونکە شەتیت کارەبای نییە. لەبیرت بێ ئاویش ببەین، چونکە بۆری ئاویشی نییە.» کات ژمێرەکەی قورمیش کرد. «دەبێ وریا بین لەگەڵ کەس تەوقە نەکەین و منداڵەکان نەلاوێنینەوە، چونکە یا سیل دەگرین تا تەڕەخوم.» بەرەو دەرگەی ژوورەکە چوو. «بە خاتوون ماداتیان بڵێ شەکەراتی ئینگلیزی بۆ منداڵان نەیەنێ، چونکە باوەڕ ناکەم منداڵانی شەتیت بە عومری خۆیان شەگەڵاتیان دیبێ. بە گارینکیش بڵێ پێڵاوی ئیتالیایی دەپێ نەکا کە قوڕ و پەین لە گوێزینگانە.»

لە ئێجمی ئازین زەق ببوومەوە. ئارتووش لەبەر دەرگەی ژوور گەڕاوە. هات لە هەمبەرم وێستا و لە دەموچاوم ورد بووە. «کارەسات هەموو ڕۆژێ دەقەومێ. نەك هەر پەنجا ساڵ لەمەوبەر، بەڵکو هەر ئێستا. نە فرە دوور، هەر ئەلیرە، نك دڵی ئابادانی سەوز و ئەمن و کەشخە و بابی ڕۆژ.» کات ژمێرەکەی دە دەستی کردەوە. گوتی «سەرە ڕای ئەوە هەق بەتۆیە. خاتوونی بەستەزمان. ئەم هەموو خەڵکە بەستەزمانە.» و لە ژوورەکە وەدەرکەوت.

# ٢٢

بۆ بەر شێوی منداڵان خەریکی دروست کردنی "چومبوور" بووم. تێکوشینی نانی وشـك، پەنیر و ناوکی گوێزی وردکراویشی لەسەر، دەنگی تۆرمزی دوور و درێژی پاس لـە شـەقامەوە بەرز بۆوە.

بە دەم چاوەنوارِی بیستنی دەنگی راکردن، دەستم بە بەرەڵبێنەمدا هێنا. کە دیم چ باسـی نییە چوومە دالان و دەرگەی ماڵێم کردەوە. گەیبوونە جەرگەی رێگە بەرتەسـکەکە. ئارسـینە سەری داختبوو دەگریا. ئارمینە کیفی هەردووی بە دەستێکەوە گرتبوو و دەیە نـا. دەسـتی دیکەی لەسەر شانی خوشکی بوو و لەبن گوێیدا سرتە سرتی بوو. هەواڵێك لە ئارمەن نەبوو.

بە دڵەخورپێ رامکردە پێش. «چ بووە؟ وەعەردی کەوتی؟ لەگـەڵ کەسـێ شـەڕت بـووە؟ نەخۆش بووی؟

بە گورِتر گریا و بە دەم هەنیسکەوە، نێوە نێوە گوتی "کوێی خەتای من بوو؟ خـۆ ئـەمن قسەیەکم نەکرد. منداڵەکانی قوتابخانە گوتیان. منداڵ پێکەنین.» بە هـۆی گریـانی لـە گـورِ کۆخەی هاتێ.

ئارمینە بێ نێو برِ دەیگوت «هەق بە ئارسینەیە، هەق بە ئارسینەیە.»

دەست و چاوی ئارسینەم شورد، دامنایە سەر ئەسکەملی چێشتخانە، چـەند قومـە ئـاوم دایە و گوتم «جا بڵێ بزانم چ بووە؟»

دە یەکتر رامان. ئارسینە سەری داخست و کایەی بە تلـەکانی دەکـرد. ئارمینـە لـەناکاو چەناگەی بەرز کردەوە و چەند هەنگاو کشاوە دوواوە، دەستی دەنێو قـەدی نـاو لـە جەرگـەی چێشتخانە دا وێستا و گوتی «تا ئێستا لەمەڕ ئارمەنەوە بێدەنگ بووینە و چیمان نەگوتووە. لەباتی سوپاس، ئەورۆ لە پاسدا و لەبەر چاوی هەموو منداڵەکان خێواندیە بناگوێی ئارسینە. کاتی ئەوە هاتووە هەموو شتێکت بۆ بگێڕمەوە.» و گێڕایـەوە کـە ئارمـەن ئاشـقی ئێمیلـی بووە. ئێمیلی هەمیشە ئارمەن ئازار دەدا. لە قوتابخانە لەبەر چاوی ئارمەن گاڵتە بە کورِەکان دەکا، گاڵتە دەکا و پێدەکەنێ. ئیمرۆ یەکێك لە سـەرووی کورسـیەکانی پاسـدا بـە خـەتێکی درشت نووسیبووی "ئارمەن ئاشقی ئێمیلـی، ئێمیلـی ئاشـقی کـەس". منـداڵانی قوتابخانـە پێکەنین و ئارمەن لەگەڵ ئارِمینە و ئارِسینە شەرِی کردووە و گوتوویـە «ئێـوە نووسـیوتانە.»

خێواندیە بناگوێی ئارسینە. ئارمینە پشوویەکی لە ناخەوە کێشا و درێژەی پێدا «ئەو شەوەش ئارمەن بۆیە لە ماڵە ئێمیلی کۆخەی هاتیٚ کە __»

ئارسینە قیژاندی «مەیلێ.»

ئارمینە گوتی "بۆ نەیلێم؟ چاکیش بلێ. ئارمەن ئەو شەوە بۆیە کۆخەی هاتیٚ کە لەکاتی کایە کردن بە دەسکەلە ئێمیلی دەستووریدا شەربەیەك سرکە فڕ بکا، سەرەڕای ئەمە بە رادەیەکی زۆر لەو چاتنییەی کە دایە گەورە دروستی کردبوو دە شەربەی کرد.»

لەسەر ئەسکەمل دانیشتم.

لە گومانی فڕ کردنی شەربەی سرکە ئەویش لەگەڵ ئەو چاتنیە ترسناکە گەرووم سۆژاوە. دووانەکان تێم رامان. قژی کرژم لە ژێر دەرزیلە هاورەنگەکان دا خۆی دەنواند، کولمە گۆشتنەکان گەشاوە بوون و بە پەرۆش. چاوەڕوانی دژ کردەوەی من بوون.

خەریك بوو چ رووداوێك بقەومیٚ؟ هۆشم لە کویٚ بوو، بۆ نەمزانیبوو؟ دەستێکم بە نێو چاوانە ئارەقاوییەکەمدا هێنا و پرسیم «ئارمەن ئێستا لە کوێیە؟» بە یەکەوە شانیان هەڵتەکاند و هەردوو بە قینەوە تێم رامان.

چاوم لە گوڵە نۆکەکان کرد کە بە دەم باوە دەشنانەوە. دەمەو رۆژاوا بوو کە نسیٚ کەوتبووە سەر قەڕنیز، زەردەواڵەیەك لەسەر یەکێك لە گوڵەکان وزە وزی بوو.

چاوی ئارسینە هێشتا هەر سوور بوو و ئارمینە لە کیفەکەی قوتابخانەیدا بە دوای شتێدا دەگەڕا. دەفتەرچە و کتێبێکی دەرێنا و بۆ لای منی راداشت. «خاتوون مانیا پێیدام.» دەسنووسی وەرگێڕاوی لۆر فونتلێرۆی بچکۆلە بوو لەگەڵ دەقی ئینگلیزی کتێبەکەدا.

گوتم دانیشن بەرشێو بخۆن و چوومە ژووری دانیشتن. لەنێو راحەتییە سەوزەکە دا، بە دەم روانینی پەنجەرە رووتەکانی کە ئەو رۆژە پەردەکانیانیم شوردبوو بیرم لە ئێمیلی دەکردەوە، مەگین دەکرا؟ ئارتووش گوتبووی «چ منداڵێکی نازدار.» خۆم پێم وابوو «چەندە شەرمن» دیسان کەوتمەوە بیر شەربەی سرکە و چاتنی و نازانم بۆ ئەو رۆژەشم بیر هاتەوە کە ئارمەن لە دایك بوو.

دۆتمامی* ئارتووش لەگەڵ شووەکەی لە تەورێزەوە بە میوانی هاتبوون. دایکم و ئالیسیش لەسەر مێزی فراوین بوون. لەنێوان چێشتخانە و فراوین خۆری لە هات و چۆ دابووم و قسەکانم دەبیست.

«سەرمای وا هەر قەت نەبووە.»

«بەڵکو بەفر بباریٚ.»

«ئاباداان و بەفر؟ ئەوە چ قسەیەکە، خۆ ئێرە تەوریٚز نییە.»

«کلاریس، هێندە هات و چۆ مەکە، باش نییە.»

«حەی! ئەورۆ شان بە شانی باغەوان داری لە بن هەموو تەماتەکان چەقاندووە.»

«چی چەقاندووە؟»

تەماتە هەرکە بڵیند بوو، دار لەبن پنچکەکەی دەچەقێنن و لقەکانی لە دارەکە دەبەستن.»

«لە تەوریٚز تەماتە لە ماڵدا ناچێنن.»

«جا لە تەوریٚز چ دەچێنن هەتا تەماتە بچێنن.»

یەکەم جار بوو تەماتەم چاندبوو. هەموو بەیانیان کە لە خەو رادەبووم یەکەم کارم چوونە حەوشەی پشتەوە و سەردانی تەماتەکان بوو کە هێشتا سەوز و زۆر وردەڵە بوون.

ئێوارە چووینە خورەمشار، بۆ ئەوە خوشك و شووەکەی ئارتووش بگەیەنینە ئیزگەی شەمەندەفەر، لەکاتی گەڕانەوە دا، لە نزیك ئاباداان ژان گرتمی و یەك راست چووینە نەخۆشخانە. ئارمەن لە نیوە شەودا لە دایك بوو. هەتا بەیانی لەسەر تەختی نەخۆشخانەی کۆمپانیای نەوت وەخەبەر بووم و لەرزیمەوە. پێم وابوو هۆی لەرزینەوە و سەرماکە پێوەندی بە لەبار بوونەوەم هەبوو. بەیانی کە دایکم و ئالیس هاتنە نەخۆشخانە، جلی ئەستووری بە دەس چنراویان پۆشیبوو.

«دویٚ شەو هەوا زۆر سارد بوو.»

«گەیشتە چەند پلە ژێر خاڵ.»

«لەو پەنجا ساڵە دا قەت سەرمای وانەبووە».

«هەر گوڵ و سەوزییەکی کە لە شاردابوو هەموو رەش هەڵگەڕاوە.»

گوتم «تەماتەکان ــــ »

دایکم ئارمەنی لە باوەش کرد. «گشت گوڵ و سەوزی و تەماتەکان بە قوربانی تاڵە موویێکی نەوەکەم بیٚ.»

ئالیس سەری ئارمەنی ماچ کرد و لە قاقای پێکەنینی دا، «کامە موو؟»

لە نەخۆشخانەوە کە گەڕاینەوە ماڵ یەك راست چوومە حەوشەی پشتەوە. پنچکە تەماتەکان هەمووی رەش هەڵگەڕابوون. لەسەر عەردی دانیشتم و گریام، دایکم گوتی «شەرمیٚ بکە. بۆ چەند تەماتەی سندان کوشتوو دەگری؟» ئارتووش بن هەنگڵمی گرت و

هەڵیهێنامەوە. ئالیس گوتی «مەلوول بوونی دوای لەبار بوونەوە.» دایکم گوتی «ئەو قسەیە چییە، مەلۆتکەکە بەرنە ژوور سەرمای نەبێ.»

لەو ژوورەی کە بۆ ئارمەنمان دروست کردبوو، چاوم بەو پەردانەی کە خۆم گوڵچنم کردبوون و بە وێنە رەنگاورەنگەکانی مشك و پشیلە و کەروێشکێکی کە لە دیوارماندا بوو گێرا. روو تەختییەکی کە دایکم بۆ تەختی منداڵەکەی چێکردبوو لامدا و ئارمەنم خەواند، فرمێسکەکانم سڕییەوە و گوتم «زارۆ بچکۆلانەکەم.»

پاڵم وە پاڵپشتی راحەتی سەوز دا و فرمێسکەکانم سڕییەوە و لە پەنجەرەڕا چاوم دە ئاسمانی بێ ئەستێرە بڕی. یەکێ شەربەیەك سرکەی دابووە "زارۆ بچکۆلانەکە" دڵم گیرا و گوتم بریا گەورە نەبووبایە. ئەودەم کە بچکۆلە بوو تەنیا کارگەلێکی دەکرد کە من گەرەکم بوو. چ بخوا، چ نەخوا، بۆ کوێ بچێ، بۆ کوێ نەچێ و هەنووکە هەنووکە یەکێ شەربەیەکی سرکە دەرخواردی زارۆکم دابوو و ئەمن تەنانەت نەشم زانیبوو. دیسان بیرم لە ئێمیلی دەکردەوە. لە کێ فێر بووە؟

دەفتەرچەکەم هێشتا هەر بە دەستەوە بوو. لێکم کردەوە، خەتی وازگێن یەکدەست و رەوان بوو. هەمیشە بە جەوهەری رەشی دەنووسی. گوتم «پاشان دەیخوێنمەوە.» دەفتەرچەم پێکوەنا و نامە نێو قەفەزەی کتێب و گەڕامەوە چێشتخانە.

ئارسینە و ئارمینە سرتە سرتیان بوو. هەر کە منیان دی هەڵبەزینەوە.

«ئارمەن هەنووکە هات و چووە ژوورەکەی.»

«کارێکی چەوتمان کرد کە ــــ»

«کە بە تۆمان گوت؟»

«خۆ لێی تووڕە نابی؟»

دڵنیام کردن کە کارێکی چەوتیان نەکردووە و لە ئارمەن تووڕە نابم و گوتم بە شوێن دەرس و دەوریاندا بچن.

لە دەرگەمدا. لە پشت دەرگەوە گوتی «گاڵە نەدراوە.»

لەسەر قەرەوێلە راکشابوو و دەستەکانی نابووە ژێر سەری و چاوی لە ساپیتە بڕیبوو. لە پاڵی دانیشتم. گەلێك ساڵ بوو پەردەکانی ژوورەکەم نەگۆڕیبوو. قەرەوێڵەی سەردەمی منداڵیم بەخشی بوو و روو تەختییە چکۆلەکە لە چەمەدانی ئەمبار دابوو. بیرم لە وێنەکان کردەوە کە چیم لێکردوون؟ وەبیرم نەهاتەوە. لە یەك دوو ساڵ لەمەو بەرەوە لەجیاتی وێنەی مشك و

پشیله و کەروێشك ، وێنەی ئالێن دێلۆن و کێرك داکلاس و بێرت لێنکتێر، کۆلۆدیا کاردینالە و بریژێت باردۆ بە دیوارەوە بوو. چاوم لێکرد و هەستم کرد چاو لە بوونەوەرێکی بیانی دەکەم. کوڕە پازدە ساڵانەکەم هەتا بەیانی ئەو ڕۆژە بۆمن هەر زارۆکێکی بچکۆلە بوو و هەنووکە ڕوانیمە مژۆڵکەکانی کە هەر وەك سەردەمی منداڵی بوون. بڵیند و هەڵگەڕاوە. لە قەراخ چاوی چۆپەیدا هێشتا شوێنی خوریکەیەکی کە لە یەکساڵیدا لێی هاتبوو دیار بوو و سەرەڕای ئەمانە دووای پازدە ساڵ هەر دەتگوت یەکەمجارە دەمدی. خەریك بووم بیرم لەوە دەکردەوە چ بڵێم کە خۆی هاتە یاریدەم و هێشتا چاوی هەر لە ساپیتە بوو گوتی «دەزانم کارێکی چەوتم کرد. خەتای ئارسینە بوو.»

ئەگەر کاتێکی تر بووایە لە بناگوێ دانی ئارسینە لەخۆ وە دەبوویە بابەتێکی شیاوی باس و بێشك کێشەم لەسەر ساز دەکرد، بەڵام هەنووکە گەرەکم بوو لەمەڕ بابەتی سەرەکی بدوێ و بدوێم و بدوێین، ئێمیلی و ــ تەنانەت ناو بردنیشی بۆم دژوار بووــــ ئەوین و ئەوینداریيان.

نەمدەزانی لە کوێوە و چۆن دەس پێبکەم. ڕوانیمە نەخشەی* ئێران کە لە سەرەوەی قەرەوێڵە بە دیوارەوە بوو. بە چاو بە دەوری زەریاچەیەکدا خولامەوە. هەرکە سەرم بردە پێش ناوەکەی وەخوێنم و بزانم بەختەگانە. کەوتمەوە بیر بەڵێنی یەکەم لەگەڵ خاتوون نورولڵایی و بە خۆمم دەگوت بۆچی گشت شارەکانی ئەرمەنستان نەدیتوو لە نەخشە دا دەناسم و ناوی زەریاچەگەلی ئێران نازانم؟

حەولم دا وەبیر خۆی بێنمەوە لە سەردەمی دەزگیرانیێتیم لەگەڵ ئارتووشدا چ هەستێکم بوو. و ئەوە تەنیا کاتێ بوو کە دەشیام بە بەشێك لە سەردەمی ئەوین و ئەوینداری ژیانمی دابنێم. شتێکم بیر نەکەوتەوە. مەودای ناسیاوی تا دەزگیرانی و دەزگیرانی تا زەماوەند درێژخایەن نەبوو. حەوتوویەك دوای جێژنی لە دایك بوونی دۆستی هاوبەشمان، نزیك ماڵی خۆمان تووشی ئارتووش هاتم. بەر لەوەی خۆشحاڵ بم پێم سەیر بوو، ئارتووشیش سەیرما و گوتی «چ هەڵکەوتێکی بەجێ.» گوتم «هەر بەڕاستیش چ هەڵکەوتێ.» ماوەیەك دواتر، ڕۆژێ کە بە شەقامی سەعدیدا دەڕویشتین و خەریکی خواردنی پونچیك* گەلێك بووین کە لە شەکرۆکە فرۆشی* مینێون کڕیبوومان گوتی «یانی نەتزانی بە ئانقەست هاتبووم؟» دیسان سەرم سوڕما. «ماڵی ئێمەت لە کوێ پێدەزانی ؟» زۆر بە تێڕادیوی گوتی «دیارە دۆزینەوەی ناو ونیشان فرە فرە دژوار بوو بەڵام ــــ » نازانم چی لە چاوەکانم دا دی کە نەشیا درێژە بە

گاڵتەکەی بدا و زوو دایە پێکەنین. «پرسیم، دەیجا.» پاشان دەستی خستە ملم. «خۆشیم لە پاکی و بێ گەردیەکەت دێ.»

هەروا کە دەڕوانیمە زەریاچەی بەختەگان بە خۆمم گوت «پاك و بێ گەردم یا گێل و نەفام؟»

ئارمەن کە چاوی دە سەراپستە بڕیبوو پرسی «ئەتۆ و باوکم بەر لەوەی زەماوەند بکەن ئەویندارى یەگدی بوون؟»

داچڵەکیم. پرسیارگەلی لەناکاو، ئاکاری چاوەڕوان نەکراو و هەموو شتێکی کە لە پێشدا خۆم بۆ تەیار نەکردبوو دەبوونە هۆی ئەوە دەست و پێی خۆم ون کەم و ئارمەن خوای ئەمکارانە بوو. هەنووکە لەجیاتی ساپیتە دەمن رامابوو و چاوەنواری وەڵام بوو.

رابووم و چووم لەبەر پەنجەرە وەستام. وەبیر رۆژێکی ساڵانی دوور کەوتمەوە کە مامۆستای جەبر بڕیار نەبوو دەرسم لێ بپرسێتەوە و پرسیەوە و نەمزانی دەقەکەی سەر تەختە رەشە لێك بدەمەوە. نیگای هاوپۆلەکانم لە پشت سەرمەوە هەست پێدەکرد و لەبن چاومەوە مامۆستای ماتماتیکم دەدی کە بێ واز و چاوەنوارِ، بە پت هەوای قۆڕتەی لێدەدا. لە دڵی خۆمدا دەمگوت «خوایە فریام کەوە. ئەم کاتانە هەرچی زووتر تێپەڕێنە».

دڵم بە تەوژم لێی نەدەدا و شەلاڵی ئارەقەش نەبووم، بەلام دەیویست ئەم کاتانە هەرچی زووتر تێپەڕن، چاوم لە دارە مۆرتك* بوو و پشتم دە کوڕەکەم گوتم «منیش وەك تۆ ئارام لەگەڵ ماتماتیك نەدەهات.»

ئارمەن هەتا شەوێ لە ژوور نەهاتە دەر و کە بۆشێویش بانگم کرد، لە پشت دەرگەوە قیژاندی «برسیم نییە.»

دوانەکان بێ هیچ قسەیەك شێویان خوارد و بە بێ دەنگی مسواکیان لێدا، جلی خەویان پۆشی و خەوتن. نە داوای چیرۆکیان کرد، نە بۆ درەنگتر خەوتن وەك هەمیشە پەلپیان گرت. ئەو شەوە نە ئیشی ون بوو نە راپۆنزێل.

# ٢٣

ئارتووش له هەمبەر تەلەویزیۆن دانیشتبوو. کتێبی دۆزگەلی شەترەنجی لە دەستێکی دابوو و بە دەستەکەی تری کایەی بە ردێنی دەکرد. پەڕەی شەترەنج لەسەر مێز بوو.

له پاڵی دانیشتم و چەند چرکەیەك تەماشای تەلەویزیۆنم کرد. فیلمێکی دێکۆمێنتی بوو لە دار خورماکانی دەوروبەری ئەهواز، گوتم «دایکم هەقیەتی، لەمەودوا دەبێ رادەی هاموشۆ لەگەڵ سیمۆنیاکان لەبەرچاو بگرین.» دەستی دەنێو ردێنی دا رەق هەڵات. «چۆن؟» گێڕامەوە. باسی شەربەی سرکە و چاتنی فڕ کردنی گوێ دایە کە گەیشتمە نووسراوەکەی نێو پاس پێکەنی و لەسەر باسی کوتەك خواردنی ئارسێنە بە دەس ئارمەنەوە گەڕاوە سەر کتێب و پەڕەی شەترەنج و گوتی «خۆتی پێوە ماندوو مەکە منداڵن. ئەرێ. ئێمیل گوتی سۆزی دوانیوەڕۆ ئیزنی وەرگرتووە بێ گوڵدانەکان بگۆڕن؟ گوڵ بچێنن؟ شتێکی وا، چاکم لەبیر نییە.»

بۆ چەند ساتێ ئارمەن و ئێمیلی و شەربەی سرکە و لەبەر چاو گرتنی رادەی هامو شۆ لەگەڵ سیمونیانەکانم لەبیر چوو. قژم لە دەوری تلم هاڵاند. «سەیرە، وادیارە لەبیری نەچووە.» ئارتووش مۆرەیەکی جێگوڕکێ پێکرد. «چی لەبیر نەچووە؟» لە فیلمەکەدا مێرە عەرەبەکە خۆی حازر دەکرد بە دارە خورمایەك هەڵچێ. «چەند رۆژ لەمەوبەر گوتی دێم گڵی گوڵە نۆك بگۆڕین. پێم وابوو کەوتۆتە شەرمەحزووری.»

ئارتووش سەری هەڵبڕی و چەند ساتێ لێم روانی. «گوڵە نۆك؟»

گوتم «گوڵە نۆکی قەڕنیزی چێشتخانە.»

گوتی «چێشتخانە؟»

هەناسەیەکی قووڵم کێشا، پاڵم وە پاڵپشتەکە دا و دە تەلەویزیۆن رامام. مێری عەرەب بەتاو بە دارە خورماکە هەڵدەگەڕا. گوتم «ئێمە ماڵێکمان هەیە کە ئەو ماڵە چێشتخانەیەکی هەیە. ئەم چێشتخانەیە پەنجەرەیەکی هەیە کە گەلێك ساڵە گوڵدانێکمان لەسەر قەڕنیزی ئەم پەنجەرەیە داناوە و ئەمن ساڵێ جارێك گوڵە نۆك دەنێو ئەو گوڵدانە دادەچێنم و ساڵێ دووجار گڵی ئەم گوڵدانە ـــ» مێری عەرەب گەیبووە سەر دار خورما.

ئارتووش مۆرەیەکی لە دەستی دا هەڵسووڕاند. «ئەها.» پاشان زەردەخەنەی هاتێ. «بۆ گۆڕینی گڵی گوڵدان ئیزنی وەرگرتووە؟ هەر بەراستی.»

«ئیزنی بۆ گوڵدانی ئێمه وەرنەگرتووە. گەرەکی بوو لە حەوشەی خۆشیاندا گوڵ بچێنێ.» دیسان کەوتمەوە بیر شەربەی سرکە و چاتنی. «بەڵام لام وایە هەر واباشترە لەگەڵ سیمونیانەکان کەمتر هاموو شۆ بکەین.»

کتێبی شەترەنجی وێکنا. تلی لە بەینی کتێب دابوو. «دیسان گانە بوو کردتە گامێش؟ مندالْن. بە شەڕ دێن، پێك دێنەوە، دیسان بە شەڕ دێنەوە. هاموشۆ کردن یا نەکردنی ئێمە چی بەو شتانە داوە؟»

لە دڵی خۆمدا گوتم «تەنیا بۆ لە دەسدانی هاوکایەی شەترەنج بە پەرۆشی.» بەرز گوتم. «حەق بە تۆیە. ئەمن چی گەورە ناکەمەوە؟ هەر جارەی کە لەمەڕ شتێکەوە لەگەڵ تۆ بدوێم رووداوێك گەورە دەکەمەوە.»

بۆ چەند ساتێ دە ساپیتە راما، ئەوجار دە تەلەویزێون، پاشان وێستا. کتێبی شەترەنجی تووڕ دایە سەرمێز و وەدەرکەوت. پیادەی رەش خلۆر بۆوە ژێر راحەتی.

خاتوون "دوور ئەندیش" بێژەری تەلەویزێون بزەی هاتێ و گوتی «شەوێکی خۆشتان بۆ بە ئاوات دەخوازین.»

بوغزم دە گەروو دا مابوو.

# ٢٤

ئالیس بە هۆی جۆش و خرۆشی زۆرەوە نەدەشیا بە دروستی قسە بکا.«تەلەفۆنی کرد. باوەڕ دەکەی؟ تەلەفۆنی لە بیمارستان کرد. بۆ شێو بانگێشتنی کردمە یانە.» پێدەکەنی، نزگەرەی دەهاتێ و لە دەوری من و دایکم و مێزی چێشتخانە دا هەڵدەسووڕا.

دایکم رابوو دەرگەی سەلاجەی کردەوە. ئاوی دە شەربە کرد، وە دەستی ئالیسی دا و گوتی «بە تەمای خوا. یەگجاری گێژ و حۆل بووە.»

خوشکم ئاخرییەکەی هاتەوە سەر خۆ. لێوی لە شیرینی نەدا. قاوەشی نەخواردەوە و تەلەفۆن کردنەکەی یوپ هانسێنی بە هەموو بەشە پێویست و نە پێویستەوە گێڕایەوە. پاشان رابوو، کیفەکەی نایە ژێر هەنگڵی و بەرەو دەرگە وەڕێکەوت. پێی دە ئەسکەمل هەڵەنگوت و وەمێز کەوت و هێندە نەمابوو سەرا و سەر بچێتە نێو دیوار هەتا ئەوەی کە دەرگەی دۆزییەوە

و به پشوو هەڵماڵاوی گوتی «نۆرەی ئارایشتگام گرتۆتەوە. دەبێ هەشتی شەو لــە یانــەبم.» و بە دەم نزگەرەوە رۆیی.

لە جەرگەی مێــز زەق بووینــەوە. دایکــم لــە جــێ شــەکری، ئــەمن لــە خوێــدان. دایکـم ئاخرییەکەی گوتی «ئەتۆ بیرت بۆچی دەچێ؟»

بە دیتنی سەرو سەکوتی وەڕەز و بە پەرۆشی پێکەنین گرتمی. دایکم بە هەر رووداوێك جاڕز و بۆ هەر شتێ بە پەرۆش دەبوو. لەوەی کە ئالیس هەتا ئــەودەم شــووی نــەکردبوو یــەك بــێ نیگەران بوو و ئەوکاتەش کە مێرێك لە ژیانی خوشــکم دا ســەریهەڵدەدا ترســی رێدەنیشــت. منیش شەوی میواندارییەکەی نینا ســەرم لــە ئاکــاری مێــری هۆلەنــدی و ســەرنجێکی کــەوە ئالیسی دەدا سوڕمابوو و ئێستاش کە چەند رۆژێك رانەبردبوو بانگێشتنی کردبوو، زیاتر بـۆم جێی سەرسوڕمان بوو. بەڵام پێی خۆشحاڵیش بووم، لەپێشدا لــە بــەرەوەی کــە خوشــکم لــەو بەرنامە سەیرەی کە بۆ ئێمیــل ســیمۆنیان رێکــی خســتبوو بێشــك پــەژیوان دەبــۆوە و دووەم ئەوەیکە خۆم گوتم «کەس چووزانی؟ بەڵکوـــــ ».

دایکم وەك بیرمی خوێندبێتەوە گوتی «مەحاڵە. نینا دەیگوت ئەو پیاویلەیــە ئەوینــداری ئەم ئافرەتە تارانییە بووە ـــ ناوی چ بوو؟ کیژی پووری گارنیك. ئەدی یانی چی تەلەفۆنی لــە "ئاچوو" کردووە؟» ئێستا کە خوشکم لەوێ نەبوو دایکــم بــە بیرێکــی ئاســوودە و بــێ ئــەوە ترسێکی لە پرتە و بۆڵە و شەڕ هەبێ، خوشکمی بە ناوی ســەردەمی منداڵییەکەیــەوە بــانگ دەکرد.

رابووم، تۆڕی پەنجەرەم لادا ئاوێ دەبن گوڵە نۆکەکە بکەم. هەولّم دا بەو بەڵگانەی کە بــۆ خۆشم کز و جێی باوەڕ نەبوون، لای دایکم پاساوی ئەم رووداوە سەمەرەیە بدەمەوە.

دایکم دەس لە سەر سنگ و رەق و تەق دانیشتە سەر ئەسکەمل و هــەر ئەوەنــدەی گــوت «مەحاڵە بزانی ئەم پیاویلەیە چ نەخشەیەکی کێشاوە.»

کەوتمەوە بیر شەوی پێشتر. «ئێمیــل گــوتی دێ گڵــی گوڵدانــەکان بگــۆڕی.» بــۆ دەمــێ خۆشحاڵ بووم، پاشان بیرم بۆ پیادە رەشەکەچوو کە بێ گومان هــەروا لــە ژێــر راحەتییەکــەی ژووری دانیشتن دا بوو. چاوەڕێی گەڕانەوەی ڤینی دوێ شەو بووم. نەگەڕاوە. گوتم بــا ئــاودانی گوڵدان بمێنێتەوە دوای گۆڕینی گڵ.

تونگەی ئاوم دانایە سەر پێشخان و زۆڕیامەوە لای دایکم. بەڵکو هەر بەڕاستی خۆشی لە ئالیس هاتووە. چ لەوە باشتر؟» روانیمە کاتژمێرە دیواریەکە. واباشتر نییــە لــە ماڵــەوە بــی؟

ئاگات لێی بێ وەك هەمیشە زۆر خۆی بەزەك* نەدا. ئەمن دەبێ بەرشێوی منـدالآن دروسـت بکەم. هێندەی نەماوە لە قوتابخانە بگەڕێنەوە.» لـە دڵـی خۆمـدا گـوتم «چـونکە دەمـەوێ سەبارەت بە ئارمەن لەگەڵ ئێمیلی بدوێم، دایکم لە ماڵ نەبێ ئاسوودەترم.»

دایکم هۆشی هێندە لە لای ئالیس و مێـرە هۆلەندیەکـە بـوو نـەیگوت بـۆ هاتنـەوە لـە قوتابخانە و چوونی ئالیس بۆ شوێنی دیـاری کراوەکـەی زۆری مـاوە. چـەند جـار گـوتی «یـا مەریەمی پاقژ، وە خێری گێڕی.» و رۆیی.

بۆ چەند ساتێ لە ناوەندی چێشتخانە چەقیم.

دوو لایەنی بیرگەم کێشەیان بوو. لە کۆتاییدا یەکیان بە وی دیکەی گوت «رێکوپێك بوون خۆ تاوان نییە.»

چوومە ژووری خەو، قژم شە کرد و لێوم سوور کرد. پاشان دەستم شـورد و کـرێمم تێـدا و روانیمە کات ژمێر. بریا زانیبام چ سەعاتێك دێ. بیرم لەوکارانە کردەوە کـە دەبـووا بیکـەم. ئتووی رووپۆشی دووانەکان، رێك و پێك کردنی کەشەوەکانی ژووری ئارمەن، کۆکردنەوەی جلە شۆراوەکانی حەوشەی پشتەوە. لەجیاتی گشتی ئەمانە چوومە ژووری دانیشتن، لەسەر راحەتیە سەوزەکە دانیشتم و دەسنووسی لۆرد فۆنێتلرۆی بچکۆم لێك کردەوە.

سەدەی نۆزدە. ئافرەتێکی ئامریکـایی لەگـەڵ مێرێکـی ئینگلیـزی زەماوەنـد دەکـا کـە میراتگری ناو و نیشانی لۆردێکە. وەرگێڕاوی وازگێن وەك هەمیشە رەوان و سانا بوو. خاتوون سیمۆنیان دەزانێ کوڕەکەی دێتە ماڵی ئێمە؟ بۆچی نەزانێ؟ لۆڕدی مەزن لەوەی کە کوڕەکەی لەگەڵ کیژێکی ئامریکایی زەماوەنـدی کـردووە دڵ پیسـە و کوڕەکـە لەناوونیشـان و مـیرات بێبەش دەکا. دووانەکان بێشك چیرۆکیان پێخۆشە. ئەمن کە هیچ کات لە ماڵەوە لێوم سـوور ناکەم. رستە زۆر دوور و درێژە، بیکەینە دوو رستە. کوا قەڵـەمم؟ بێگومـان دیسـان منـداڵ هەڵیانگرتووە. لەو ماڵەدا هیچکات هیچ شتێ لە شوێنێ خۆیدا نییە. کـوڕی لـۆرد و کیـژی ئامریکایی کوڕێکیان دەبێ. گا دەکەیە گامێش. لە بابەت ئەو شتانەی کە هیچ پێوەندییەکان بە ئێمەوە نییە چەند سەعات دەئاخوێ و واز لە دۆزگەلی خۆشمان دێنێ و دەڕوا. چ شـتێ لـە منداڵەکان گرنگترە؟ کوڕی لۆرد دەمرێ باوە گەورە مرۆڤێکی سـەیر لـە خۆڕازییـە. ئافرەتـە ئەمریکایی بەستەزمان. ئارتووش لە خۆڕازییە. زۆر لە خۆڕازی. زەنگی دەرگـەیان کـە لێـدا تێگڕابووم. هێشتا نەگەیبوومە دالآن سووراوی لێوم بە دەسماڵ قاقەزی پاك کردەوە.

شەڵوارێکی قاوەیی و کراسێکی قۆڵ کورتی دەبەر کردبوو. تەلیسە چکۆلەکەی گڵی لە حەوشە دانایە بن پەنجەرەی چێشتخانە. تا هاتم گوڵدانەکە راکەم گوتی «هەلێمەگرە دەستیش لە گڵ مەدە. تەنیا "لاپیتە*" کەم بدەیە.»

بۆ کەوتمە بیر شاهێندە؟

دوو چەمەدانمان لە بازاڕی کوێتییەکان کڕیبوو. هەر دەستەی چەمەدانێك پێوە، لە پشت سەری ئارتووشەوە بەرەو ماشێن دەچووم کە لە نزیك دووکانی شاهێندە رامانگرتبوو. شاهێندە لە دووکان وەدەرکەوت. سڵاو و چاك و خۆشی کرد چاوێکی لە چەمەدانەکان کرد و پاشان روانییە من و ئەوجار بە پێکەنینەوە بە ئارتووشی گوت «موهەندیس، کۆڵکێشێکی کەشخەت دۆزیوەتەوە.» ئارتووش شەوێ گوتی «شاهیندە مێرێکی شۆخە. بە وتەکەی دڵمەند نەبووی؟»

ئێمیل دەسبەجێ گڵی گوڵدانەکەی گۆڕی و وێستا. «زۆر چاکە ، ئێشەکەمان تەواو بوو.»

گوتم «کاری ئێوە تەواو بوو. ئەمن کە هەر چاوم لێکردی.»

ئارەقەی تەوێڵی بە پشتە دەستی سڕییەوە و لێم رووانی. «ئێوە نا، تۆ.» دوایە بەرمزەی هاتێ. «کەوابوو ئاودانی گوڵدان عایدی تۆ. سابوونی بۆنخۆش هێشتا هەر ماوە؟»

ئاوم دەبن گوڵدان کرد. دوو دلایەنی بیرگەم دیسان کێشەیان دەسپێکردەوە. ئەوەی یەکەم دەرفەتی بە دووەمی نەدەدا. «ئەو پەلەیەت لەچییە؟ بۆچی رۆژان ئاسا شیلانك بە دەوری شێرەی ئاودا نایەنی؟ بۆ تووڕتدایە سەر عەردی؟ بۆ دیسان لە کاتژمێر ورد دەبییەوە؟ بۆ بیرت کەوتەوە ئارتووش گوتوویە ئیمڕۆ درەنگ دێ؟ بۆچی هۆی درەنگ هاتنەکەییت لە یاد نییە؟» دووەمی پەڕییە نێو قسەکانی یەکەمی. «گەرەکمە تا بەر لە گەڕانەوەی منداڵان لەمەڕ ئێمیلی و ئارمەنەوە بدویم. هەر هێندە.»

قاوەم دروست کرد و داوام کرد بچینە ژووری دانیشتن. پەردەکانم شۆردبوو. ئوتووم لێدابوون و هەر بەیانی ئەوڕۆژ هەڵمواسیبوون. گوتم دوای قاوە دەئاخۆم.

دەسنووسی وەرگێڕاوی وازگێن و کتێبی ئینگلیزی لۆرد فۆنتیلرۆی بچکۆلە لەسەر مێز بوو. کتێبەکەی راکرد و لاپەڕەی هەڵدایەوە. پاشان چاوی بە دەسنووسەکەدا گێڕا. «وەرگێڕاوی خۆتە؟»

فینجانی قاوەم دانایە سەر مێز و تا ویستم دەس پێبکەم، گوتی «وەبیرم هاتەوە ئەو کتێبەی خاتوون مانیا باسی دەکرد؟» گوتم ئا و بە خۆمم گوت کتێبەکەی لەبیر ماوە یا مانیا؟

بەرەو قەفەسەی کتێبەکان چوو. داهاتەوە و ناوەکانی خوێندەوە. «دەکرێ بڵێم لە کارەکانی «ساردۆ» جگە لە یەك دووانیان هەمووت هەیە.»

نازانم چۆن بوو دەستم پێکرد، بەڵام هەر دەستم پێکرد. لەبابەت ساردۆ دوام و ئـەوەی کـە کام کتێبیم پێخۆشە و کامیانیم پێخۆش نییە و بۆ پێم خۆشە و بۆ پێم خۆش نییە و بیر و رای ئاغای داوەتیان لەمەڕ ساردۆ وە چییە و ئاغای داوەتیان خاوەن کتێب فرۆشـی "ئـاراکس"ە و کتێب فرۆشی ئاراکس لە چوار رێیانەی قەوامـوو سەلتەنەی تارانە و ئەمن ئەو کتێب فرۆشییەم خۆشدەوێ و هەرکە دەچمە تاران یەکەم شـوێنەکە سـەری لـێ هەڵـدێنم و چـەند سـەعاتێکی لێدەمێنمەوە و قەرارمان لەگەڵ ئاغای داوەتیان داناوە لە تارانەوە کتێبم بۆ رێبکا و رێدەکا و دیارە هەمـوو کتێبەکانی ساردۆم نەخوێندۆتەوە ـــ دوام و دوام و دوام. منداڵەکان کە جانتا بە دەستەوە لە دەرگەی ژوورەوە وەدیار کەوتن بە خۆمم گوت چۆنە دەنگی پاسم نەبیستووە؟

ئێمیل لە تەواوی ئەو ماوەیە دا تەنیا چاوی لێم کردبوو. ئانیشك لەسەر دەستەی راحـەتی ، دەست لە ژێر چەناگە.

## ٢٥

تەماتەم دەشوردەوە کە ئالیس و دایکم لەو لای را هاتن.

دایکم لە باتی سلاو کردن دەستی بە پرتە و بۆڵە کرد، لەسەر ئەسکەمل دانیشت و چـاوی دە ساپیتە بڕی.

ئالیس هێشتا بە تەواوی دانەنیشتبوو دەستی کرد بە گێڕانەوەی رووداوی شـەوی پێشـوو. «یەکەم ئەوەی کە نمرەی هەڵس و کەوت بیست. هەتا لە چێشتخانە وەژوور کەوتم یـەکپێ لـە پشت مێز هەستاوە و سەریدا نوواند.»

ویستم بپرسم «بۆ بە شوێنت دا نەهات؟ زوو قسەکەم گێڕاوە و پرسیم «قاوە دەخۆی؟» بـە پەشۆکاوی سەری راوەشاند کە قاوە ناخوا و بە پشـوو هـەڵماڵاوی درێـژەی پێـدا «لـە بابـەت هەموو شتێکەوە دوا. لە دایکی کە لەگەڵ پووری دەژی. نزیك شارێکی چکۆڵە. لە باشـووری هۆڵەندا. لە ماڵێکی نزیك لێڕەوار، هەر وەك کۆلیتەکانی کارت پۆستالەکان ـــــ »

دایکم زۆر بە تووڕەییەوە چاوی لە ئالیس بڕیبوو و ئەمنیش مژوولی قـاوە دروسـت کـردن بووم.

ئالیس ئەسکەملەکەی کێشاوە دوواوە، وێستا و بەرەو سەلاجە چوو. «وێنەی ماڵ و چـەند وێنەی دایکی و پوورەکەی پێشاندام.» دەرگەی سەلاجەی کردەوە و شووشـەی ئـاوی دەرێنـا. پوورە بەستەزمانەکەی نەقوستان بووە و بە ئەسکەملی تەگەرە دار هاتووچـۆی ئێـرە و ئـەوێ دەکا ـــ» شەربەی پڕ لە ئاو کرد. «یووپ گوتی ئێمە گەل کـە لـە ئابـادانین دەبـێ ئـاو زۆر بخۆینەوە.» دوو قومی ئاو خواردەوە. «پـووری یـووپ بـۆ مەشـرەف خۆشـی و دلۆڤـانی وەك فریشتە وایە.» دیسان ئاوی خواردەوە. «دایکەش هـەروەك پـوورە. بلـێ وەك جـەواهێر، لـە دلۆڤانی و مەشرەف خۆشی.» پاشماوەی ئاوەکـەی خـواردەوە. «بەسـتەزمانەی گـەلێك سـاڵە خزمەتی خوشکەکەی دەکا و لەو دووایییانە دا لەبەر ئێشی پشـتی دەکڕووزێتـەوە.» شـەربەی بەتاڵی لەسەر پێشخانەکە دانا. «یووپ  گوتی دایکی و پووری لەگەڵ هیچ کەس هەڵسوکەوت و هاموشۆیان نییە و تەنیا دەیانەوێ یـووپ زەماوەنـد بکـا و هاوسـەری بەرێتـە ئـەو ماڵـە ژیکەڵەیە و هەموو بە یەکەوە بژین.»

قاوە جۆشەکەم لەسەر ئاور لابرد، ئۆجاقەکەم تەمراند* و قاوەم بۆخۆم و دایکم تێکرد.

ئالیس دەهات و دەچوو و جگە لە من و دایکم چاوی بە هەموو شوێنێك دا دەگێـڕا. «دەور و بەری ماڵ هەتا چـەند کیلـۆمێتر عەبدەلبەشـەری تێدانییـە و بـەرە بـەیانیانی زوو چـاوت وەکارمامز دەکەوێ. خەیاڵی نییە؟ شەوانەش دەنگی لوورەی چەقەڵ لە لێڕەوارەوە دەبیسـی.» دایکم گوتی «یا مەریەمی پاقژ!»

شەربەی بەتاڵم شورد و نامە نێو قاپ وشك کەرەوە و لەپشـت مێـز دانیشـتم. ئالیسـیش دانیشت. «مێرێکی چەندە نازدار. چەندە بە هەست ، چەندە لەبـەردڵان، چـەندە دلۆڤـان، لـە هەموو بابەتێکەوە پرسیاری کرد. وانەی پەرسـتاریم لـە کـوێ خوێنـدووە، لـە کەیـەوە کـار دەکەم.» پێکەنی «لەپێشدا وەیدەزانی پەرستاری ئاسـاییم. پاشـان کـە زانـی سەرپەرسـتاری ژووری برینگەریم، پێم وایە فرە پەشۆکا.» چاوی لە دایکم کرد. «واتا کەوتە ژێر کارتێکردن.» دیسان لەمن روانییەوە. «پرسی لەکەیەوە دامەزراوم. دەس لە کار بکێشمەوە چەندە پوولی لە کۆمپانیا وەردەگرم. بە کورتی هەموو شتێکی پرسی. ئەگەر قەستێکی تایبەتی نەبوایـە بـۆ دەبوو بپرسێ؟ وەنیە؟ تۆ چۆنی بۆ دەچی؟»

لەباتی وەڵامدانەوە شیرینی عەسەلیم خولّق کرد.

دایکم گوتی «خوشکیشت وەك من پێی وایە ئەتۆ کەری.»
ئالیس هەر دەتگوت لای وانەبوو دایکم ئاخۆتووە و ئەمن نەئاخۆتووم، شیرینییەکەی وەلانا و وێستا. «پێنجشەممە کە پشوودانم هەیە بانگێشتنی کردووم بچینە "کووت عەبدوڵڵا". دەبێ سەری نازانم چ پلانێك بدا، رێك لە جەرگەی چۆلە واردا. بڕیار وایە ساندویچ دروست بکەین و هەر لەوێ لە جەرگەی چۆلەواردا بیخۆین و پیاسە بکەین. یووپ ئاشقی چۆلەوارە.» چۆلەوار و شامات* و تاوی هەروەك دیکلەمەی شیعرە ئەویندارییەکان دەخوێندەوە. دەست لەهەر دوو لا کریاوە، سەرنەختێ بەرز و چاو لە پەنجەرە.
دایکم لە ناکاو قیژاندی «بۆ تێناگەی؟»
ئالیس گەشاوە، «تۆ تێناگەی. خۆی گوتی هەر یەکەمجار کە چاوی پێم کەوتووە خۆشی ویستووم.»
دایکم دەستی کرد بە هات و هاوار. چاوم لە شیرینییە قەپاڵ لێدراوە بڕی. خۆ ئەمن شیرینی عەسەلیم پێخۆش نەبوو؟ هاویشتمە نێو تەپلەك و لەجێوە رابووم.
دەستم کرد بە لێکردنەوەی پێستی تەماتەکان. خوشکم بۆچی هێندە نەزان بوو؟ بۆچی دایکم ئەو قسە بەجێ و بێ جێیانەی کە سەدجار کردبوونی دووپاتی دەکردنەوە؟ بۆچی هێندە ناساز بووم؟ هەر کە تلم بڕی هاوارێکم لێ هەستا کە زۆریش لەبەر ئیش نەبوو.
دایکم لەجێوە هەڵبەزییەوە. «چ بوو؟»
خوێنەکەم لە ژێر شێرەی قاپشۆری شوردەوە و گوتم «هیچ نەبووە.»
دایکم و ئالیس جارێکی تر قسە و باسەکەیان دەسپێکردەوە. لە خۆمم پرسی «چی بوو؟» وەڵامی خۆمم داوە «شەربەی سرکە و چاتنی. بەد خولقی دوێ شەو لەگەڵ ئارتووش، نەزانی ئالیس، زیخ و وریایی مێرە هولەندیەکە، هات و هاواری دایکم و ــ ئێمیل سیمۆنیان لە لای خۆی چی بیر کردبۆوە؟ چ ماوەیی بێ نێوبڕ ئاخۆتبووم؟ نیو سەعات؟ سەعاتێك؟» لە شەرمان ئاورم گرت.
دایکم دەیگوت «گشتی خەتای نینایە. سەدجار گوتم نابێ لەگەڵ ئەوانە هاموشۆ بکەین.»
ئالیس گوتی: لەخۆ وە هات و هاوارێ مەکە، بە نینا چی؟»
ئێمیل لەکاتی رۆیشتن دا گوتبووی «سوپاس دەکەم. بۆ قاوە و بۆ هەموو قسە خۆشەکان.»
بێشك گاڵتەی پێکردووم. بێشك گاڵتەی پێکردبووم و هەقی خۆم بوو.

دایکم خوێدانەکەی لە مێز کوتا. «یانی تۆ تێناگەی ئەو هەتیوە بە شوێن قەرەواشـی بـێ مووچە و مەواجب دا دەگەڕێ؟»

ئالیس کێردی میوە خۆری توندتر لەسەر مێز کوتا. «ئێوە تێناگەن.»

تەماتەکانم دە پالۆێنە کرد. لایەنی ڕەخنەگری زەینم ئەسپی خۆی لنگ دەدا. «هەتا هەی خۆت بە زانا نەزانی.» خویێم بـە تەماتـەکان داکـرد. لایـەنی دلۆڤـان بـە هانامـەوە هـات. «نەیگوت زانام، لەو شتانەی کە پێی خۆشـبوو دووا.» خـوێ چـوویە شـوێنە بڕاوەکـە و تلـم زووراوە. شوێنە بڕاوەکەم مشت و چاوم لە گوڵە نۆکەکان کرد. لایەنی سەخت گر پرسی «ئەوە لەکەیەوە لە بابەت ئەو شتانەی کە پێمانخۆشە دەدوێین؟» لایەنی دووهەم بە شـوێن وەڵامـەوە بوو.

بە دەنگی دایکم وەرسووڕام. «هۆشت لە کوێیە کلاریس؟ ئەتۆش شتێك بڵێ.»

تلم هەروا لە زاریـدا بـوو وەرسـووڕامە لای دایکـم، دووانـە وەژوور کـەوتن. «کارەکـانی قوتابخانە تەواو بوو.»

تلم لە زارم دەرێنا و ڕامداشتە لای دەرگە و قیژاندم «بۆ دەرەوە.»

هەر دوو لەپێشدا لەمن زەق بوونەوە، پاشان چـاویان دە دایکـم بـڕی کـە خـۆی باوەشـێن دەکرد، ئەوجار لە ئالیس ڕامان کە لەسەر خۆ سێوی پاك دەکرد. دیسان لـەمن زەق بوونـەوە. لە مێژ بوو فێر ببوون لەچ کاتگەلێك دا "نا" نابیسن. هەردوو سەریان خوار کردەوە. «ئیزنمان هەیە کە ـــــ» «کە ئێمیلی ـــــ»

پەڕیمە نێو قسەکانیان «بۆ دەرەوە.»

دایکم زۆریاوە لای ئالیس. «تەنیا بە دیتنی جارێك ـــــ»

ئالیس گوتی « دوو جار.»

دایکم گوتی «ئێستا هەرچەند جار. خوالێخۆشبوو ئەگەر زیندوو بووایە ـــــ»

چاوەکانم لێك نا و دەستم نایە سەر نێوچاوانم، دیسان دەبووایە گوتبامە ئـالیس هـەق بـە تۆیە؟ دووانەکان هێشتا هەر لە دالان بوون کە لە زەنگیاندا.

« سڵاو ، پوورە نینا.»

«سڵاو، پوورە ویۆلێت.»

«جلێکی چەن کەشخەت لەبەر کردووە سووفی.»

«کارێکی زۆر باشتان کرد هاتن.»

چاکتان کرد هاتن؟ دایکم وای خۆ گرتبوو کە پێم وابوو هەر ئێستا دەس بە شەڕی دەکـا و ئالیس سێوەکەی نایە سەر دەوری. «نینایە؟ فرە باش بوو»

دەنگی نینا لە دالآنەوە هات. «خانە خویێ لە کوێی؟»

خۆم گەیاندە دالآن. هەرچی داوام کرد بچینە ژووری دانیشتن، نینـا گـوتی «نـا، دڵـم بـۆ کۆڵێتی هێنزێل و گرتێل تەنگ بووە.» و لە چێشتخانە وەژوور کەوت، «بەهـ بەهـ ، خـاتوون و سکانیان و ئالیسیش لێرەن، بە خێرێن، بە خێرێن.»

ئالیس بە دەستی ئاوەڵاوە بـەرەو نینـاو ویوڵێـت چـوو و هـەر دووی لـە بـاوەش گـرت و رایموسین. دایکم سڵاوی نینای وەرنەگرتەوە. ویوڵێت چـاوی بـە دەور و بـەر داگێـڕا و گـوتی «چێشتخانەیەکی چەند خۆشە.»

ئالیس گوتیە نینا «هەر هەنووکە بە کلاریسم گوت دڵم بۆ نینـا نیسـکێکی لێهـاتووە.» دایکم لەمن و نینا و ویوڵێت و دەر و دیواری چێشتخانە مۆڕ بۆوە و هەتا پرسیم «ئەسکەمل بۆ هەمووان هەیە؟» جارێکی دی زەنگ لێدرا و دەنگی ئارمینە و ئارسینە لە دالآنـەوە بـەرز بۆوە.

«سڵاو ئاپۆ ئێمیل.»

«سڵاو خاتوون سیمۆنیان.»

«ئێمیلی ئەوە بە تەما بووین بێینە شوێنت.»

«هەموو لە چێشتخانەن.»

نە دەرفەتی بیر کردنـەوەم بـوو، نــە بـزاڤ. دایـك و کـوڕ لەبـەردەم دەرگـەی چێشـتخانە وێستابوون.

بۆ چەند ساتێ هەموو بێدەنگ بوون و هەر دەنگی ویوڵێـت دەهـات کـە لـە ژێـر لێـوەوە ئاهەنگێکی زەمزەمە دەکرد. تۆڕی پەنجەرەی کردبۆوە و پشتی دەئێمە کردبوو و بۆنی بە گوڵە نۆکەکانەوە دەکرد.

یەکەم کەس کە وەقسە هات خوشـکم بـوو. رەق و تـەق چـووە لای خـاتوون سـیمۆنیان و دەستی بردە پێش. «ئێوارەتان باش. ئەمن ئالیس وسکانیانم، خوشکی کلاریس.»

دووانەکان کە لەگەڵ سووفی و ئێمیلی لە پشت ئێمە وێسـتابوون تریقانـەوە و بـەر لـەوەی چاوم بە چاویان بکەوێ رایانکرد. ئەگەر هەل و مەرج ئاسایی بووایە. شـێوەی نائاسـاییی خـۆ

ناساندنی ئالیس و قەڵافەتی پان و پـۆڕی لـەنك بـەژن و بـاڵا وردەڵانـەی خـاتوون سـیمۆنیان منیشی وە پێکەنین دەخست.

ئەوە ئالیس لەگەڵ ئێمیل تۆقەی دەکرد. «فرە خۆشحاڵم تاسەی زیـارەتی ئێـوە و دایکـی بەڕێزتانم بوو. کلاریس زۆری تاریفی ئێوەی کردووە».

ئەمن کەی تاریفم کردووە؟ ئالیس بۆچی زەلام زەلام دەخۆی؟ ئەمڕۆ ئێوارە شار هـەمووی لە چێشتخانەی من دا کۆبوونەوە؟

دەنگێك گوتی «بۆنی ئەم گوڵانە چەند خۆشە.»

هەموو لامان لە پەنجەرە کردەوە. ویۆلێت بە فانیلەی سوور، دامێنی چەرمووی پف دراو و جووتە گوارەی ئاڵقەیی پاڵی وەشیپانەی پەنجەرە دابوو. قژەکانی لـەژێر رووناکییـەکی کـە لـە پەنجەرەوە هاتبووە ژوور کاڵتر دەینواند.

پاش ئەوە گشتیانم بە یەکتر ناساند، خولڵقم کردنە ژووری دانیشتن. خاتوون سیمۆنیان گوتی ئەوە دەچووە بازاڕی کوێتییەکان و لەسەر رێگەوە سەرێکیان لێرە هەڵێنا، چون ئێمیل گەرەکی بوو شتێکم پێ بدا. ئەوجار سەرێکی بۆ نینا لەقاند و زۆریاوە لای دایکم کە ئەوە خەریك بـوو شتێك بپرسێ.

ئالیس چاوی لە ئێمیل و دایکی مۆڕ کردەوە کە هیچکام نەیانـدی. دەسـتی خسـتە نێـو قەدی نینا و بەرەو ژووری دانیشتن چوو. چەن باش بوو دیتمی. دەبەر دابووم ئەوشۆ تەلـەفۆنت لێ بکەم.»

دایکم بە خاتوون سیمۆنیانی دەگوت «خوالێخۆشبووی باوکـت لەگـەڵ خـوا لێخۆشـبووی باوکم دۆست بوون. لە شایی زەماوەندی ئێوەش بانگێشتن کرابـوو. دیـارە ئـەمن نـا، چـونکو منداڵ بووم، بەڵام ــــ »

دیسان خولڵقم کردە ژووری دانیشتن. خاتوون سیمۆنیان شتێکی لەبن لێوەوە گـوت و زۆریـا لای کوڕەکەی.ئەمنیش هەروەتر زۆریامە لای ئەو، چاوی هەر تکمان بە شوێن نیگای ئێمیلەوە وێڵ بوو تا گەییە بەر پەنجەرە. ویۆلێت گوڵـە نـۆکێکی سـپی لـە دەسـتیدا هەڵدەسـووڕاند و پێدەکەنی.

دایکم گوتی «مەخابن بۆ ئەو دەربانە مەزن و کەشخەیە کە فرۆشتتان. دوێنـێ دەمگوتـە کلاریس ــــــ »

خاتوون سیمۆنیان گوتی «ئێمیل!»

دایکم گوتی «دەمگوتە کلاریس ـــــ »

خاتوون سیمۆنیان بەرزتر گوتی «ئێمیل!» زۆریا و لە چێشتخانە دەرکەوت.

بە دوای ئێمیل دا کە دەکرێ بڵێین بە دوای دایکیدا رایکرد. منیش نەختێ رامکـرد. لـە جەرگەی رێگە بەرتەسـکەکەدا گـەڕاوە بەسـتەکەی نێـو دەسـتی بـۆ لام راداشـت. «دوێنـێ سندووقی کتێبەکانم کردەوە ـــــ »

خاتوون سیمۆنیان قیژاندی «ئێمیلی!»

دەستم درێژ کرد و بەستەکەم وەرگرت و چاوم لێکرد و هەر کـە سـەرم هـەڵێنا کـەس لـە حەوشە نەبوو و دەرگە ئاسنییەکە کریاوە بوو. زۆریامەوە چێشتخانە.

دایکم خەریك بوو پەڕۆی بە پێشخانەکە دا دەیەنا. دایکم بە پێی عادەتی خۆی بـە پەلـە کاری دەکرد، بەڵام ئەو کاتانەی تووڕە دەبوو جوڵەکانی وەفیلمە کۆنەکان دەچوو، تونـدو پچـڕ پچڕ. ویۆلێت دە دایکم رامابوو. کە چاوی پێم کەوت گوتی «چەند بە لەز کار دەکا. هـەر بـە راست ، جینارەکەتان خاتوونێکی چ بچکۆلە و خوێن شیرین بوو، بەڵام دەتگوت لە شتێ تووڕە بووە، وەنیە؟»

دایکم رووی دە ویۆلێت کرد. «بەڵێ کە تووڕە بوو. تووڕە بوو چونکو گوتم بـۆ ئـەو ماڵـە کەشخەیەت فرۆشتووە. تووڕە بوو چونکو دە سەر لەبەری ژیانی دەگەم و لە نك من ناشێ فیزو ئیفادە لێ بدا. تووڕە بوو چونکو گوتم ئەودەم شووی کرد ئەمن منداڵ بووم. خۆ درۆم نەکرد.» پشتی دە ئێمە کرد و دیسان خەریکی پێشخانەکە بۆوە.

ویۆلێت بە زاری نیوە کریاوەوە بۆ ماوەیێ چاوی لە دەستی دایکم کرد کـە زۆر بەلـەز بـە دەوری پێشخاندا دەگەڕا، پاشان برێ لەو قژەی کـە دەم و چـاوی گرتبـوو لادا و گـوتی «دەی دەی، ئەو لەبەرەوە تووڕە بوو.»

پەڕۆکەم لە دەس دایکم وەرگرت و لەگەڵ ویۆلێت بـەڕێمکردە ژووری دانیشـتن کـە تـەنیا مامەوە بۆ چەند ساتێ هەر دوو دەستم خستە سەر سەرم، پاشان هەناسەیەکی قـووڵم کێشـا، ئەوجار فینجانەکانی قاوە خۆریم لەسەر سنیەکەدا ریز کرد و قاوە جۆشم لەسەر ئاو دانا. حاڵم هیچ خاس نەبوو، ماندوو و تووڕە و دڵئێش ببووم. لە دەس ئالیس؟ لە دەس دایکم؟ لـە نینـا کە بێ ئاگاداری سەرو کەلارەی پەیدا ببوو یا لە دەس خۆم کە بۆچی بە شوێن ئێمیل و دایکی دا رامکردبوو؟ قاوە هەڵچوو و بە لێوی قـاوە جۆشـەکە دا سـەر رێـژ بـوو. هەرچـی ئاڵقـەی

جەرگەی قاوەکە بچکۆلە تر دەبۆوە، پشووم سوارتر دەبوو. رێك لەو کاتەی دا کە دەبووا ئاورم کووژاندباوە دوو دەنگ لەگەڵ یەك کوتیان «دا ااا یە ئیزنە کە ـــ »

زۆریامەوە و قیژاندم « نا ئیزنتان نییە.»

بە دەنگی فشەی هەڵچوونی قاوە وەرسووڕام. ڕوانیمە قاوە جۆشـی نیـوە بـەتاڵ و ئۆجـاق گازە عەدم بووە و چاوەکانم لێك نا.

دەنگی ئارمینەم لە دالانەوە بیست. « تووڕە بوو، چونکە قاوە هەڵچوو.» ئارسینە گـوتی «نا. لە پێشدا تووڕە بوو پاشان قاوەکە هەڵچـوو.» قـاوە جۆشـم لـە ژێـر شـێرەی قاپشـۆری شوردەوە. دیسان قاوەم پێوا، دیسان شەکر، دیسان ئاو.

کەشەف بە دەستەوە کە وە ژوور کەوتم ئالیس بە نینـای دەگـوت «زەحمـەتی چـی؟ هـیچ زەحمەت نییە. هەر ئێستا تەلەفۆن لە گارنیك دەکەم.» چاوی پێم کەوت و گوتی «بڕیـار بـوو شێو لە لای یەکتر بین. تەلەفۆن لە گارنیك دەکەی؟» نازانم چی لە نیگای من دادی کە گـوتی «بۆخۆم تەلەفۆن دەکەم.» و چوویە دالان.

فینجانەکانی قاوەم لەسەر مێز ریز کرد، لە پاڵ نینا دانیشتم و هەوڵم دا گوێی لێ بگـرم بزانم چ دەڵێ. دایکم لەسەر لێوی یەکێ لە ئەسکەملەکانی چێشت خۆری دانیشت. لێوەکـانی توند بە یەکەوە نابوو و زەق دە فەرش رامابوو.

ئالیس زۆریاوە ژووری «گارنیك گوتی سەرمای لێداوە، دەترسـێ لێـی بگرینـەوە. گـوتی پێویست بە نیگەرانی نینا و ویۆلێت ناکا. گوتی خۆش بن. هەر بەڕاستی مێرێکی فرە لەبـەر دڵانە.» پاشان رووی دە من کرد. «بچۆ ئەولاتر. کارم بە نینایە.»

هەتا ویستم هەستمەوە، دەنگی هەراو هوریا لە دالانەوە هـات. پاشـان تەقـەی داخرانـی دەرگەو شکانی شووشە، ئەوجار زیقەی سووفی «دەستم، ئای، دەستم.»

هەموو رامانکردە دالان. بەردە نووسی سەرەوەی دەرگەی ژووری ئارمەن شکابوو و وردکە شووشە رژابوویە سەر عەردی دالان. سووفی جومگەی دەستی گرتبوو و دەیزیقاند و دووانـەکان هاواریان دەکرد «سووفی دەستی بڕی.»

هەناسەم لێ بڕا، «نەکا دەماری دەستی بەستەزمانە پچڕابێ؟»

نینا چنگی لە باسکم داگرت. «یا حەزرەتی مەسـیح! دیتـت چ قـوڕێکم وەسـەری بـوو؟ ئێستا چ بکەم؟»

سووفی دوو قەد ببۆوە و جومگەی دەستی بەر نـەدەدا و یەکپشـوو دەیقیژانـد. دووانـەکان یەکتریان لە باوەش گرتبوو و دەگریان و دایکم لێگدا لێگدا روومەتی خۆی دەڕنی و دەیگـوت «شەیتان بە لەعنەت.»

ئالیس کە چاوەڕوانی لێنەدەکرا بەو قەڵافەتە زلەیەوە بە تاو رایکرد، دەستی سوفی کێشا و قیژاندی «بەریدە بزانم چی لێهاتووە.»

هەموو بۆ ساتێ بێدەنگ بوون و ئالیس جومگەی سووفی هەڵێناوە. بە چەشنێ کە شوینێ چکۆڵەی بڕاوم لەسەر جومگەیدا دی.

ئالیس داهاتەوە و زەق دە دەم و چاوی سووفی راما. «پێرێ مشکێکیان هێنا نەخۆشخانە کە هەر ئەو بەڵایەی بەسەر هاتبوو، ئەگەر گوتـت چـی لێهـات؟» و سـووفی کـە بـە چـاوانی فرمێسکاوی لە ئالیس دەڕوانی، ئالیس گوتی «مرد» و لە پێکەنینی دا.

نینا باسکمی بەردا، چوو سووفی لە باوەش گرت و گوتی «خوایە زۆر شوکر.»

دایکم وازی لە لەخۆدان هێنا و گوتی «خوایە شوکرت.»

لە دڵی خۆمدا گوتم «خوایە شوکر.»

سووفی دەم و لووتی تێکنابوو، دووانەکان لە باوەشیان گرت ، گوتی «ئـ ەەە ی!»

ئالیس هاتـە لای نینـا. «ئێسـتا کلاریـس پاقـژی دەکاتـەوە. وەرە تـا پاشماوەکـەت بـۆ بگێڕمەوە.» و دەستی نایە ژێر هەنگڵی نینا.

سووفی کە دیتی دایکی خەریکە دەڕوا دیسان دەستی بە گریان کردەوە.

چوومە حەمام. قەفەزەی دەرمانەکانم کردەوە. شووشـەی "دێتـۆڵ" و پـەمۆم دەسـدایە و زۆریامەوە دالانی. سووفی هێشتا هەر دەگریا. نینا دیسان لە باوەشی گرتبوو. دووانەکان بەرەو رووی دەرگەی داخراوی ژووری ئارمەن هاواریان دەکرد. «خەتای تۆ بوو.» ئارمـەن لـە پشـت دەرگەوە دەیقیژاند «بە من چی؟» و دایکم دەیقیژاندە سەر منداڵـەکان «بێـدەنگ.» ویـۆلێتم دی کە دەرزیلەیەکی سەر بە موو رووی بە ددانییەوە گرتبوو و سەری لەبـەر نـەینووك راس و ریس دەکرد. لەو ماوەیە دا لە کوێ بوو؟

ئالیس قیژاندییە سەرم «زووکە، دەی. ئەو فسە فسەت لە چـییە.» دێتـوڵ و پـەمۆی لـە دەستم رفاند.

دەرگەی ماڵ کراوە و ئارتووش و ئێمیل وەژوور کەوتن.

ئارتووش دەستی پێکرد کە «گوتمان بەر لە شێو خواردن دەستێك شەترەنج ــ » دەتگوت ئێمیل بیرمی خوێندۆتەوە گوتی «دایکم سەرئێشەکەی گەییە ئەوپەڕی خۆی وـــــ نەچووینە بازاڕی.» پاشان هەردوو لە شووشەکانی سەر عەردیان روانی.

سووفی بە دیتنی تەماشاچییە تازەکان دیسان گریا بوو و ئالیس شوێنە بریندار بووەکەی بە پەلە دەشوردەوە، نینا و دووانەکان و دایکم هەموو بە یەکەوە رووداوەکەیان دەگێڕاوە.

چاوم بە ویۆلێت کەوت. بزەی هاتێ و دەرزیلەی سەری لە زاری کەوتە خوار. دەستی بە زارییەوە گرت و گوتی «وەی!» پاشان داهاتەوە دەرزیلەی هەڵگرتەوە. لە درزی فانیلە پێسیر کریاوەکەیەوە، ژێر کراسە تۆڕییە رەشەکەییم دی. گوتم «ئەو پێستە چەرمووەی.»

خەریکی خاوێن کردنەوەی پەڵەکانی ئۆجاقگاز بووم و بیرم لەوە دەکردەوە کە شێو بۆ ئەم هەموو خەڵکە چ لێبنێم و جا باشە بۆ دەبێ بۆ ئەم هەموو خەڵکە شێو لێبنێم و ئالیس بە چ هەقێ لە خۆوە خەڵك بانگێشتێ دەکاتە ماڵە من و ئارمەن چیەتی و دووانەکان بۆ هێندە هات و هاوار دەکەن و نینا بۆ وا بەرز پێدەکەنێ کە ئارتووش لە پشت سەرمەوە گوتی «بۆ شێو چیمان هەیە؟»

پەڕۆکەم توور دایە نێو قاپشۆری و گوتم «هیچ، برۆ لە "ئەنێکس" چێشت بکڕە.» لە پێشدا پێی سەیر بوو. دوایە وای بۆ چووم کە پێی خۆشبوو. گوتی «خۆرێشتی ئانێکس خراپ نییە.» پاشان دەتگوت وەبیری هاتەوە کە بۆ خۆی ئارای لەگەڵ چێشتی تیژ نایە. «"فیش ئەندچیپس" یش دەکڕم. چەن کەسین؟ هەنووکە دەژمێرم.» و لە چێشتخانە چۆ دەرێ.

منداڵەکان ئاشقی ماسی بریشتە و پەتاتەی سوورکراوەی رەستوورانی ئەنێکس بوون. خۆم چەند جار بۆم دروست کردبوون. بەڵام هەموو جارێ لووتیان تێکنابوو کە «وەك هی ئانێکسی خۆش نییە.»

شۆڤرلێت دوای چەند چرکە سات ناز و نووز. هەڵبوو و وەرێکەوت و دایکم لە چێشتخانە وەژوور کەوت. «کەوابوو ئاغای موهەندیس لە خوای ویستووە وەدوای چێشتی دەرێ کەوتووە. وەنییە؟ بێشك بە تەمای کەبابی تورکی بازاڕیشە، هەم! یا سەمبووسەکە هەزار مێش و مەگەزی لەسەر نیشتووە، ئاخ!»

ویۆلێت سەری لە چێشتخانە هەڵێنا. بە بەندی ژێر کراسەکەیەوە خەریك بوو. «گوتیان چێشت لە "ئانیکس" دێنن. دوێ شەو لەگەڵ نینا و گارنیك چووینە "ئەنێکس" پڵاوی خۆرێشت کاریمان خوارد. زۆر خۆشبوو.»

دایکم هەروەك ئەوە بیەوێ بەژنی ویوڵێت بە دروستی ئەندازە بگرێ، هەر لە نووکی قژییەوە کە پێدەچوو بە ئانقەست شێواندوویەتی، هەتا نووکی پێڵاوە پانیە بڵێندەکانییەوەی سەیر کرد و گوتی «"ئەنێکس" نەك ئانێکس. چێشتەکەشی بۆ ئەوانەی چێشتی ماڵێیان نەخواردووە خۆشە.» و بەرزتر و قایمتر لە دووجاری پێشتر "هم" و "ئاخ"ی کرد و لە چێشتخانە وەدەرکەوت. ویوڵێت پێکەنی «ئینگلیزییەکەی من جێی شەرمەزارییە» پاشان گوتی «ئەوە سالاد دروست دەکەی؟ یارمەتیت بدەم؟»

ئەگەر کاتێکی تر بووایە بێشك دەمگوت «زەحمەت مەکێشە، خۆم دروستی دەکەم.» کاتێکی تر نەبوو. پیوازێکی درشتم لەسەر مێز دانا و گوتم «پاژی بکە*.»

# ٢٦

ڕۆژم پیس لێ هەڵات.

هەتا ئارتووش پرسی «چاویلکەمت نەدیوە؟» گوتم «لەنێو چاوانمیان نەنووسیوە. "بەرپرسی دۆزینەوەی کەلوپەلی ونبوو".» نانم نەمابوو کە بۆ زەنگی پشوودانی منداڵان بابۆلە دروست بکەم. پوولم پێدان بسکویت بکڕن و چاوی دووانەکان کە گەشایەوە گوتم «چیپس و گەندەڵ مەندەڵ نەکڕن، تەنیا بیسکویت ، ئەویش دوای فراوێن.» و هەولم دا بیرم کەوێتەوە شێوخۆری قوتابخانە ئەو ڕۆژە بەرنامەی چێشتی چییە و منداڵ پێیان خۆشەیانا. بەرنامەی شێوم وەبیر نەهاتەوە و لەجیاتی ئەوە کەوتمە بیر قسەی نینا کە ئەگەر بۆ وێنە گوتبام «قوتابخانە ئیمڕۆ خۆراکی ماسی هەیە، منداڵ ئارایان لەگەڵ نایە،» لووتی تێك دەنا کە «پێم خۆشە، پێم خۆش نییە یانی چی؟ منداڵ دەبی رابێ هەرچی لەپێشیاندانا بیخوا.» داوێنی ساکۆی ئارسینەکە قەد ببۆوە ڕاستم کردەوە و گوتم ڕەنگە هەق بە نیناش بێ.

ئارمەن ئەسکناسەکەی نایە گیرفانی و بێ ماڵاوایی لە ماڵ وەدەرکەوت لە دوێنێوە چەند جار لەگەڵ دووانەکان بە دمەقاڵ* هاتبوو، لەگەڵ من و باوکی نەئاخۆتبوو و هیچیشی نەخواردبوو. وازی ئەوەم نەبوو وەبیری بێنمەوە کە نەکا بۆ نانی لەواش لە قوتابخانە بچێتە دەرێ.» کوڕەکانی دەبیرستانی دەیانگوت «خۆراك لە ماڵەوە ئانین کاری منداڵە ورکانە.» و

بۆ ئەوەی منداڵ نەبوونی خۆیان بە سبووت بگەیەنن، هەر رۆژەی یەکیك مەعموور دەکرا خۆ بدزێتەوە و بچێ لە نانەواخانە نانی لەواش بکڕێ. هەر خوا دەزانێ ئەمن بۆ ئەم کارە چەند جار چووبوومە دەفتەری قوتابخانە و ئارمەن بەڵێنی دابوو ئەمکارە نەکاو هەر کردبووشی.

دەس لەنێو دەستی دووانەکان چووینە حەوشە. لە جەرگەی رێگە باریکەکەدا پرسیم «ئەوجار چ بووە؟» و هێمام کردە ئارمەن کە پشتی لە ئێمەدابوو و دەرگە ئاسنییەکەی دەکردەوە. دووانەکان چاویان لە یەکتر بڕی، پاشان چاوێکیان لەمن کرد، ئەوجار شانیان هەڵتەکاند کە «نازانین.» گوتم «چونکە ئێمیلی دوێ شەو نەهات؟» ئەوجارە بێ ئەوە چاو لە یەکتر بکەن هەولێاندا پێنەکەنن.

پاسی قوتابخانە منداڵەکانی سوار کرد و وەڕێکەوت و دەنگی دوور و دوورتر بۆوە. دەرگەی ئاسنم پێوە دا، بە رێگە باریکەکەدا تێپەڕیم و چوومەوە ماڵ و ویستم دەرگە داخەم و پشوویەکی باشی بۆ بدەم کە «هەتا ئێوارە تەنیام.» دەنگی سلفی کزی شۆفرلێتم بیست.

هەڵنەبوونی شۆڤرلێت بەشێك لە بەرنامە نەگۆڕەکانی ئێمە بوو. ئارتووش کاپۆتی هەڵدێناوە و دە جەرگ و هەناوە رزیو و ژەنگ گرتووی ماشێن رادەما. پاشان خۆی بە شیلانك گەلێك خەریك دەکرد کە نەمدەزانی چی بە چیەوە دەلکێنێ و دڵنیابووم ئارتووشیش نایزانێ. لێم دەپرسی «هەڵنەبوو؟» ئارتووش دەیگوت "هووم" بۆ چەند ساتێ لەگەڵی دە ماتۆڕی ماشێن رادەمام و پێم وابوو «هەر وەو نەخۆشە دەچوو کە بە زەبری داو دەرمان و سرۆم زیندوویان راگرتووە.» دەمگوت «تاکسی بانگ بکەم یا تەلەفۆن لە ئاغا سەعید بکەم؟» ئەگەر درەنگی بووایە دەیگوت «تاکسی» وەك برینگەرێك کە بە پەرستار بڵێ "مقەست." و ئەگەر پەلەی نەبووایە و ماشێنیش رەزایەتی نەدابا هەتا تامیرگا بە قۆرتە قۆرت بڕوا دەیگوت «تەلەفۆن لە ئاغا سەعید بکە.» وەك برینگەرێکی کە بە پەرستار بڵێ خوێنی پێ بدەن.

ئاغا سەعید لە نزیك سینەما خورشید تامیرگای هەبوو، هەرکات ئارتووش و شۆڤرلێتی دەدی پێدەکەنی. دەستە رەشەکانی دادەنایە سەر قژە لوولەکانی و دەیگوت «شێوی گیان دیسان خرا بووە؟» ئاغا سەعید هەموو جارێ کە دەهاتە سەر شۆڤرلێت، دوور لە گوێی ئارتووش پێی دەگوتم «خاتوون موهەندیس، ئەگەر ئەتۆش ـــ ببەخشن ها! ـ وەك خاتوونەکانی تر پرتە و بۆڵە بکەن بە گیانی شووەکەتان، بێ گومان ئاغا موهەندیس ماشێنێکی تازە مۆدیل دەکڕێ.» کاتێ دەمگوت «ئاغا موهەندیس خووی بەو ماشێنە گرتووە» ئاغا سەعید سەری با دەدا و لەبنەوە دەیگوت «راستییەکەی سەرەدەرێ لە کاری تۆ

و ئاغا موهەندیس دەرناکەم. مشتەرییەکانی کۆمپانیای نەوت هەتا تەق و توقێك دەبێ و مووچە زیاد دەبێ و پلە دەچێتە سەر، یەکەم کارێکی کە دەیکەن گۆڕینی ماڵ یا ماشێنە بەڵام ئێوەگەڵ ـــ ») شەربەت یا چاییم بۆ دەبرد و دەمگوت «پلە و مووچە چی بە ماڵ و ماشێن داوە؟ شەربەت یا چایەکەی فڕ دەکرد و دەیگوت «نیەتی؟»

لە بری چوون لە پاڵ ماشێن وێستان و بەشداری لە بەرنامەی هەموو رۆژە دا، پاڵم وە دیواری دالاندا، چاوەکانم لێك ناو بەرز گوتم «خوایە، هەڵیکەی.» گەرەکم بوو تەنیابم. پێم خۆش بوو زوو تەنیابم. سەرم دەیەشا و وازی هیچم نەبوو.

بە دەنگی وەکار کەوتنی ماشێن چاوم هەڵێنا، بەڵام هەتا ئارتووش دەندەی نەگۆڕی و پاشە و پاش لە کاڕێژ وەدەر نەکەوت و لە شەقامدا نەزۆڕیاوە و دەنگی ماشێن دوور نەکەوتەوە نەمگوت «خوایە، سوپاس.»

چوومە چێشتخانە، لە پشت مێز دانیشتم و بەسەرخۆمدا گوڕاندم «هیچ دەزانی چتە؟» دەسماڵ کاغەزییەکم لە قوتووەکە دەرکێشا و نامە سەرچاوەکانم و کەوتمەوە بیر باوکم.

ئەو کاتانەی حاڵم زۆر تێك دەچوو باوکم وەبیر دەهاتەوە. ئەو دەمانەش کە حاڵم خاس دەبوو وەبیر باوکم دەکەوتمەوە. وەك ئەو کاتانەی کە چڵە گیاییێکم دە ئاوێ دەنا ریشەی دەردەکرد یا چێشتێکی کە یەکەم جار لێمدەنا بە تام و چێژ دەبوو یا ئارمەن نمرەی باشی وەردەگرت، بە ورد کردنی دەسماڵ قاقەزییەکەوە خەریك بووم و بیرم بۆ ئەوە چوو کە بۆ هەمیشە ئەوکاتە کە نارەحەتم یا خۆشحاڵم باوکم بیر دەکەوێتەوە؟

سەرم هەڵێنا روانیمە دوو وێنەگەرییەکەی کە لە دەرگەی سەلاجەم دابوو. یەکیان هی دووانەکان بوو. دیاری رۆژی دایکی پارەکە. دڵ و گوڵگەلی مەزن و رەنگاوڕەنگ کە لە جەرگەی هەرکام دا نووسیبوویان «خۆشمان دەوێی.» دووەمی وێنەگەری ئارمەن بوو. هی تەمەنی چوار، پێنج ساڵی. بە ئاو رەنگی زەرد وێنەی ئافرەتێکی کێشا بۆوە. ئاڵقەیەکی سەوز دەنێو دەستەکانی ئافرەتەکە دابوو کە شێوەی دەستی نەدەدا و زۆرتر وەسەرێکی دوو چاو دەچوو. کاتێ پرسیبووم «چیت کێشاوەتەوە؟» گوتبووی «دایکم کە ئارمەنی دە باوەش گرتووە.» دەستم لە ژێر چەناگە نابوو و چاوم لە وێنەکە دەکرد و دەمگوت «ئیدی هیچ کات بەم شێوە لە باوەشت ناگرم.»

چاوم بە پێشخان کەوت و بەستەکەم دی. ئەو بەستەیەی کە ئێمیل سیمۆنیان رۆژی پێشتر، کە خۆم و خۆی لە حەوشە دا بە دوای دایکیدا رامانەکرد وە دەستمی دابوو. بۆ هەتا ئێستا

وەبیرم نەهاتبۆوە؟ بەستەکەم دەسدایە و چوومە ژووری دانیشتن. لەو هەڵلاّ و بگری ئێوارەی دوێنێ و دوێ شەو لەبیر کردنی سەیر نیە.

لەنێو راحەتی چەرمی دا دانیشتم و کردمەوە. یەکێ لەو کتێبانەی ساردۆ بوو کە گوتبووم نەمخوێندۆتەوە. لە سەرەوەی یەکەم لاپەڕەیدا نووسرابوو "بۆ کلاریس، کە دەشێم گەلێك رۆژان گوێ بۆ قسەکانی شل بکەم".

کتێبەکەم وێك نا. ژوور زۆریش فێنك نەبوو، بەلاّم سەرمام بوو. دیسان کتێبەکەم لێك کردەوە و رستەکەم خوێندەوە. تلم بە سەر نووسراوەکە دا هێنا. خەتێکی زۆر نەرم بوو. یەکدەست و یەك رادە و خوار. خەتە هەرمەنییەکەی خۆم رێك بوو. پیتەکانم یەك یەك دەنووسی "o"یەکانم وەك چوارگۆشەگەلی بچکۆلە بوون. خەتی ئێمیل خواری و خێچی یەك رادە و بە یەکەوە لکاو و نەرم بوو.

بێ حاڵی و بێوازی وردە وردە بەسەر چوو. وەك ئاو کە هێور هێور بکوڵێ و ببێتە هەڵم. هەستم بە سووکنایی کرد. هەستم کرد حاڵم باش بووە. بە خۆمم گوت «یانی قسەکانم بۆ ئەو باش بوو؟ واتە وازی بەسەر نەچووە؟» وەبیر دەستەکەی کەوتمەوە کە نابوویە ژێر چەناگەی و کات ژمێرەکەی بەندێکی چەرمی سپی پێوە بوو. لە حەوشەدا دوو بۆق بە نۆرە دەیانقیراند. چاوم دە پەنجەرە بڕی. بە خۆمم گوت «بەڵکو ئەم دووانەش پێیان خۆشە دەگەڵ یەکتر باخۆن.» دەتگوت گوڵەکانی پشت پەنجەرە سەریان بۆم دەهەژاند.

کتێبەکەم وەرسووڕاند و پشت بەرگەکەییم خوێندەوە. کورتەیەك لە بابەتی چیرۆکەکە بوو. مێرێك لە سەردەمی گەنجییەوە کیژێکی خۆش دەوێ و تەنیا ئاواتی گەیشتن بە کیژەکەیە. هەنووکە تێکەلاّوی دۆزگەلی سیاسی بووە و لەنێوان هەڵبژاردنی ئەوین و خۆی گوتەنی دەرووەستییەکانی کۆمەلاّیەتی دا دڕدۆنگە. هاتمە لاپەڕەی یەکەم و جارێکی تر رستەکەی ئێمیلم خوێندەوە. لاپەڕەم هەڵدایەوە، گەیمە پاژی یەکەم و دەستم بە خوێندنەوە کرد. مێری چیرۆك هێشتا هەر لە دڕدۆنگیدا بوو و کیژە بۆ قانع کردنی دەستی دەدایە هەر فێڵ و تەڵەکەیەك کە تەلەفۆن زەنگی لێدا. چاوم لە کات ژمێرەکە کرد و متمانەم نەکرد. دواین جار کە هێندە بە دوورودرێژی ، یەکبین و یەك پشوو و بێ نێوبڕ خوێندبوومەوە کەی بوو؟

# ٢٧

گارنیك گوتەنی، ماتۆڕی نینا وەك هەموو دەم دایسا و دەنگی زەنگوڵەئاسا. «ئەمن کە هێشتا هەروەك گێژانم. هەر بەڕاستی مەبەستەکە وەڕاست گەڕاوە یا ئالیس دیسان سواری خەیالآت بووە؟ ویۆلێت هەرکە گوێی لێ بوو گوتی هەر لە سەرەتاوە دیار بوو یووپ کەیفی بە ئالیس دەهات. ئەی ئێمە هۆشمان لە کوێ بوو؟ چاو ئەمن کە پێوە بووم بۆ ویۆلێتی پێ بڵێم، دەی جا، بێ جێش نەبوو. ئالیس فەڕزتر بوو.» قاقا پێکەنی. پاشان دەنگی هێناخوار و دەستی بە سرتە سرت کرد چەند جار بیستم گوتی «ئێمیل سیمۆنیان» و تا گوتم «چیت گوت؟» بە دەنگی بەرز گوتی "هیچ، ئەورۆ ئێوارە دێی سەرێکی بازاڕی بدەین؟ سووفی جەنەی کڵاوی بێرەی* گرتووە." و بێ ئەوە دەرفەتم بدا بڵێم دێم یا نایەم گوتی «کەوابوو هەتا ئێوارە ماڵآوا. ویۆلێت سڵاوی دەگەیاندی. تا ئێوارە ماڵآوا.»

ئەوەی کە ئالیس رووداوێکی کە هێشتا نەڕێسرابوو نە پێچرابوو بۆ هەموان بگێڕێتەوە شتێکی سەیر نەبوو. بەڵام نینا لەبابەت ئێمیلەوە چی گوت؟ بۆ سرتە سرتی بوو؟ بۆچی گوتی دوایە دەیلێم؟

چوومە حەوشەی پشتەوە.

سەرێکی سەوزیە چاندراوەکانم دا و چەند دانە تەماتەم لێکردەوە. سەرم هەڵێنا و چاوم لە دارمۆرتك بڕی دوو هێلانە پاساری لەنێوان لقە دارەکاندا دیار بوو. پاساریەکی گۆشتن و خرپن فڕییە یەکێك لە هێلانەکان. شتێکی بە دندووکییەوە بوو. دەنگی جیوە جیوێکی نزم لە هێلانەکەوە هات. پێم وابوو دانەوێڵەی بۆ بەچکەکانی برد. هەوا گەرم بوو و گشت شوێنی بێدەنگ زۆرپامەوە ژووری. لەژێر لێوەوە گۆرانیم دەچڕی.

بۆ بەرشێوی منداڵان خۆیان گوتەنی ساندویچی "پەنیری نێوفێر"م دروست کرد. رۆڵی پەنیری وەرەقەییم لەسەر کوتەنانان رۆکرد و نانەکانم خستە نێو فێر. چاوەڕوانی بریشتە بوونی نانەکان و توانەوەی پەنیرەکەمام، خۆم بە خۆمم دەگوت تا ئێستا چەند جار بەرشێو؟ چەندجار فراوێن؟ چەند جار شێوم دروست کردووە؟ جیڕەی دەرگە ئاسنییەکە و دەنگی راکردنیان لە رێگە باریکەکەوە هات.

سووفی گوتی «دایکم گوتی بێمە ماڵی ئێوە. ئێستا خۆشی دێ.»

گوتم «دەست و چاویان بشۆن، بەرشێو بخۆن و بۆ کلاسی پیانۆ تەیار بن.

ئارمینە گوتی «چەن خۆش دەبوو سووفیش لەگەڵمان هاتبایە کلاسی پیانۆ.»
ئارسینە گوتی «زۆر خۆش دەبوو سووفیش لەگەڵمان هاتبایە کلاسی پیانۆ.»
هەردوو روویان دە سووفی کرد. ئارمینە گوتی «لەدەس فارسی ئاخۆتنی میس جوودی ـــ » ئارسینە رستەکەی تەواو کرد.«دەمری لە پێکەنینیان.»
بانگم کرد «ئارمەن، بەرشێو.» لە پشت دەرگەی ژووره وە هاواری کـرد «برسـیم نییـە.» کیژەکان سەبرێکی پێکەنین و هەتا چاوم لێکردن ئارمینە گوتی «بە خوا ئێمە نـازانین ، بـەڵام ـــ » ئارسینە درێژەی پێدا «بەڵام بیستمان لەگەڵ ئێمیلی ئاشـتی بۆتـەوە.» سـووفی گـوتی «رەنگە هەر لەبەر ئەمە نەبێ.» هەرسێ پێکەنین. بەرەو دەنگی زەنگی تەلەفۆنەکەوە چووم.
خاتوون سیمۆنیان گوتی ئێمیلی کلاسی پیانۆی هەیـە و لـە ئێمیـل ـــ ی بیسـتووە کـە دووانەکانیش کلاسی پیانۆیان هەیە و ئێمیلی هاوڕێی دووانەکان بێتە کـلاس چـونکو ئێمیـل کارێکی بۆ هاتۆتە پێش و درەنـگ دێتـەوە مـاڵ و بۆخـۆی پشـتی دێشـێ نـاتوانی ئێمیلـی بگەیەنەتێ. نە "تکا دەکـەم"، نـە "ئەگـەر بۆتـان زەحمـەت نییـە"، تەنانـەت نـە سـڵاو و ماڵاواییەکی بەڕێ و جێ.
هێشتا بە تەواوی گووشییەکەم دانەنابوو کە ئارمەن لـە ژوورەکەیـەوە دەرپـەڕی. "بچـمە شوێن ئێمیلی؟» برۆیەکانم کە هەڵتەکاند وە منە من کەوت. «ئەوشتە ـــ ئێمیلی لـە پاسـدا گوتی کلاسی پیانۆی هەیە و وانێکە ـــ ئەمن لێبڕام دیسان فێرە پیـانۆ بم.» پـیش خـواردنم لەبەر بێ شەرمی خاتوون سیمۆنیان لەبیرچوو و بە بینینی سـەرو سـەکوتی ئارمـەن پێکـەنین گرتمی. هەر لەو کاتەدا نینا دەرگەی ماڵەوەی کردەوە. «وەی! وەی! برژام لە گەرمان.» ئارمەن سڵاوی کردبوو یا نەیکردبوو بە نێوان هەردووکماندا تێپەڕی و لـە دەرگـە چـووە دەر. هێشـتا نەگەیشتبووە بەر دەرگەی حەوشە هاواری کرد «لە ئیزگە دا چاوەڕێتانین.» نینا چاوی لە مـن کرد. «ئەوەیان چی لێهاتووە؟» چاوم دەساپییتە بڕی. «ئاشق بووە.» چـاوەڕێی قاقاکـەی بـووم بەڵام تەنیا سەری هەژاند. «هەردەڵێی ئەم رۆژانە شتێکیان تێکەڵ ئـاوێ شـار کـردووە.» روو وەو چێشتخانە هاوارم کرد «منداڵینە وەرێکەون.»
ئێمیلی فانیلەی چەرموو و شاڵواری رەشی پۆشـیبوو و کتێبـە نۆتـەکانی بـە سـنگییەوە گرتبوو سەری بەر دابۆوە و پاڵی وە میلەی نیشانەی ئیزگەوە دابوو. بـەردێکی بچـکۆلەی بـە نووکی پێڵاوەکەی دەهێنا و دەبرد. قژە ساف و لووسـە درێژەکـەی بـە دەموچـاویدا کشـابوو. ئارمەن بە پێش ئێمیلی دا دەهات و دەچوو و دەستەکانی رادەوەشاند و قسەی دەکـرد و هـەر

که ئێمه گەیشتینێ بێدەنگ بوو. ئێمیلی خێرا سەری بەرز کرد و سڵاوی کرد. قژەکان بە دوو لا جانگیدا* شۆڕبۆوە. نینا گوتی «منداڵێکی چەندە ناسك و نازدارە.» لە دڵی خۆمدا گوتم «منداڵ؟» ئێمیلی بۆ چەند ساتێ چاوی لێکردم. بۆچی هەستم کرد بیرمی خوێندۆتەوە؟ نیوەی قژەکانی وەپشت گوێی داو پێکەنی. پێکەنینێکی شێوەی پێکەنینی دووانەکان ، ئەوکاتە کە شتێکیان دەخواست.

پاس گەیشتێ. دەگەڵ سوار بووم شۆفێر سڵاوی کرد. بە دیتنی سەرم سوڕما، «سڵاو ئاغا عەبدی. ئەتۆ لە خەتی پالاوتنگە کارت دەکرد؟» پێکەنی. «چ بکەم خاتوون؟ پێشکەوتووین. ئەتۆ چاکی؟ سلامەتی؟ لەگەڵ زەحمەتەکانی ئێمە؟» گوتم «زەحمەتی چی؟ منداڵەکە باشتر بووە؟»

منداڵەکان یەك بە یەك گوتیان «پاس» و بە پێش شۆفێردا تێپەڕین. ئاغای عەبدی پێکەنی و گوتی «پێرێ مسافری تارانیم هەبوو. بیستی کە مسافرەکانی کۆمپانیای نەوت شتێکی دەڵێن و پوولی بلیت نادەن، لەباتی «پاس» گوتی «ماس.»

پێکەنین و ئاغای عەبدی دوگمەی داخستنی دەرگەی لێدا و رووی دەمن کرد. «زۆر شوکر منداڵەکە باشترە. هێنامانەوە ماڵ. خاتوونی خوشکتان خۆشەویستییەکی زۆری نواند. سوپاس.» نینا لە پشتەوە سیخورمەیەکی تێکوتام. «دەبڕۆ دەی.»

تەنیا چەند کەس دە پاسەکەدا بوون. سووفی و دووانەکان چوونە بنەبانی پاس. ئارمەن و ئێمیلی لەسەر ئەسکەملی پشت شۆفێر دانیشتن و نینا پاڵیدامە لای ئەسکەملێکی دوور لە منداڵەکان. ئەوە دەمگوت «زارۆکەکەی ناساز بوو. بە ئالیسم گوت کە نەخۆشخانە ــــ» نینا پەڕییە نێو قسەکەم. «باشە، ئەگەر ئەتۆ لەگەڵ گشت شۆفێر و باغەوان و لوولەکێشەکانی کۆمپانیا دۆست نەبووبای و بە هەموویان رانەگەیبای، رۆژمان لێ نەدەبۆوە؟» چاوێکی لەپشتەوە کرد و سەری هێنابن گوێم «باسی جینارە تازەکەتم بۆ بکە. مەگین ناوی سیمۆنیان نییە؟ مەگین هاوسەرەکەی نەمردووە؟»

بۆ چەند ساتێ چاوم لێکرد. بۆ زووتر لە مەبەستەکەی نەگەیشتبووم؟ ئێستا تیگەییم بۆ یەگجێ وازم بەسەرچوو؟ هەوا بۆچی هێندە گەرم بوو؟ بۆ نەدەگەیشتینێ؟

ماڵە میس جوودی لە بووارەدی باشوور بوو، تا گەیشتینە ئیزگەی ماڵەکەیان، هەرچی لەمەڕ دانیشتووانی جی چوار دەمزانی بە نینام گوتبوو. بەر لەوە بگاتە ئیزگە وەستام، زەنگی دابەزینم لێداو بە نینام گوت هەتا کلاسی منداڵەکان تەواو دەبێ دەچین کلاو بۆ سووفی دەکڕین

و دەگەڕێینەوە. نینا وەك گێژان چاوی لێکردم. «کڵاو؟» منداڵەکانم حاڵی کرد دابەزن و نیناش کە هێشتا هەر دانیشتبوو پێم گوت «هەستە، گەیشتینێ. خۆت گوتت دەتەوێ کڵاوی بێرە بۆ سووفی بکڕی.»

هەستا. «جارێ کاری پێویست تر لە کڵاو کڕینم هەیە. بزانم، پێنج شەممەی شەوێ خۆ میوان نی؟» هەتا گوتم «نا،» گوتی «کەوابوو میوانت هەیە.»

ماڵاواییم لە شۆفێر کرد، دووای هەمووان دابەزیم و بە خۆمم گوت «ئەو گەرمایە و کڵاوی بێرە؟ دایکم گوتەنی پێم بڵێ کەر.»

# ٢٨

پاس لە ئیزگەی ماڵی ئێمە وێستا و دابەزین. ئێمیلیم دی کە لەگەڵ منداڵەکان بەرەو ماڵەمە دەهات. بەر لەوە قسەیەك بکەم گوتی «دایە گەورە گوتی چەند سەعاتێ بێینە ماڵی ئێوە.» لە دڵی خۆمدا گوتم «دایە گەورە تەکلیف بۆ هەمووان دیاری دەکا.»

چوومە چێشتخانە و دایکم و ئالیسم دی کە بەر لە ئێمە گەیبوونێ. گەلێك جار بە دایکمم گوتبوو کلیلی زیادیم بۆ ئەو ڕۆژانە لە لا جێهێشتوون کە لە گەشتین و ئەگەر شتێك قەوما بتوانن دەرگە بکەنەوە. فایدەی نەبوو. دایکم و ئالیس فێر ببوون هەمیشە بێ ئەوە لە هاتنی خۆیان ئاگادارمان بکەنەوە، ئەگەر کەسێ لە ماڵ نەبووایە کلیلیان دەخستە سەر و وەژوور دەکەوتن.

ئالیس دانیشتبوویە پشت مێز و بڕبەندی* لە نینۆکی دەدا. دایکم وەسەر ئەسکەمل کەوتبوو و تۆزی گۆزە گڵێیەکانی سەر قەفەزەکانی دەتەکاند. کە وەژوور کەوتم سڵاوی لێم وەرنەگرتەوە گوتی «ئەمان لە دەس خۆت و ئەو زڕ و زبڵانەی لە هەموو شوێنێکی ماڵەوە ڕێزیان دەکەی. وەك خوالێخۆشبوو.» گوتم «کێ پێی گوتی وە سەرەوەی کەوی؟ ئاشخێن حەوتووی پێشتر تۆزی قەفەزەکانی تەکاندووە.» دایکم هاتە خوار. «تۆز تەکاندنی ئاشخێن بە دەردی خۆی دەچارێ.» و لەگەڵ نینا چاك و خۆشییەکی گەرمی کرد. کەوابوو دڵ ئێشی لە نینا خەلاس بوو. دەنگی شۆڤرلێتی ئارتووش هات.

نینا و ئالیس یەکتریان ماچ کرد و نینا هەواڵی میوانداری پێنج شەممە شەوی راگەیاند. سووفی و دووانەکان چەپڵەیان لێدا و خۆیان هەڵاویشت. «ئەی گیان! میوانی.» هێور هێور بەرەو ئێمیلی چوون. ئارمینە گوتی «دەبێ ئەتۆش بێی.» ئارسینە گوتی «دەبێ بێی.» ئارمەن لە ئێمیلی روانی. ئێمیلی سەری داخست. «ئەگەر دایە گەورە ئیزن ـــ » نینا گوتی «نیگەران مەبە، دایە گەورە و باوکیشت بانگێشتن کراون.» ئالیس بە بێ نەینووك لێوی سوور دەکرد. «یووپ ئارای لەگەڵ ئەو چێشتانە دەهات کە بە ماست دروست دەکرا.» دایکم گوتی «کلاریس فسنجانی بۆ دروست دەکا.» کەوابوو دڵ ئێشی لە مێرە هولەندییەکەش خەلاس بووبوو.

ئارسینە گوتیە ئارمینە «ئێستاش لاسایی لەمیس جوودی. زووکە، لاسایی لە میس جوودی.» ئارمینە هەستایە سەر پەنجە و تلی دۆشاو مژەی بۆ لای ئارمەن راداشت. «ئەوجارە بەڕاستی لێبڕاوی پیانۆ فێر بی یا دیسان دەس بە هارو هاجی* دەکەی؟» ئارسینە لەجیاتی ئارمەن وەڵامی داوە «تەمای راستیم گرتووە.» ئارمینە برۆکانی هەڵێناوە و زاری چکۆڵە کردەوە. «کەوابوو لەگەڵ ئیمێلی لێرە لەنێو "لیۆینگ روم" بە هەتا بانگت بکەم.» سووفی دەستی نایە سەر سکی بە پێکەنینەوە گوتی «هەر دروست ئاوای گوت.» نینا نقورچێکی لە کولمەی ئارمینە داگرت. «هەی بەڵا لێدراو.» دایکم گوتی «بە قوربانی سەر و زمانت.» ئالیس لوولەی ماتیك و برپەندی نینۆك بە دەس لەگەڵ پێکەنین دووقەد بۆوە، ئێمیلی لەبنەوە چاوێکی لە ئارمەن کرد و ئارمەن گوتی «هە هە هە.»

ئارتووش وەژوورکەوت و دووانەکان خۆیان دە باوەشی هاویشت و گوتیان «پێنج شەمەی شەوێ میوانمان هەیە. سووفی و ئێمیلی و هەموو و هەموو ـــــ »

هەر لە کلاسی پیانۆوە هەتا ماڵ ویستبووم باخۆم، ویستبووم بێژم «نا» و نینا ماوەی پێنەدا بووم. ئێستاش هەتا زارم کردەوە، دەستی نایە سەر شانم. «خۆم یارمەتیت دەدەم. پێویست ناکا دەس لە رەش و سپی بدەی.» پاشان دەستی نایە سەر پشتم و دەکرێ بێژم بەرە و چێشتخانە پاڵیدام. ئەتۆ هەر بچوو جینارەکان بانگ بکە. ئەویدی لە ئەستۆی من.»

ئارتووش دووانەکانی ماچ کرد و گوتی «خراپیش نییە. ئەمن و ئێمیل شەترەنج دەکەین.» لە چێشتخانە وەدەرکەوتم و گوتم «بریا پیادە رەشەکەم فڕێدابایە نێو زبڵدان.»

نازانم دەرگەی ماڵم بە دوای خۆمدا داخست یا نا. بە ڕێگە باریکەکە دا تێپەڕیم، دەرگـە ئاسنییەکەم کردەوە و لەجیاتی چـوونە ئەوبـەری شـەقام، بـە ڕەخ جۆگەلـەی ئاوێـدا بـەرەو مەیدانەکەی جەرگەی گەڕەکدا وەڕێکەوتم.

لە دەس نینا تووڕە بووم کە بە خورتی* مەجبووری کردبووم میوانی بـدەم. چـونکە خـۆی گوتەنی مەبەستی بوو ویۆڵێت و ئێمیل لەگەڵ یەك ڕێك بخا. لـەدەس ئـالیس کـە هـەر لـەبیر خۆیدا بوو و لە دەس دایکم کە دەفکری ئالیس دا بوو و لە دەس منداڵەکان کە خۆشحاڵ بوون و لەدەس ئارتووش کە هەر لەبیری شەترەنج دابوو، تووڕە بووم. بۆ کەس لەبیری من دا نەبوو؟ بۆ کەس لێمی نەدەپرسی چیت گەرەکە؟

لایەنی دلۆڤانی بیرگەم پرسی «تۆ چیت گەرەکە؟» وەڵامم داوە «دەمەوێ چەند سەعاتێکی ڕۆژێ تەنیابم، دەمەوێ لەمەڕ ئەو شتانەی کە حەزم لێیانـە لەگـەڵ کەسـێ بـاخۆم.» لایـەنی ڕەخنەگر جومگەمی گرت. «تەنیا بی یا لەگەڵ کەسێ باخۆی؟»

بە قەراخ دارێکی «ئوکالیپتووسـدا» تێپـەڕیم. دەسـتم راداشـت و گەڵایـەکم لێکـردەوە. چەمۆڵەم کرد و بۆنم پێوە کرد. چەند هەنگاو ڕۆیشتم و گەڵا پووچاوەکەم خستە نێـو جۆگـەی ئاو. گەرەکمە بزانم مێری چیرۆکی ساردۆ ئاخرییەکەی چ هەڵوێستێ دەگـرێ. گـوتم و پازمـدا دوواوە. هێندەی نەمابوو پێ بنێمە سەر بۆقە مردوویـەك کـە لـە جەرگـەی پیـادە ڕێـدا بـە عەردییەوە پان ببۆوە، دەتگوت تەگەرێکی پانی بەسـەردا ڕۆیـوە. لـە ژێـر لێـوەوە ورتانـدم. «نەحلەت لەو شارەی بەو گشتە بۆق و مارمیلکە و مارگەلە ئاوییە زیندوو و مردووەی.»

تووڕە و بێ واز و بە بۆڵە بۆڵ هەنگاوم نا هەتا گەیمە مەیدان، زەردە پەڕیبوو بەڵام هێشـتا هەر گەرم بوو، بۆنی قوڕ و لیتاو لـە جۆگـە پـان و بەرینەکـەوە دەهـات. لەسـەر یـەکێ لـە قەنەفەکانی دەوری مەیدان دانیشتم. پشت سەرم ریزێك داری بێعار و پنچـکە ژالـەی* گوڵـە چەرموو و چێرەیی لێبوو، پشیلەیەکی لەڕ لە ژێر سەرچاوەی ئاوی نێوەڕاست مەیداندا وەدوای شتێ کەوتبوو. بۆقێك یا ڕەنگە مارمیلکەیەك.

بایەکی زۆر گەرمی دەهات و تۆوێکی شێوە لۆبیا لە دارێکـەوە کەوتـە سـەر کۆشـم. بـۆ ساتێ وەمزانی کرم یا کوللەیـە و زووەکـی تووڕمـدا عـەردی بیـزم بـۆوە. لـەو دەمـەوە کـە هاتوومەتە ئاوادان پێم وایە ژیانم بە گشـتی بۆتـە بەربـەرەکانی هەمیشـەیی لەگـەڵ هـەموو چەشنە جڕ و جانەوەرێك کە هـەر لـە منداڵییـەوە لێـی بێـزار بـووم و ئێسـتاش هـەر هـەم. هێڵنجیش بە هۆی هەموو جۆرە بۆیێکەوە هەر هەبووە. بۆی گازی پاڵاوتنگە ، بـۆی زلکـاوی

جۆگەکان، بۆی ماسی و مێگووی خوێی سوود کە تێکەڵی عەتری عەرەبی بازاڕی کوێتییەکان دەبێ، هەر جارەی کە دەچوومە بازاڕ حاڵمی دەشێواند و لەگەڵ هەموو ئەوانە و زێدەتر لە هەمووی ئەوانەش، گەرما و شەرجی بوونەکەیەتی. بۆ هاتمە ئەم شارە؟ بۆ لە تاران نەمامەوە؟

ماڵەکەی تارانم بیر کەوتەوە. بەو حەوشە چکۆڵەوە چەندە کەشخە بوو. کۆڵانەکەمان و چنارە بەرزەکانیم بیر هاتەوە. هاوینان ئەودەم کە ئێمە یا یەکێ لە جینارەکان دارەکانمان ئاو دەدا، بۆی گڵی تەڕ بەرز دەبۆوە. بەیانییەکانی زستان، هێشتا لە قەرەوێلە نەهاتبوومە خوار دەمزانی بەفر باریوە. ئەو بەیانییانەی بەفر باریبوو ئەو رووناکاییەی کە لە پەنجەرە را وەژووری دەکەوت لەگەڵ رووناکایی رۆژانی بێ بەفر جودا بوو. کەوتمەوە بیر ئەو رۆژانەی کە لە زستاندا بەو کڵاو و دەستەوانە و شاڵگەردنە پەشمیانەی کە دایکم چنیبوونی دەچوومە قوتابخانە. دەنگی کرە کرِی بەفری ژێر چەکمەکان چەندە خۆش بوو، چەند ساڵێك بوو بەفرم نەدیبوو؟ چەند ساڵێك بوو پاڵتۆم نەپۆشیبوو و دەستەوانەم دە دەستی نەکردبوو؟ دەستم لەبەر سۆبە گەرم نەکرد بۆوە و لە کۆڵاندا پشووم دەرنەدابوو کە هەڵمم لە زاری هەستێ.»

مێشوولەیەکی کە خەریك بوو بخزێتە کونە لووتم، رەواندمەوە. ئاخر بۆچی هاتم؟ بۆ لە تاران نەمامەوە؟ چونکە ئارتووش لە کۆمپانیای نەوت دامەزرا، چونکە ئالیس لە نەخۆشخانەی کۆمپانیا کاری پەیدا کرد و چونکە دایکیشم لەگەڵ ئالیس هاتە ئابادان. دایکم بۆ ئەوەی لەگەڵ ئالیس بێ هاتە ئابادان یا بۆ ئەوەی نزیك من بێ؟ تا ئێستا چ کەسێ کارێکی هەر تەنیا بۆ من کردووە؟ خۆم لە تەمەنی سی و هەشت ساڵیدا چ کارێکم تەنیا بۆ خۆم کردووە؟

هەوا وردە وردە بەرەو تاریکی دەچوو. نە کەسێ دەهات، نە کەسێ دەڕۆیی. لە نێوان شمشادەکانی دەوروبەری حەوشەکان چرای ماڵەکانم دەدی کە یەك یەکە هەڵدەبوون. وەر سووڕامە لای شەقامەکەی خۆمان. دەبوایە گەڕابامەوە. لە گومانی ئەو کارانەی کە دەبوایە بیکەم دڵم گیرا. دروست کردنی شێو، داڕشتنی بەرنامە بۆ میوانی پێنج شەممە، باس لەگەڵ ئارمەن کە بێشك هەوڵی دەدا ئەو شاڵوارەی کە لە مێژ بوو دیاریم کردبوو هەتا پێنج شەممە بیکرِم و گرینگتر لە هەمووی ئەوانە بانگێشتنی خاتوون سیمۆنیان. لە دڵی خۆمدا گوتم «ژنەتیوەی لە خۆڕازی و داواکار. پێی وایە هەموو قەرەواش و خزمەتکاری ئەون.» بریا لە بری هەمووی ئەوکارانەی کە پێم خۆش نەبوو بیکەم و دەبوایە کردبام، دەکرا دەنێو راحەتییە

سەوزەکە دا مەلاس بوومایە و دەمزانی مێری چیرۆکی ساردۆ لە نێوان ئـەوین و دەروەسـتیدا ئاخیرەکەی کامیانی هەڵدەبژێری.

تارماییەك لە خوارەی پێچی شەقام بە دیار کەوت. تێکرا بووم، هەواکەی بوومـەلێڵ بـوو چاکم نەدەدی. بێگومان یەکێ لە منداڵەکان بوو. بێشك نیگەران ببـوون، وەڕێکـەوتم، پاشـان وەك بڵەی نەڵەی رامکرد، ئـەوجار وەسـتام، خـاتوون سـیمۆنیانیش وێسـتا، کراسـی پێسـیر داخراوی چەرموو و شاڵواری رەشی دەبەر کردبوو. هەروەك ئێوارەی ئەو رۆژە. بەو پێڵاوە پانیە تەختەوە بەژنی کورتتر لە هەمیشە دەینواند.

بۆ چەند ساتێ جووڵەی لێبڕا. پاشان هەر بەو رێگەیەیدا کە دەڕۆیی دیسـان وەڕێکـەوت و بێ ئەوە چاوم لێبکا گوتی «کەوابوو تۆ پیادە رەویت پێخۆشە.» پرسیاری نەدەکرد. تێمـابووم کەچ بکەم، لەگەڵی بچم، نەچم ، وێستا و ئاوڕی داوە. «دەتویست بگەڕێیەوە مـاڵ.» دیسـان پرسیاری نەدەکرد. «بە یەکەوە پیاسەیەك بکەین؟» ئەوجار خەریك بوو بە شەرمە حزوورییەوە پرسیاری دەکرد.

لەگەڵی وەڕێکەوتم و لەوەی کە لە دڵی خۆمدا گوتبووم «ژنەتیوەی لەخۆرازی داواکار» بـە خۆم داشکامەوە. دەنگی جۆرێك بوو کە دڵـم پێـی سـووتا. هـەتا مەیدانەکـە بـە بێـدەنگی رۆیشتن. جینارەکەم بەرەو قەنەفەیەك چوو کە ماوەیێ لەمەوبەر لەسەریدا نیشـتبووم. «لێـرە دانیشین؟ ماندوو بووم.»

زۆر بە سانایی دانیشت. قەنەفە بۆ ئەو بەرز بوو، بەڵام خۆی هەڵناویشت، سەبرۆکە خـۆی هەڵکێشا و دانیشت. گوتم دەبێ تەمەنێك مەشقی کردبێ. تەمەنێك مەشق تەنیا بۆ دانیشتن.

دنیا تاریك داهاتبوو گەرم بوو و بای نەدەهات، دەنگی قیڕە قیڕی بـێ نێـو بـڕی بۆقـان و شڵپەی هەڵبەز دابەزیان لەنێو چەمدا دەبیسرا. دەستم بۆنکرد. هێشتا بۆی کالیپتووسی دەدا.

دووچەرخە سووارێك بە دەوری مەیداندا دەخولایەوە. قتوویـەکی مـەزن لـە دووچـەرخەکە قایم کرابوو. حاجی بوو، یا منداڵ گوتەنی "نوونی". پیرە مێردێکی کە بـەیانیان و ئێوارانـە نانی لەواشی لە گەڕەکەکانی کۆمپانیای نەوتدا دەفرۆشـت. بێگومـان دەگـەڕاوە مـاڵ. هـەتا ئەحمەدئاوا، هەتا کۆڵانی تەنگەبەر و پڕ لە خاك و خۆڵی ماڵەکەی، دەبووایە سەعاتێك زیـاتر پێداڵ لێ بـدا. چـەند سـاڵ لەمەوبـەر کـە کوڕەکـەی دەچـۆمیدا خنکـا، چـوومە سـەردانی هاوسەرەکەی کە حاجی دەیگوت «لە خەفەتیان ئەوە دیق دەکا.» دایکم و ئالیس کـە زانیـان چوومەتە سەردانی هاوسەری حـاجی گوتیـان «شـێتی.» ئـارتووش گـوتی «کـارێکی باشـت

کردووە.» چللەی کوڕە نەچووبوو هاوسەری حاجی ئاوری دەخۆ بەردا و مرد و حاجی دوای دوو مانگ ژنی هێنا. دایکم و ئالیس گوتیان «دیاری بۆ حاجی نابەی؟» و پێکەنین. ئارتووش هەر سەری راوەشاند و ئەمن ئیدی نانی لەواشم لە حاجی نەکڕیەوە.

خاتوون سیمۆنیان گوتی «شارێکی چەند خەفە و مردووە.»

فکرم کردەوە هەر ئێستا لە خێری میوانی پێنج شەممە بگوزەرێم. گوتم «ئەو بنەماڵەیەی بەر لەئێوە دانیشتووی جی چوار بوون ـــــ دوێنێ لە ماڵە مەت دیتن. بڕیار وایە ـــــ »

نەیهێشت قسەکەم تەواو بێ. سەری وەرسووڕاندە لام و زۆر بەڕێو جێ گوتی دیتمن. بێشك گەرەکیانە کوڕەکەم بانگێشتن بکەن، چونکە دەخوازن کوڕەکەم بانگێشتن بکەن، من و ئێمیلیشیان بانگ کردووە و ـــــ بێگومان تۆش بانگ کراوی وە نییە؟ یا بەڵکو میوانداریەکەیان خستۆتە مل تۆوە؟ و زەردەخەنەی هاتێ.

پشووەکەم قوتداوە. بایەکی گەرمی هات و چەند گوڵی چەرموو لە ژاڵەکانی پشت سەرمانەوە بەر بوونەوە. لە ژێر رووناکایی بێ هێزی چرا پایە ئاسنیەکانەوە، روانیمە دارە بێعارەکانی دەوروبەری مەیدان. چۆنی زانی؟

دەستی خستە سەر ئەژنۆم.«کلاریس، ئەتۆم خۆش دەوێ.» یەکەمجار بوو "تۆ"ی بانگ دەکردم. «لەگەڵ ئافرەتەکانیتر جیاوازیت هەیە. سەرنج دەخەیە سەر شتگەلێك کە ئافرەتانی تر نایکەن، شتگەلێکت لە لا گرنگە کە لای ئافرەتانی تر ئەمە نییە. هەروەك خۆم، دەکرێ بێژم وەك سەردەمی گەنجی خۆم.»

ئەوەی کە وەك خاتوون سیمۆنیان بم دوایین بیرێك بوو کە دەشیا بە زەینم بگا و دوایین ئاواتێکی کە رەنگە هەمبێ. بۆچی ئەم چەند رۆژانە هەموو لایان وایە شێوەی کەسێك دەدەم. نینا دەیگوت شێوەی ویۆلێت و ئێستا

دەستی لەسەر ئەژنۆم راکرد. «ئەم شارەم پێخۆش نییە. گەلێك ساڵە هیچ شارێکم پێخۆش نییە. لەبەر ئێمیل و ئێمیلی دانم بە جەرگمدا گرتووە.» بێدەنگ بوو. پێم وابوو زەلام زەلام نائاخۆی.

زەق چاوی دە مەنبەعی ئاو بڕیبوو. «لەو دەمەوە خۆم ناسیوە هەر دانم بە جەرگمدا گرتووە. لەپێشدا بۆ باوکم ، پاشان شووەکەم، ئێستاش کوڕ و نەوەکەم هیچکات کارێکی پێم خۆش بووە بیکەم نەمکردووە.» دەتگوت لەگەڵ خۆی دەدوا. چاوم بڕیە مەنبەعی ئاو کە

چەشنی مێردەزمەیەکی زەلام لەسەر ئەستوونە ئاسنییەکان و لە زۆر بەرزەوە دە ئێمە دوو ئافرەت رامابوو.

دیسان بە زەردە خەنەوە. «پێت سەیرە؟ ئەتۆش وەك هەمووی ئێمە وای بۆ دەچی لە ژیانمدا هەرچی گەرەکم بووە کردوومە و هەمبووە؟ لەسەر قەنەفە هاتەخوار و وێستا. «وەرە، دەمەوێ پاشماوەی وێنەکانت پێشان بدەم.» و وەڕێکەوت.

نە بیرم لە شێو کردەوە، نە لە نینا و نە لە دایکم و ئالیس، وازی کەسم نەبوو. گەرەکم بوو کارێك بکەم کە خۆشم لێی دەهات بیکەم. دەمەویست وێنەکان ببینم.

دەرگەی ئاسنی جی چوار کریاوە بوو. بە حەوشە دا رۆیشتم. باغچەی لای راست تەژی لە بژار* بوو. گڵی باغچەی لای چەپ تازە وەرد* درابۆوە. فکرم کردەوە «خۆی بژارەکەی کردووە؟ خۆی گڵەکەی وەرد داوەتەوە؟»

نێومالّ تاریك و کپ بوو. خاتوون سیمۆنیان بەرەو ژوورەکانی خەو چوو. لە پالّ پەیکەرەی فیلی خورتووم شکاو وێستا و دەستی بە سەری فیلەکە دا هێنا. «گانێش، خوای بەختەوەری و سامانی هیندووەکانە.» دەستی بە خورتوومی شکاو داهێنا. «دەبینی؟ ئەم بەستەزمانەش لە دەس من هێزی لەبەر دانەما.» دەرگەی ژووری خەوی کردەوە. «ئێمیلی لە مالّ ئێوەیە. ئێمیل بە شوێنی داچووە و بێگومان بۆی دانیشتووە. کیژۆڵە قژ بۆرەکەش لەوێیە؟ لەسەر تەختی دانیشە.» لەسەر تەخت دانیشتم و گوتم «دیار نییە.»

ئالّبۆمێکی قورسی لە ژێرتەخت دەرکێشا، بەرگی ئالّبۆم لە چەرمی سوور بوو، بە کاردۆژەی زێرین و نەقیمی پیرۆزەوە. تا ئەو رۆژە وێنەکەییم نەدیبوو. کردیەوە و هێدی گوتی «دێتەوە. بێشك دێتەوە.» و بۆ چەند ساتێ کپ ما.

روانیمە ژووری بێ شۆق و بڕووکە* کەل و پەلێکی کە لەوێ دانرابوو. دەتگوت خاوەنەکەی هەر ئەو رۆژە هاتووە و هێشتا وێڕا نەگەیوە دایانمەزرێنێ، یا هەموو شتێکی خڕ کردۆتەوە سۆزی بار بکا.

خاتوون سیمۆنیان وێنەیەکی دایە دەستم. مێرێکی گەنج چاکەت و شالّواری چەرمووی لەبەر دا لە جەرگەی هەورەبانێکی* بەرین وێستابوو، پێیەکی لەسەر پێپلەکانی سەرەوە بوو. هەورەبان نەردەی بەردینەی لێدرابوو و گولّدانگەڵی پڕ لە گولّ نێوە نێوە لەسەر نەردەکە ریز کرابوو. مێرە گەنجەکە بەرەو رووی دووربین بە رمزەی دەهاتێ. پێدەچوو چاو کالّ بێ.

خاتوون سیمۆنیان گوتی «ماڵمان هەر لە پێشەوەی ئیسفەهان بـوو. ئـەو ماڵـەی دایکـت گوتی حەیف بوو فرۆشتم.» تاڵە زەردەیەکی هاتێ. لە هەموو شوێنێکی جارز بووم. لە بـاغ ، لە هۆدە ساپیتە بەرزەکان، لە دالآنە عەرد دارینـەکان، یـەك یـەکی کـەل و پەلـە بەقیمـەت گرانەکان. باوکم دەیگوت ئیتر چیت گەرەکە؟ هەتا گـەلێك سـاڵ نەمـدەزانی چـیم گەرەکـە و ئەودەم کە زانیم و داوام کرد گوتی نا.»

وێنەیەکی تری دەلامکرد. هەر ئەو مێرە گەنجە لەپشت مێزێکی تەژی لە کتێب و قاقەز ، قەڵەمێکی دە دەستێکی دابوو و دەستەکەی تری نابووە ژێـر چـەناگەی و چـاوی لـە دووربـین بڕیبوو. قژی بە سەریەوە پان ببۆوە و جلیتقەی ڕێ ڕێی لەبەردا بوو. خەریك بـووم بـیرم لـەوە دەکردەوە چەشنی ئەم چاکەت و شاڵوارەم لەبەر ئاغای داوەتیاندا دیوە کە جینارەکـەم وێنـەی سێیەمی دایە دەستم. مێری گەنج ئەمجارە کراسی چـەرمووی پێسـیر کـراوەی فرەوانـی لەبـەر دابوو، وەك کراسە رووسیەکان. قژەکانی بە سەر شانیدا هاتبووە خوار و ردێنێکی تەنکی بوو. لە پاڵ ئەسکەملێکی پشت بڵیند دەس بە کەلەکە وێستابوو و دیسـان لـە دووربـین رامـابوو. کیژێکی کەشخە کە قژی لە پاشکە سەری خڕ کردبۆوە لەسـەر ئەسـکەمل دانیشـتبوو. جلـی کیژە بۆر و پێسیر داخراو بوو و چەند ریز مرواری کورت و درێژی لە ملدا بوو. لە ئەژنۆ بەرەو ژێری کیژە لە وێنەکەدا نادیار بوو و بێ شك رەنگی چاوەکانی کاڵ بوو.

کیژەی وێنەکە — دوای پەنجا شێست ساڵ — چاوی لێك نا. «باوکم گوتی شاعیر بە دەردی ژیان ناچارێ، گوتی بە بۆنەی دەوڵەت و داهاتەکەمەوە دەیەوێ زەماوەندم لەگەڵ بکـا. گـوتی کەس ئەویینداری کیژی کورتەبالآ نابێ. بەڵام بـاوکم و شـووەکەم ئەویـنـدار بـوون. ئەویـنـداری سامانی یەکتر. باوکم گوتی ئەگەر نەبمە هاوسەری ـــــ » چاوەکانی لێك کـردەوە و داهاتـەوە وێنەکەی لە دەستم ستاند. «ئەم وێنەمان بەبێ ئیزنی باوکم لە وێنەگری "تۆنی هووانسێن" لە جولفا گرتووە. تۆنی بەڵێنێ دا بە باوکم نەڵێ و نەشی گوت. مێرێکی خاس بوو.» دە وێنەکە راما و لێوەکانی کرۆشت*. چین و چرووکی دەور و بەری لێو فرەتر بوون. دەنگی بۆقـەکان لـە حەوشەوە دەبیسرا.

ویستم بپرسم « و پاشان؟» کە چاوی لێم کرد و بەرمزەی هاتێ. «پاشان؟» ئالبۆمی لێـك کردەوە و پەرەکانی هەڵداوە و لاپەڕەیەکی پێشانم دا. خۆی بـوو و مێـرە گەنجەکـە، پشـت دە برجی ئیفێل لەسەر قەنەفەیەکی ئاسن دانیشتبوو. لە وێنەی تردا خۆی بـوو و مێـری گـەنج، سواری گەردوونەیەکی* دوو کەسی بوو کە مێرێکی رەشتاڵەی فۆتە لەپشت دەیکێشا و وێنەی

دواتریش خۆی بوو و مێری گەنج لە پشت مێزی قاوەخانەیەك لە پیادەڕێی شەقامێکی قەرەباڵغ دا.

قسەکانم دەبیست و چاوم بە وێنەکاندا دەگێڕا. «بۆ هەر شوێنێ بە دوامدا هات. هیندستان ، ئینگلتەرا، فەرانسە، دیسان هیندوستان . شووەکەم کە مرد پێم وابوو سەربەست بووم، پێم وابوو شوو بە کەس ناکەم، پێم وابوو بەختەوەرترین ئافرەتی دنیام.» دەستی بە وێنەکاندا هێنا، پاشان سەبرێکی لاپەڕەی هەڵداوە، گەییە دوایین لاپەڕەکە وێنەیەکی مەزنی تێدابوو. وێنەی گۆڕێك بوو لە گۆڕستانێك بە دارگەلی بەرز و ئەستوور. ئێلمیرا سیمۆنیان بە جل و کڵاو و تۆڕی ڕەش لەپاڵ گۆڕێکەوە وێستابوو، دەس لە ناو دەستی کوڕیژگەیەك کە چاکەت و شاڵواری لەبەر دابوو و بۆیباغی ڕەشی لێدابوو. دەتگوت دەنگی خاتوون سیمۆنیان لە زۆر دوورەوە هات. «دوای چەند مانگ خۆشی ڕۆیی. لە پاریس بووین. لە پێرلاشێز ناشتمان.»

کپ بوو، پاڵی وە سەر کەللەی تەخت دا و دە ساپیتە راما. هەستم کرد لە ژوورێ نییە. پێدەچوو لە نزیك برجی ئیفێل بێ، یا لە کووچە و کۆڵانەکانی بەمبەئی یا لە قاوەخانەیەکی ئینگلتەرا دا. ڕەنگبێ لە گۆڕستانی پێرلاشێزی پڕ لە داری بەرز و ئەستوور دا.

ئالبومم وێك نا و وێنەیەکم راکرد کە لە وێنەگەریدا کێشابوویان. روانینی کیژەکەی نێو وێنە بێ مەیل بوو. مێری گەنج دەتگوت تووڕە بوو و چاوەکانی سەوز یا شین. پرسیم «چاوشین بوو؟» دەستی بە نێو چاوانیدا هێنا، پاشان وێنەکەی لە دەستم ئەستاند و لەگەڵ وێنەکانی تر نایە نێو ئالبۆم و لەجێی رابوو.

بێ ئەوە قسەیەك بکەین هەتا دەرگەی حەوشە رۆیشتین. دەرگەی ئاسن کریاوە بوو، وێستا و پیلی گرتم. «ببوورن. دڵ بە کووڵ بووم. شەو باش.» هەرکە وەرێکەوتم بانگی لێکردم. ئاوڕم داوە بەژنی هێندەی دەرگە ئاسنییەکە بوو. لە تاریکاییدا سەروچاویم نەدەدی. دیسان هەر دەتگوت دەنگی لە دوورەوە هات. «سەوز بوو، هاورەنگی چاوی کوڕەکەی.»

لە شەقامدا تەنیا مام. ڕەنگی شمشاد و دارە بێعارەکان ڕەش دەینواند. شەمشەمە کوێرەکان بە دەوری چراکاندا هەڵدەسووڕان و بۆی گازی پالاوتنگا دەهات.

دەرگەی ماڵم کردەوە و وەژوور کەوتم. هەموو شوێنێ کپ و بێدەنگ بوو. دەرزیلەیەکی سەری لە پاڵ تەلەفۆن کەوتبوو، داهاتمەوە هەڵمگرتەوە. هی ئارمینە بوو یا ئارسینە؟ تێنەگەییم. چۆن دەشیام دەرزیلە سەری یەکێك لەو دوو کەسەی کە تەنانەت قەڵەمەکانیشیان

به یەك رادە دەتراشرا و شوێنی گـەزتنی بێخـی قەڵەمەکانیشـیان وەك یـەك بـوو لێـك جیـا بکەمەوە؟ سنجاقە سەرێکی نەقیم دار لە ژێر مێزی تەلەویزێون درەوشاوە. هی کێ بوو؟ ئیدی ناسینەوەی ئەمەیان دژوار نەبوو. کیژە قژ بۆرەکە.

چوومە چێشتخانە و گوتم ئێمیل ئەوە کەی هاتۆتە شوێن ئێمیلی؟ کەی گەڕاونـەوە مـاڵ؟ چۆن بوو ئاگام لێ نەبوو؟ نینـا و سـووفی کـەی ڕۆیشـتن؟ منداڵـەکان شـێو چـیان خـوارد؟ چ ماوەییێك لە ماڵ نەبووم؟ دە گوڵە نۆکەکانی سەر قەڕنیز رامـام. هێشـتا هـەر گێـژی قسـەو وێنەکان بووم؟ سەرمێز تەژی لە قاپ و شەربەی نەشۆراوە بوو. بەرەڵبێنەم گرێـدا و خـەریکی شوردنی قاپ و قاچاخ بووم. دەنگی پێ لە پشت سەرمەوە هات. خەریکی کـاری خـۆم بـووم. ئارتووش گوتی «لای خاتوون سیمۆنیان بووی؟»

بڕێك ئۆملێتی تەماتە کە دە دەوریەکە دا مـابۆوە رشـتمە نێـو سـەتڵی زبـڵ. لـە کـوێ زانیبووی؟ وەڵامی بیرەکەمم دایەوە. «ئێمیل هاتە شوێنت.»

نەمدەدی بەڵام دەشیام بیهێنمە بەرچاوم. پاڵی وەشـیپانەی دەرگـە دا و دەسـتی دەردێنـە بزنیەکەی وەردەدا و بێگومان دەستەکەی تریشی دەگیرفانیدا بوو.

ئەو دەمانەی دەیزانی دڵمەندم و گەرەکی بوو سەر و بنی مەبەستەکە وێك بخاتەوە هەر ئەو کارەی دەکرد. قەت نەیدەپرسـی «بۆچـی دڵمەنـدی؟» رەنگبـێ دڵمەنـد بوونەکـەم پێوەنـدی بەخۆیەوە نەبێ، هەروەك ئەمشـەو، بـەڵام قـەت نەیدەپرسـی. تـۆزی قـاب شـۆریم دە دەوری هەڵسوو و بە خۆمم دەگوت ئێمیل بە شوێنم داهاتووە نەك شووەکەم.

پایەی مێز لە عەردی خشا. «نازانم ئالیس و دایکت دیسان لەسەر چی شەڕیان کرد و زوو رۆیشتن. نینا ئۆملێتی بۆ منداڵان دروست کرد. چووم گەیاندمنەوە. ماشێنەکە نـازانم دیسـان چیەتی. بە زەحمەت هەڵبوو.»

دەوریەکەم لە ژێر شێرەی ئاو راگرت و لەسەر قاپە ئەستوونیەکە خوێندمەوە: تـۆزی قـاپ شۆری "نۆرمـەن"، لـە بـارە بـۆ شـوردنی قـاپ، مووزاییـك، دەستشـۆری و گـەرماو. ژێـر نووسراوەکە وێنەی "نۆرمەن و یزدەم"ی لێبوو کە کڵاوی "کەپی"* لەسەر بـوو و پێدەکـەنی. هاتم بڵێم «شێرو رێویان مەهێنەوە دڵمەندیم لە دەس تۆوە نییە. هەر هـیچ دڵمەنـدنیم،» کـە گوتی «ئارمەن چێشتی نەخوارد. ئیشـی هـەر نـەدیتراوە و ئارسـینە گریـا.» بەرەڵبێنەکـەم لێکردەوە.

ئارتووش شتێکی لەسەر مێز دەهێنا و دەبرد. جێ شەکربوو یا رەنگە خوێدان. دەمزانی ئەوە خەریکە بە شوێن رستەیەکی تردا دەگەڕێ. رەنگ بوو بپرسێ «سۆزی چ لێدەنێی؟» کاتێ پرسی «خاتوون سیمۆنیان حاڵی خاس بوو؟» دامە پێکەنین. پاشان وەرسوڕام و چاوم لێکرد و وردە وردە گوتم «دەکرێ بڵێم ئێشی هەموو شەوێ ون دەبێ. ئارمەن ئەم چەند رۆژە چێشت ناخوا، چونکە ئەویندارە. ئەمن حاڵم خاس نییە، بەڵام پێوەندی بە تۆوە نییە. خاتوون سیمۆنیان حاڵی خاس بوو بێشك بۆ تۆ سەرنج راکێش.»

چەند ساتێ دەجێ شەکرەکە راما و پاشان دەمن. ئەسکەملی کێشا دوواوە، وێستاو لەو چێشتخانە دەرکەوت. جێ شەکرەکە دەماودم لە سەر مێز کەوتبوو. بوغزم گیرا. گەڕامەوە لای قاپ شۆرییەکە. نۆرمەن ویزدەم هەروا پێدەکەنی.

# ٢٩

ئارمەن و ئارتووش بە یەکەوە لە ماڵ دەرکەوتن. هیچیان ماڵاواییان نەکرد.

لە دالاّندا یەك یەکی نەوارە کلکە مشك ئاساکەی دووانەکانم توند کرد و گوتم «ماڵاوا» ئارمینە خواردەمەنی زەنگی پشوودانی نایە کیفی قوتابخانە و زنجیرەکەی داخست. «تا بەر دەرگە نایەی؟» روومەتیم ماچ کرد و سەرم بادا واتە «نا» ئارڕسینە گوتی «ماندووی؟» روومەتیم ماچ کرد و سەرم بادا واتە «نا.»

ئارمینە کلۆمی دەرگەی لادا. «دیسان تەم و مژە.» روانیمە حەوشە. ئەو دەمانەی مژ زۆر چڕ دەبوو، دووانەکان دەترسان بە حەوشەدا تێپەڕن. وەڕووم نەدەهێنان کە دەترسن. دەستیانم دەگرت، بە حەوشەدا دەڕۆیشتین و گۆرانیمان دەگوت «ئێمە بە نێو هەورەکاندا دەفڕین.»

کلۆمی دەرگەکەم رێك کرد. «ئیمڕۆ هەردووکتان بە نێو هەورەکاندا بفڕن، باشە؟» لە یەکتر روانین ، پاشان لەمن. نیگاکانیان خەماوی بوو و ئەو درەوشاوییەی جارانیان بە دیارەوە نەبوو.

لەو بەرەی دەرگەوە چاوم لێکردن کە دەستی یەکتریان گرتبوو و تا نیوەی ڕێگە باریکەکـە ڕۆیشتن و پاشان دەتگوت دەنێو مژەکە دا ون بوون. دەرگە ئاسنییەکە نەدەبینرا و لەرینــەوە و دارە بی و بەشێك لە چیمەن شێوەی وێنەگەری ئاوڕەنگی دەدا. سووك و نادیار.

ئەوەم بە زەین گەیی کە بۆچی ڕۆژان ئاسا هەتا ئیزگەی پاس لە تەك منداڵەکانم نەچـووم؟ بۆچی نیگەرانم کردن؟ ئەمن وەڕەز و بێ وازم، منداڵ چ تاوانێکیـان کـردووە؟ لایـەنی دڵسـۆز گوتی «ئەتۆش ئادەمیزادی. ئەتۆش مافی ئەوەت هەیە بێ واز بێ. ئـەتۆش ـــــ » تەلـەفۆن زەنگی لێدا.

خاتوون نوروڵلایی گوتی «ئەگەر دەرفەتتان بێ، ئیمڕۆ بـەیانی بێمـە لاتـان» قاسـم تێـرە چارەگداری پێدەوێ، هەر ئەوەمان کەم بوو. بە دوای بیانوو دا گەڕام. «لەسەر کار نین؟» گوتی «ئیزنم لەبەر پرسـەکەم وەرگرتـووە، بەرپرسـێکی مەشـرەف خۆشـم هەیـە. خـۆ دەیناسـن؟» پێکەنینی بە گاڵتەکەی خۆی هات. لە دڵی خۆمدا گوتم «زۆر شـوکر بەرپرسـەکەت تەنانـەت لەگەڵ یەکێك مەشرەف خۆشە.» بەر پرسەکەی بـە دوای نخـوون کردنـەوەی جـێ شـەکرییەکە زمانی دەزاریدا نەگەڕابوو. بە دوای بیانوویێکی ترەوە بووم. «گەرەکم بوو ئیمڕۆ بچمە شار کە ـــ » گوتی «چ لەوە باشتر، ئەمنیش دەمەوێ شت بکـڕم. سـەعات دە لـە میلکبـار یـەکتر دەبینین.» هەتا ویستم بیانوویێکی تر بهێنمەوە، بە سـێ رسـتەی درێـژ سوپاسـی کـرد و بـە وشەیەك ماڵاوایی و گۆشی یەکەی دانا.

هەتا سەعات دە دەرفەتێکی زۆرم بـوو. ڕۆژی گـۆڕینی مەلافـەکان بـوو. چـوومە ژووری ئارمەن.

هەوڵم دا گوێ نەدەمە پرش و بڵاوی ژوورەکە. وێنە دەچـوو پـێڵاو و گـۆرەوی و کتێـب و گۆڤار و سەفحەی گڕام و شەربە بەتاڵەکانی شیر بهێنێتەوە چێشتخانە. دەرپێی چەمۆڵە کراو و چەند کتێب و کتێبۆکم لەسەر تەخت راکرد و مەلافەکەم بەسەر دۆشەگەکە داکێشـا. دۆشـەك جووڵایەوە و قاقەزێك بەربۆوە. پێم وابوو دیسان پەڕەی تاقیکردنەوەی مانگانەیە چونکە نمرەی کەمی سەندووە شاردوویەتەوە. وەك لەیستۆکەکانی دووانەکان کە بە بڕوای خـۆی لـە شـوێنی سەیر دا دەیشاردەوە، لە پشت دەرگەی کۆلێرو لەسەر قەفەزەی دەرمانەکانی ژوورەوەی حەمام و ژێر فەرشی ژوور دا لەم چەشنە پەڕانەم کەم نەدەدۆزیەوە. لێکم کردەوە و یەکـەم دێـرم کـە خوێندەوە زانیم نامەیە بە خۆمم گوت نابی وەیخوێنم. بـە خـۆمم گـوت خوێندنـەوەی نامـەی دیتران تەنانەت نامەی منداڵەکەم کارێکی چەوتە و نابێ وەیخـوێنم و خوێندمـەوە. لـە خـەت

لێدراوی و دووپاتە بوونەوە و قرتاندن و وشەی زیادی را دیار بوو چیرۆکنووسی نامە سەرەکییەکەیە.

ئێمیلی ژیکەڵەکە کەشخەتر لە هەمووانی ـــ هەتا دوایین رۆژی ژین لەبیرت ناکەم. لەسەر بڕیاری تۆ ئامادەم هەتا ئەو پەڕی دنیا لە تەکتەوە بێم و لە چنگی دایە گەورەی زۆردار و باوکی بێ بەزە رزگارت بکەم. ئەمنیش لە دەس خوشکانی نەزان و دایکم کە هەر دەزانێ رەخنە بگرێ و چێشت لێ بنێ و گوڵ بچێنێ و ببۆڵێنێ و باوکم کە هەر پێی خۆشە شەترەنج بکا و رۆژنامە وەخوێنێ رزگاریم دێ. مەرگ و نەمان بۆ گشت باوکان و دایکان و دایە گەورەکان.

نامە بە دەستەوە لەسەر قەرەوێڵە دانیشتم و لە پەنجەرەوە روانیمە دارە مۆرتك. هەستم کرد لە شوێنێکی کە هیچ چاوەڕوانیم نەدەکرد ئاوێنەیەکیان لە پێشم داناوە و خەریکم لە ئاوێنەکەدا لە خۆم دەڕوانم و خۆم لە ئاوێنە دا هیچ لەو خۆمە نەدەچووم کە بیرم لێدە کردەوە. نامەکەم نوشتاندەوە و نامە ژێر دۆشەگ، مەلافە و روو باڵنجەکەم گۆڕی قەرەوێڵەکەم رێك کرد و وەدەرکەوتم. لەو دیوی فرمێسکەکانەوە زۆر بە زەحمەت سەعاتەکەم دی کە لە نۆ لایدا بوو. چەندەم پێ خۆش بوو نەچمە دەرێ. چەندە گەرەکم بوو کە نەك هەر خاتوون نورولڵایی بەڵکو چاوم وە هیچ کەس نەکەوێ چەندەم پێخۆش بوو هێشتا هەر منداڵ بووبام و دەستەوملانی دایك و باوکم بوومایەو پڕ بە دڵ گریابام.

## ٣٠

جگە لە من کەس لە پاسەکە دا نەبوو. شۆفێر گۆرانییەکی عەرەبی زەمزمە دەکرد، لەو "یا حەبیبی" و "یا عەزیزی" یا نەی را کە لە دڵەوە دەیگوتەوە زانیم دەبێ ئەویندارانە بێ. بە بەر دەم سینەما تاج دا تێپەڕین. هەر دەتگوت دوێنێ بوو. دووانەکان کە هێشتا بچکۆلە بوون هەموو رۆژانی هەینی لە لای دایکمم دادەنان و ئارمەنم دەهێنا سینەما تاج بابۆڵەی کاڵباسم بە جەعفەری و پیوازی ورد کراوە کە زۆری پێخۆش بوو لە ماڵ دروست دەکرد. ئۆگری کانادادرای نارنجیش بوو و دەبووایە بۆخۆی بچێ و لە بووفەی سینەما بیکڕێ. بە یەکەوە

چاومان له فیلم دەکرد و بابۆڵەمان دەخوارد و پێدەکەنین و لە گەڕانەوەدا دەس لەنێو دەستمدا دوو سێ جار فیلمەکەی هەر لە هەوەڵەوە هەتا کۆتایی بۆ دەگێڕامەوە.

پاس لە هەمبەر دووکانی هەسارەشینە وێستا. دەمگوت لە کەیەوە دەستیم نەگرتووە؟ لە کەیەوە بە یەکەوە نەچووینە سینەما؟ بەر لە دابەزین بە شۆفێرم گوت «گۆرانییەکی فرە خۆش بوو.» پێکەنی. گەنج بوو و سێ ددانی زێڕیشی دە زاریدا بوو.

لەو بەر شووشەی هەسارە شینەوە وەستام. خۆم بە خۆمم دەگوت خاتوون نورولّلایی چ کارێکی هەیە؟ بەڕاستی کوڕەکەم هێندە لەمن جاڕزە؟ بۆچی ئارتووش بۆ ئاشت کردنەوە هەنگاوی ناوەتەوە؟ مقەوایەکی چوار سووچیان بە شووشەی دووکانەکەوە دابوو: لە ژوور دووکانەوە لە مەکینەی جل شۆری "ئیزی" چێکراوی ئامریکا بڕوانن.

ئارتووش چەند جار گوتبووی «بۆ مەکینەی جل شۆری ناکڕی؟» دایکم گوتبووی «جل و بەرگ دەبێ بە دەس بشۆردرێ.» ئالیس گوتبووی «زۆر گرانە.» ئارتووش گوتبووی «هەر بیکڕە.»

لە میلکبار وەژوور کەوتم و لە پێپلەکانە خوار و خێچەکان وەسەر کەوتم. چەند مێزی پاڵ دیوارە شووشەییەکە تەژی بوو. کیژ و کوڕی گەنج. ئافرەت و مێری نە زۆر گەنج. شەرمم دەکردەوە. هەرکات باسی میلکبار دەهاتە گۆڕێ ئالیس چاو و برۆی وێك دەیەنا و دەیگوت «بەیانیان شوێنی ئەو جۆرە خوێڕی و راونراوانەیە.»

بە خزمەتکارەکەم گوت چاوەنواڕی خاتوونێکی هاوڕێی خۆمم و جەختم لەسەر "خاتوون" کرد. لەسەر یەکێ لە مێزە دوو کەسیەکان دانیشتم و چاوم دە پێپلەکانەکان بڕی. چاوەڕێ بووم خاتوون نورولّلایی بێ زوو قسەکەی بکا و بڕوا. بیرم لە نامەکەی ئارمەن و جێ شەکرەکەی کە دەمەوڕوو کەوتبوو کردەوە. بۆچی کەس دە قسەم نەدەگەیی؟ هیچ کات ئەو هێندە کارەساتە بە دوای یەکدا نەقەومابوو. ئەوەم بە زەین گەیی بەر لە هاتنی ئێمیلی و دایە گەورە بۆ جی چوار ژیانێکی چەند ئاسوودەمان بوو. لایەنی رەخنەگر زوو پێی زانی. هەر ئێمیلی و دایە گەورەی هێمنایەتی ژیانیان شێواندووە؟» بینینی شینیۆنی درێژ و نەواری بەڵەك کە لە پێپلەکانەکان وەسەر دەکەوت بوو بە بیانووێیك هەتا گوێ لە وەڵام بئاخنم.

خاتوون نورولّلایی هەرکە دانیشت پرسی «حاڵتان خاس نییە؟» داچڵەکیم. واتە هێندە روون بوو کە حاڵم خاس نییە؟

به پەشۆکاوییەوە گوتم «ئەم رۆژانە سەرقاڵم و بێ نێوبڕ میوانم بووە و بە منداڵەکانەوە خەریکم و هەوا گەرمە و شێداربوونەکەشی جاڕزی کردووم و منداڵەکان کە گەورە دەبن دۆزەکانیشیان هەروەتر گەورە دەبن و هەوڵدانیان بۆ تێگەیشتن و زانین و هەڵهانینی دۆزگەڵ مرۆڤ شەکەت دەکا و جار وایە هەست دەکەم دایکێکی باش نیم و دەور و بەریش لە بری هاوکاری و یارمەتیدان بارێکی قورسترم دەخەنە سەر شان و ماندووم و ـــــ خەریك بووم دەگریام.

وەخت بوو لە شەرمان بخزێمە ژێر مێز. بۆچی لە شوێنێکی غەریبە دا دەگریام؟ بۆچی شتگەلێکی کە بە کەسم نەگوتبوو بە ئافرەتێکم گوت کە تەنیا چەند جار دیبووم و هیچ نزیکایەتیەکم لەگەڵی نەبوو؟ خاتوون نورولڵایی دەسماڵ قاقەزییەکی لە جانتاکە دەرخست و دایە دەستم. دەسماڵەکەم بە چاویدا هێنا و گوتم «ببوورن. نازانم چ بوو.»

دەستی نایە سەر دەستم. هەتا سەرم هەڵنەیەنا و چاوم لێنەکرد نەئاخۆت. پاشان گوتی «قژی چەن کەشخەت هەن. خۆزیا قژی منیش لێك و لووس بووایە.» چەند جارێك سەبرەکی لە پشتی دەستمی دا، ئەوجار دەستی کێشاوە. «تاریفی قاوەی گێلاسی ئێرە دەکەن.»

هەتا رایسپاردە خزمەتکار قاوەی گێلاسی بێنێ، سەرم بەرەو دیوارە شووشەییەکە سووڕاند. یەکێ لە دار خورماکانی ئەوبەری مەیدان وشك ببوو. لە سەردەمی منداڵیم دا دایکم دەیگوت «خۆزگا قژی تۆش وەك هی ئالیس برێ کرژ بووایە خزمەتکارەکە کە رۆیی وەقسە هاتین.

خاتوون نورولڵایی گوتی «ئێوە خاتوونە هەرمەنیەکان زۆر لە ئێمە لەپێشترن. ئەو شتانەی کە ئێوە زۆر لە مێژە وەدەستتان هێناوە ئێمە تازە دەبێ شەڕیان بۆ بکەین. ئێمە جارێ تازە دەستمان پێکردووە.» رەنگبوو دەبوو بڵێم «بەو چەشنەی ئێوە بیری لێدەکەنەوە واش نییە.» بەڵام هەر سەرم بۆ هەژاند.

ویستی لەمەڕ شێوەی بەڕێوە بردنی کارو باری قوتابخانە و وەڤدی باوەڕپێکراوی کۆمەڵگای هەرمەنیەکانەوە بدوێم. باسی قوتابخانەیەکم کرد. کە هەرمەنیەکان خۆیان دروستیان کردبوو، وەبیرم نایە لە کێم بیستبوو. یەکەم کۆمەڵی هەرمەنیەکان کە لە کۆمپانیای نەوتی ئێران و ئینگلیز دا دادەمەزرێن، هەموو رۆژێ دوای سەعاتی کاریان، بەرەو شوێنی قوتابخانە دەچن و لە راستیدا ساختمانی قوتابخانە بە دەستی خۆیان دروست دەکەن. خاتوون نورولڵایی پرسی «چۆن بوو ناوی قوتابخانەکەیان نا ئەدەب؟» وەڵامەکەییم نەدەزانی. لەمەڕ چەشنی مانگانەوە

دوام. مانگانەی قوتابیەکان لە رووی داهاتی باوك یا دایك دیاری دەکرا. داهاتی بنەماڵە بەهەر رادەییێ زۆرتر بووایە، مانگانەی منداڵەکان فرەتر بوو و بە پێچەوانەشەوە بنەماڵەکەم داهاتەکان هێندێ جار نە تەنیا مانگانەیان نەدەدا کۆمەك خەرجیشیان دەسەند. ئیدی نەمگوت ئەو بنەمالانەی لە باری ماڵییەوە سەر بوون، چۆن لە سەرکەم کردنەوەی مانگانە دەڕۆیشتن، باسی ئەو ماڵیاتە مانگانەیەم کرد کە وەقدی باوەڕ پێکراو دایاننا بوو و هەر کەس بە پێی داهاتی سالانە دەبووایە بیدا. نەمگوت هەبوون کەسانێکی پێیان ناخۆش نەبوو خۆ لە دانی ماڵیات بپارێزن. لەمەڕ بازاڕی خەیرییەوە دوام کە سالّی دووجار بەڕێوە دەچوو و ئافرەتان شیرینی خۆمالّی و شت و مەکی بەدەس چنراو و کاری دەستیان دەفرۆشت و داهاتی فرۆشەکە بۆ یارمەتیدان بە بنەماڵە دەسکورتەکان تەرخان دەکرا، نەمگوت ئەم بازاڕانە ناوەندی غەیبەت و چاولێکەری و فیز لیدانیش بوو، بابەتی ئۆتۆمبێل و سەفەری ئەورووپا و پلە و پایەی هاوسەرەکان.

زۆر بە وردی گوێی بۆ قسەکانم هەڵخستبوو، سوپاسی خزمەتکاری کرد کە قاوەی گێلاسی هێنابوو و پاشان لەمنی پرسی «خاتوون ئێما خاچاتووریان دەناسی؟» گوتم «نا،» و هەتا گوتی «کێکی چەن خۆشی دروست دەکرد،» کەوتەوە بیرم. دایکم کە شیرینی دروست کردنی کەسی پێهەو نەبوو دەیگوت «کێك هەر ئەو کێکانەی ئێما بوو.» خاتوون نوورولّلایی گوتی «ئەودەم لە تاران بووم، لە لێژنەی خەیرییەی "فەرەح" وانەی شیرینی دروست کردنم دەگوتەوە. چی ــ ناوی شیرینیەکەم بیر چۆتەوە. ناسك؟» گوتم «ناسك.» گوتی «بەلّێ، بەلّێ. چ ناسکگەلێکی دروست دەکرد.»

پاشان لەسەر لێژنەکەی خۆیان رۆیی. لەمەڕ هەولّی ئافرەتان بۆ وەرگرتنی مافی دەنگدان. لەمەڕ پۆلگەلی فێر بوونی خوێندن و نووسین ، لەمەر ئەوەی کە ئافرەتی ئێرانی هێشتاکەش شارەزای مافی خۆی نییە. ئێستاکە سانا قسەی دەکرد و مەزن مەزن نەدەئاخۆت، قسەکانی لە دل دەنشت. گوتم بیر لە چی دەکەمەوە و پێکەنی. «لەکاتی قسە کردن دا ئەگەر ئەدەبی نەئاخۆم خەلّك لایان وایە یا لێی نازانم یاکوو گرنگ نائاخۆم.» قاوەی گێلاسمان خوارد. بەتام بوو.

کیژو کوڕێکی گەنج چوونە لای دەزگای بلاوکردنەوەی ئاهەنگ کە بیستبووم میلکبار تازە لە ئەورووپای هێناوە. دەمزانی ناوی "جۆك باکس"ە، بەلام هەتا ئەو رۆژە نەمدیبوو. کیژەو کوڕەی گەنج لەسەر هەلّبژاردنی شریت بوو بە کێشەیان، بەلام هیچکام پڕکێشی نەکرد، کوڕە

لەڕ و باڵا بەرز بوو و کیژە جلی کیسەیی نارنجی لەبەر دابوو. جلەکە راستە بوو و دەوری قۆڵ و ژێرەوەی داوێنی مەغزییەکی سەوزی پێوە بوو.

خاتوون نورولّلاییش خەریك بوو چاوی لێدەکرد. «کە دەبینم گەنجەکان خۆشحاڵ و دەم بە پێکەنینن کەیفخۆشم، هەر لەمەڕ ئەمانەیە کە ئێمە خۆمان لێرە و لەوێدەدەین. کاتێ دەکەومە بیر سەردەمی گەنجایەتی خۆم ـــــ »

هەر چۆنێکی بوو کیژە و کوڕە، شریتێکیان هەڵبژارد. لەو ئاهەنگانە بوو کە هەمیشە ئارمەن دەیخستە سەر گرامی تیپاز و توویست و سەمای دەکرد. هیچ کات دە واتای دەستەواژەیەکی کە گۆرانیبێژ چەندین جار دووپاتی دەکردەوە نەگەیشتبووم. قاوەی گێلاسی خواردەوە و لە ناکاو تێگەیشتم: Hit The road jack بۆچی تا هەنووکەش کەیفم بەو ئاهەنگە نەهاتبوو؟ جوان بوو.

خاتوون نورولّلایی قاوە گیلاسیەکەی لێگدەدا. «ئەم شتانە بۆ هەرمەنیەکان نوێ نییە. بۆ ئێمە نوێیە. دایك و باوکی منیش کە لەکنەخۆ نوێخواز و خوێندەوار بوون، هەردوو لاقیان دە کەوشێك کردبوو کە دەبێ شوو بە کوڕە مامم بکەم ، دەزانم لەنێو هەرمەنیەکاندا باو نییە، بەڵام زەماوەندی خزمایی لەنێو ئێمە دا نەك هەر کارێکی چەوت نییە، بە وتەی پێشینیان خێریشە. بێشك مارەیی کیژە مام و کوڕە مامیان لە ئاسمانێ بیستووە؟» بیستبووم. دیسان هاتم بڵێم بەو شێوەیەی کە ئێوە بیری لێدەکەنەوە واش نییە و ئافرەتانی هەرمەنیش گرفتگەلی خۆیانیان هەیە کە خاتوون نورولّلایی دەرفەتی پێنەدام.

دەستی بە پاپیۆنی سەر شینیۆندا هێنا. رەنگبێ لەبەر ئەوە بووبێ کە لە توند بوونی دڵنیا بێ. «ئەمنیش هەر دوو پێم کردە کەوشێك کە «نا.» لە دڵەوە پێکەنی و دوو قوولکە کەوتە سەر کولمە گۆشتنەکەی. «راستییەکەی ئەوینداری هاوڕێکەی کوڕە مامم بووم کە چەند جار هاتبووە ماڵمان بە کورتی لەگەڵ کوڕە مام رێك کەوتین و هێندەمان دە گوێی دایك و باوکەکانماندا سریواند ئاخرییەکەی رازی بوون.»

دەست لە ژێر چەناگە تێی رامام و پرسیم «شووت بە هاوڕێی کوڕە مامەکەت کرد؟»

شەربەکەی دەنێوان تلی هەر دوو دەستی نا، روانییە دەرەوە و سەبرێکی سەری لەقاند. سووکە بزەیەك لەسەر لێو و چاوەکانیدا دیاریدا. «بیست ساڵێك لەمەوبەر.» دەمویست بپرسم، لە رووم هەڵنەدەهات. هەرچۆنێکی بوو پرسیم «هێشتاش ـــــ »

بێخی قاوه گیلاسیەکەی بە نەی فڕ کـرد. دەنگـی فـڕەی کـە هـات، شـەربەکەی وەلانـا. لێوەکانی بە دەسماڵ قاقەزی سڕییەوە و پێکەنی. «بەسـەر منداڵەکانـدا دەگـوڕێنم. ئـەمکارە مەکەن و خۆم دەیکەم. هێشتاش چی؟ لە زەماوەندم رازیم یا نا؟»

سەرم لەقاند و خاتوون نورولڵایی هەناسەیەکی قووڵی کێشا. «ئەم جلە دەبینن؟» پێسیری جلەکەی بە دوو تلیەوە گرت. «مۆدێلەکەییم لە گۆڤار دا دی.» جلەکە پێسیری ئینگلیزی بوو و هەتا نێو قەدی شەش پشکۆژی دەخوارد. «تارانم لێك و پێکدا هەتا پارچەکەییم دەسکەوت. پارچەیەکی کەتانی چەرمووی خاڵخاڵی درشتی زەرد. بۆ تاقیکردنەوەی دەجار هات و چۆم کرد و پارەیەکی فرەم دایە بەرگ درووە هەتا ئامادە بوو.» پاڵی وەپشـتی ئەسـکەملەکە دا و تـێم روانی چاوم لێکرد و چاوەڕوان مام.

راوەستا هەتا خزمەتکار شەربە بەتاڵەکانی راکرد و رۆیی. پاشان هاتە پێش. ئانیشکی وە مێز دا و گوتی «چەند جار کە لەبەرم کرد بۆم خۆش بوو. دیارە ئێستاش هەر خۆشم لێی دێ. ئاگـام لێیـە پەڵـەی وێنەکـەوێ، هـەرجار کـە لەبەریدەکـەم دەیتـەکێنم و لـەنێو دۆلاب دا هەڵیداوەسم هەتا چین و چرووکی تێنەکەوێ بەلام ـــ» کیفەکەی کردەوە و پاکەتە جگەرەکەی دەرێنا. «جگەرە دەکێشن؟»

جگەرەیەکم راکرد و گوتم «جاروبار».

شەمچەی بۆ لێدام و گوتی «ئەمنیش هەروا.»

چاوم لە پاکەتە جگەرەکە کرد. زێو بوو، گوڵێکی لاسك درێژی لەسەر هەڵکەندرابوو. گوتم «پاکەتێکی کەشخەیە.» جگەرەکەی تەکاندە نێـو دەسـتی و بـەم شـێوە دە خزمەتکارەکـەی گەیاند تەپلەك بێنێ. پاشان چاوێکی لەپاکەتەکە کرد و بە دەم بزەوە گوتی «دیارییە.» گـوتم «باسی جلت دەکرد.»

دەستێکی بە پاکەتە زێوینەکە دا هێنا، شێوە لاواندنەوە. مژێکی لـە جگـەرە دا. «رۆژی جێژن کە لە تاران بووم، ئەم کەمەربەندەم زۆر بە هەڵکەوت لـە جێنـراڵ مـۆد دا دۆزیـەوە.» ئەسکەملەکەی نەختێ کێشا دواوە و قایشەکەی پیشـاندام. «دروسـت هـاوڕەنگی خاڵەکانـە، وەنییە؟» قایشی راست لەگەڵ خاڵەکان هاورەنگ بوو، ئاوزوونەیەکی* زێڕی گەلێك مەزنیشی پێوە بوو.

ئەسکەملی هێنایەوە پێش ، دە کات ژمێرەکەی ڕووانی و گوتی «بە کورتی مـرۆڤ دەبـێ ئاگاداری شتەکانی خۆی بێ. کاتژمێر بوو بە یازدە. یـازدە ونیـو نۆبـە دکتۆرمـە. زۆر شـتم دەویست بپرسم.»

دەستی نایە نێو کیفە زەردو زەلامەکـەی و قاقـەزێکی دەرێنـا. «هـەمووم نووسـیوە.» و دەستی کرد بە خوێندنەوەیان: یاساگەلی مارەیی و تەڵاقی هەرمەنیەکان، مافی ڕاگرتنی منداڵ دوای تەڵاق، مافی ئافرەت لە مێژووی ئەرمەنستاندا، ڕادەی خوێنـدەواران لـەنێو ئافرەتانـدا. قسەکەییم بڕی و گوتم ناشێم وەڵامگەلی دروستت پێبدەم و باشـتر ئەوەیـە لەگـەڵ ئەنـدامانی لیژنەی کلێسا و قوتابخانە بدوێ. سەری لەقاند و ناوی چەند کەسی نووسی، گوتی دەخوازێ بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەکانی لیژنەکەیان لە ئافرەتانی هەرمـەنی بگێڕێتـەوە. گـوتی «گـرفتی ئافرەتان پێوەندی بە گشت ئافرەتانەوە هەیەن مسوڵمان و هەرمەنی لە ئارا دا نییـە.» گـوتی «ئافرەتان بۆ چارەسەری گرفتەکانیان ئەشێ یەك بگرن. ئەشێ یەکتر فێر بکەن، ئەشێ لە یەکتر فێر بن.» وەك نوتقەکەی دەئاخۆت.

هەرچی هەوڵمدا نەیهێشت پارەی مێزەکە بدەم. «میوانی لیژنەی ئێمەن.» لە شەقامەکەدا خەریکی ماڵاوایی بووین کە بیرم کەوتەوە بپرسـم «هاتبوونـە بۆنـەی ٢٤ی ئـەپڕێل؟» گـوتی هاتبوو و کە بەسەر سوڕمانەوە پرسیم «بۆ؟» بەسەر سوڕمانەوە گوتی «بۆچی نـا؟ کارەسـات کارەساتە، مسوڵمان و هەرمەنی نییە.» هیچ وەك نوتقەکەی نەدەئاخۆت.

# ٣١

بە دوای فێنکی و تاریکی مێلکبار، گەرما و ڕووناکی شەقام دڵگر بوو. هەستم بەوە کرد حاڵم باشتر بووە. هەستم کرد سووکتر بوومە. بە بەر سینەما ڕێکس دا تێپەڕیم. جەماعەتێك لەبەردەم گیشە ڕێز ببوون، گشتی مێر، زۆرتر عەرەب. لەو بەرە بەیانییەدا بۆ نەچـوو بوونـە سەرکار؟ سینەما لە بەرنامەی داهاتوویدا فیلمی "تام بەند ئەنگوشتی" پێشان دەدا. چاوم بە وێنەکانی فیلمەکەدا گێڕا. تام بەند ئەنگوشتی لەسـەر غەرغەرەیـەکی کـە ئەسـکەملی بـوو دانیشتبوو، لە پشت فینجانێکی سەرەو نخوون کە مێزی بوو و بە کلکەوانەیەکی کە شـەربەی بوو ئاوی دەخواردەوە. مێرێکی عەرەب لەبەر دەم سینەما لەسەر عارەبانـە مـەیگووی وشـك

کراوەی دەفروشت. دەمم گرت و تیژ تێپەڕیم، بە خۆمم گوت هەتا دووانەکانیش وەك ئارمەن سەربەخۆ نەبوونە بێین فیلمەکە ببینین.

شالوارێکی کە ئارمەن لەمێژ بوو دیاری کردبوو کڕیم بەو مەرجە ئەگەر کوو بۆ بەری نەبوو بیگۆڕمەوە. لە دووکانەکە وەدەرکەوتم، پێم خۆش نەبوو بگەڕێمەوە ماڵ، پێم خۆش نەبوو بە ڕێگە دا بڕۆم و بیر بکەمەوە یا بەڵکو ڕێگە ببڕم و بیر نەکەمەوە. ڕۆیشتم و بیرم کردەوە هەمیشە لە ماڵدا مانەوە و هاموشۆ لەگەڵ مرۆڤگەلێکی بەربەسراو و کێشە و دەم بە دەمە لەگەڵ دوزگەلی دووپاتە وەڕەزی کردووم. دەبێ کارێك بۆ دڵی خۆم بکەم. وەك خاتوون نوروڵلایی. بە بەردەم شیرینی فرۆشی "نگرۆ" دا تێپەڕیم و کەوتمەوە بیر میوانداری پێنج شەممە شەو، زۆریامەوە و چوومە ژوور. شیرینی وشك و ئاجیلم کڕی. قوتووی ئاجیل و شیرینی و بەستەی شاڵوار بە دەستەوە لە شیرینی فرۆشی هاتمە دەرێ و بەرەو رووی ئێمیل سیمۆنیان بوومەوە کە بەرەو رووم دەهات. هەستی بێ جێی خۆم بوو یا هەر بەڕاستی پەشۆکام؟ تا هاتم بیر لەوە بکەمەوە لەو دەمەی ڕۆژێدا بۆ نەچۆتە سەرکار گوتی «ڕاستییەکەی حاڵم زۆر خاس نەبوو، واتە وازی کار کردنم نەبوو، ئیزنی چارەسەرکردنم وەرگرت. هاتمە بازاڕی دەستەوانەی باغەوانی و لاپیتە بکڕم.»

دیسان تا هاتم بڵێم بازاڕ لەو لاترە گوتی «ئەگەر پەلەت نەبێ، لەگەڵم دێی؟ نازانم لە کوێ بە شوێنی دا بگەڕێم.» بۆ وا پەشۆکا بوو؟ دەتگوت یەکێ گوتی «ڕەنگبێ لەبەر ئەوە کە تووشی تۆ بوو.» نازانم کام لایەنی بیرگەم بوو.

گوتم «بۆ ئەم چەشنە شتانە دەبێ سەرێکی دووکانی لێژنەی باغەوانی بدەین. بەستەکانی لە دەستم وەرگرت و پرسی «لە کوێیە؟»

تاکسیمان گرت و بە شوفێرەکەم گوت «فەلەکەی ئاڵفی.»

دەسفرۆشێك بەرەو رووی دووکانی لێژنەی باغەوانی لە ڕەخ پیادەڕێدا زەیتوون و هاروێ سوێرە و گەلا مێوی دەفرۆشت. گوتم بۆ پێنج شەممە شەو زەیتوون و هاروێ سوێرە بکڕم. کڕیم. ئێمیل لاپیتە و دەستەوانە و چەند بەستە تۆ گوڵ بە دەستەوە لە دووکان هاتەدەر. تۆ گوڵە نۆکەم کڕی.» پاشان چاوی لە شتومەکی دەسفرۆشەکە کرد «دوڵمەم زۆر پێخۆشە. خوا دەزانی لە کەیەوە نەمخواردووە.» گەلامێوم کڕی.

سواری پاسی خەتی بووارده بووین. لە تەواوی ڕێگەدا بەیەکەوە ئاخۆتین و نازانم چەند جار گوتمان «چەندە سەرنج ڕاکێش؟ ئەمنیش هەروا.»

لەبەر دەرگەی ماڵ بەستەکانی پێدامەوە و گوتی «باوەڕکە موجامەلە ناکەم، لەگەڵ کەس ئەوەندە قسەم بۆ گوتن نیە.»

دروست کردنی ئامێژەنی دۆڵمە کە کۆتایی هات بوو بە شەو. بە ئارتووشم گوت منداڵەکان دەبەیە "فیش ئەند چیپس" بخۆن؟ دووانەکان لەخۆشیان هەڵبەزینەوە و ئارتووش دەتگوت لای وایە بۆ ئاشت بوونەوە هەنگاوم ناوەتەوە. ئامێژەنی دۆڵمەکەم نایە نێو سەلاجە و گوتم بۆ پێنج شەممە شەو کارم زۆرە. دەرگەی سەلاجەم وردە وردە پێوەدا هەتا چاوم بە هیچیان نەکەوێ.

دووانەکان دەستیان بە زاریانەوە گرت هەتا رەنگی سووری کۆل ئید بە سەر لێوانیانەوە نەبینم، لە دەرگە چوونە دەر. پاشملە گوتم «ڕەنگی سووراوەکە جوان بوو.» دەستیان لە زاری کردەوە و پێکەنین. بە دەم داخستنی دەرگەوە گوتم «ئەگەر درەنگیش هاتنەوە، قەیدی نییە.» هەر چواریان لە جەرگەی رێگە باریکەکەدا بە سەرسوڕماوی چاویان لێم کرد.

بەرەو رووی پەنجەرەی ژووری دانیشتن وەستام، چرای ژووری دانیشتنی جی چوار دایسا گوتم «ئەوە چ دەکا؟ رەنگبێ لەگەڵ دایکی قسە بکا یا کتێب دەخوێنێتەوە. رەنگیش بێ ـــــ»

زوو پەردەکەم کێشا و چوومە چێشتخانە قوڵینەی گەڵا مێوەکەم نایە سەر مێز و ئامێژەنی دۆڵمەم لە سەلاجە دەرێنا.

هەتا یەکەم دۆڵمەم پێچایەوە و نامە نێو قابڵەمە، دوو لایەنی بیرگەم بوو بە کێشەیان.

«فرە نەفامی.»

«بۆچی؟ چ ئیرادی هەیە دوو کەس ئۆگرییەکی هاوبەشیان بێ؟»

«هیچ ئیرادی نیە، بەڵام ــ»

«جا چونکە یەکیان ئافرەتە و یەکیان مێر نابێ لەگەڵ یەکتر باخۆن؟»

«هەر باخۆن؟»

«دیارە کە هەر باخۆن.»

-

تەنیا کەسێکە کە دە قسەکانم دەگا.

-

«هێندەی تەنیا هەر لەگەڵ خۆم ئاخۆتم دین بووم.»

-

«هێندەی کە هەر کارێکم لەمەڕ دیترانەوە کرد ماندوو بووم.»

-

«ئەمەش وەڵامەکەم. منداڵەکەم پێی وایە بە بۆڵە بۆڵ و رەخنەگرم. شووەکەم حازر نییە وشەیەك لەگەڵ یەکتر باخۆین. دایك و خوشکم هەر گاڵتەم پێدەدەن و نینا کە لەکنەخۆ هاوڕێین هەر دەزانی دەکارم بکا. هەروەك ئێستا. هەروەك ئێستا کە دەبێ بۆ کەسانێکی کە وازیانم نییە چێشت دروست بکەم.»

«وازی هیچ کارێکت نییە؟»

-

«ئەدی بۆ دۆڵمە دروست دەکەی؟»

-

«بۆ کێی دروست دەکەی؟»

-

«فرە نەفامی.»

دوایین دۆڵمەم نایە نێو قابڵەمە و دە گۆڵە نۆکەکانی سەر قەرنیز رامام.

# ٣٢

میوانەکان پێنج شەممە شەو کێبەرکێی زوو هاتنیان بوو.

دووانەکان لەگەڵ سووفی لەسەر جۆلانەی حەوشە دانیشتبوون. هەر جارەی کە جۆلانە هەڵدەکشا سەرێ، هەرسێکیان بە قیژە و پێکەنین دەستیان بەرەو دارە بێ رادەداشت و هەوڵیان دەدا لقە ناسك و سەوزەکە بگرن. دارە بی رەخ جۆلانە و هەر دارەبییەکی تر گشت دەم و ساتێك شیعری "پاروانا"ی "هوانێس تومانیان" یان دەخستەوە بیرم کە لە سەردەمی منداڵیدا هێندەم خوێندبۆوە نیوەی زۆریم لەبەر بوو. هاروێ و تەماتەم لەبەر پەنجەرە و بەرەو رووی دارە بی ورد دەکرد و ئەو بەشەی کە زۆرم پێخۆش بوو خوێندەوە:

شازادە خاتوونی کەشخە و پاشای قژ چەرمووو دەرکەوتن.
کیژ چەشنی مانگی یەکشەوە، باوك چەشنی هەورێکی قورس.
هەور و مانگ سەر لەسەر شانی یەکتر.

بە دەنگی هەناسە و خشەخشی جل ئاورم داوە. سووفی و دووانەکان لەبەر دەرگەی چێشتخانە وێستابوون.

سووفی گوتی «پووری، شیعرێکی فرە خۆش بوو.»

ئارمینە گوتی «لە سەرەتاوە بیخوێنەوە.»

ئارسینە گوتی «بیخوێنەوە.»

پێکەنیم. «سەرەتایەکەییم لەبیر نییە.»

ئارمینە گوتی «باشە، کەوابوو چیرۆکەکەی بگێڕەوە.»

ئارسینە گوتی «بیگێڕەوە.»

تویکڵە هاروێییەکانم خستە نێو زبڵدان. «سەد جار لە رووی کتێب بۆم خوێندوونەوە.»

ئارسینە گوتی «باشە دەی بۆ سووفی بگێڕەوە.» ئارمینە گوتی «دڵنیام چیرۆکەکەی نازانێ.» دوو قۆڵی لە سووفیان پرسی «دەزانی؟» سووفی سەری لەقاند واتە نایزانێ.

رۆن زەیتوون و ئاوی لیمۆم نایە سەر مێز، بە دەم دروست کردنی سۆسی سالاد دەستم کرد بە گێڕانەوەی چیرۆکەکە: «پاشایەك لەسەر کێوێکی بەرز دا دەژیا، کیژێکی کەشخە و جوانی بوو. کیژەکە مەزن بوو و بڕیار بوو شوو بکا، شازادە گەلێك لە چوار قوڕنەی دنیاوە هاتنە خوازبێنی کیژە. پاشا سێوێکی دایە کیژە و گوتی هەرکام لە شازادەکانت بۆ شوو پێکردن دیاری کرد سێوەکەی بۆ باوێژە.»

کیژەکان دەوری مێزیان ئەنگاوت، دەستیان نایە ژێر چەناگە و چاوەنوارِی پاشماوەی چیرۆکەکە بوون. بۆ یەکەمجار بیرم لەوە کردەوە کە چەند خۆشە کیژ شوو بۆ خۆی دیاری بکا و نە بە پێچەوانە. دەستم کە بە رۆن زەیتوون چەور ببوو بە بەرەڵبێنەمدا هێنا. «شازادەکان گوتیان کیژی پاشا هەرچی داوا بکا بۆی دەیەنن. زێر و جەواهیرات و تەنانەت هەسارە و مانگی ئاسمان.»

سووفی گوتی «خۆزگەم بە کیژی پاشا. ئەگەر من بوومایە هەسارە و گشت جەواهیرات و هەموو شەگەلاتەکانی دنیام دەخواست.» دووانەکان گوتیان «وس.»

ساسی سالادم لێگدا. «کیژی پاشا گوتی زێڕ و جەواهیرات و مانگ و هەسارەی ئاسمان چ لێدەکەم؟ من تەنیا شتێك لە هاوبەشی ژیانم دەخوازم: ئاوری ئەوینی راسەقینە.»

دووانەکان چاویان دە سووفی بڕی کە بە زاری ئاوەڵاوە چاوی لێم دەکرد.

خوێ و بیبارم لە سۆسەکە دا. خوازبێنچییەکان کە وشەی ئاوریان بیست بەو بیر و خەیاڵەوە کە شازادە خاتوون ئاوری راسەقینەی گەرەکە چاوەڕوانی وتەکانی تری شازادە نەمانەوە و بە تەقڵەکوت وەشوێنی ئاور کەوتن و شازادە خاتوون چاوەڕوان مایەوە.»

ئارمینە خەریکی راکردنی کاهوو لەنێو قاپی سالادەکە دابوو کە شەقێکم لە پشتە دەستی دا. «و شازادە خاتوون گەلێك ساڵ چاوەڕوان مایەو هەر مایەوە هەتا ئاخرییەکەی لە خەم و خەفەتیان سەری دە باڵەخۆ ناو هێندە گریا کە بە هۆی فرمێسکەکانییەوە گۆلاوێك ساز بوو و کۆشکی پاشای وەبنە خۆدا.»

سێ قۆڵی سەریان داهێنابۆوە و چاویان لێدەکردم. قاپی سالادەکەم نایە سەر پێشخان. «هەر دارەبیەکی کە دەیبینن هەر ئەو کیژە پاشایەیە کە ئێستاش کە ئێستایە سەر بەرەو ژێر دەگری و شازادەکان ئەو شەمشەکوێرانەن کە ئێستاکەش هەر بە دەوری چراکاندا خول دەخۆن هەتا ئاور بۆ شازادە خاتوون ببەن.“

پاساریەك خۆی لە تۆڕی پەنجەرە دا، جیکەیەکی لێبۆوە و فڕی.

ئارمینە گوتی «دارە بی بەستەزمان.»

ئارسینە گوتی «شەمشەمە کوێرە بەستەزمانەکان.»

سووفی بەو زارە گریاوەیەوە هێشتا هەر تێم رامابوو.

# ٣٣

ئالیس لە پاڵ یووپ دانیشتبوو. لێگدا لێگدا پێدەکەنی و پێلکەکانی بەو مژۆڵ ریمێل لێدراوانەیەوە زوو زوو لێك دەکردەوە و دەینووقاندەوە. هەروەك راپۆنزێلی ئەو سەردەمانەی کە منداڵەکان خوار و راستیان دەکردەوە. دایکم لە ئەسکەملی هەمبەر دا، هەروەك تەماشای کێبەرکێی پێنگ پۆنگ بکا، نیگای لە نێوان ئالیس و یووپ دا لە گەڕیاندا بوو. ئارتووش و ئێمیل کایەی شەترەنجیان دەکرد. ئێمیلی لە پاڵ باوکی دانیشتبوو. ئەژنۆکانی پێکەوە نابوو.

دەستی وەژێر چەناگەی نابوو و چاوی لە فەرش دەکرد. ئارمەن بە شالۆاری نوێیەوە لەسەر سەری ئارتووش وێستابوو. ویۆلێت لەو لای ژوورەکەوە ئالبۆمی وێنەکانی زەماوەندی من و ئارتووشی هەڵدەداوە. خۆی سوور بوو لەسەر بینینی ئالبۆمەکە. گارنیك و نینا جار ناجارێك لەگەڵ ئالیس و یووپ و هێندێ جاریش لەگەڵ دایکم و زۆرتریش لەگەڵ یەکتر دەئاخۆتن و هەرچەند سات جارێك بیانوویێکیان بۆ پێکەنین دەدۆزیەوە

ویۆلێت پرسی « بۆچی یەکێ لە وێنەکانی زەماوەند دە قاب ناگری بە دیواری هەڵواسی؟» بە شوێن وەڵامەوە بووم کە ئێمیلی هەردوو دەستی نایە سەر کوڵمەکانی. «ئەی! گوڵی کەوشم دیار نیە.»

هەموو لامان لە کەوشەکانی ئێمیلی کردەوە. تایەکی کەوشە پەشمیەکانی گوڵی چەرمووی پێوە بوو و تایەکەی تر بێ گوڵ بوو.

ئارمەن هاتە پێش. «بێگومان هەر لەو ناوە کەوتووە. بگەڕێین بیدۆزینەوە.»

ئێمیلی چاوێکی لە باوکی کرد و سەری لار کردەوە.

ئێمیل بزەی هاتێ. «برۆ بگەڕێ، بەڵکو بیدۆزیەوە.»

ئێمیلی سەبرێکی لەجێوە رابوو، دەستێکی بە دامێنە رەش و تەنگەکەیدا هێنا و لەگەڵ ئارمەن وەدەرکەوت. ویۆلێت بە ئالبۆمەوە هات لەجێی ئێمیلی دانیشت. ئارتووش بە ئێمیل-ی گوت «کیش! ئەمشۆ هەر هۆشت لە خۆنیە.» ویۆلێت ئالبۆمەکەی پێوەدا.

بە بیانووی هێنانی شتی ئاوەکی چوومە چێشتخانە. ئێمیلی کە هات دڵنیابووم هەردوو کەوشی گوڵی پێوە بوو. دڵنیابووم، چونکە هەتا کەوشەکانم دی بیرم کردەوە «رێك وەکو ئەو کەوشانەن کە چەند حەوتوو لەمەوبەر کڕیم.» ئەمن کەوشی منالانەم کڕیبوو یا کیژەکە کەوشی ئافرەتان؟»

لە مەودای نێوان چێشتخانە دا لە هات و چۆ دابووم. ئەم میوانداریە خورتیە کەی تەواو دەبوو؟ بە خۆمم گوت ئەگەر هەموو رۆیشتن و قاپ و کەوچکم شوردن و رێك و پێکم کردن لە نێو راحەتیە سەوزەکە دا پاڵ دەکەوم و چیرۆکی ساردۆ دەخوێنمەوە تا بزانم مێری چیرۆکەکە ئاخریەکەی چ دەکا؟ کەوتمەوە بیر بەیانی کە چووبووم ئەیزە لە خاتوون سیمۆنیان بگێڕمەوە شەو بێ، ئەمجارە ئیتر کەس خورتی لێم نەکردبوو. خۆم گەرەکم بوو.

دەرگەم کە کردەوە وەمزانی نەخۆشە. رەنگی تێك چووبوو و ژێرچاوەکانی تێك قوپا بوو. جلی ئاودامێنی و فرەوانی چەرمووی پۆشیبوو. چووینە ژووری دانیشتن و لە وەڵامی ئەوەی کە

حاڵیم پرسی گوتی «دویّ شەو خراپ خەوتم» هەرکە باسی میوانداریم کرد، وابـە بـە گـورجی گوتی «نا» کە نەموێرا پڕکێشی بکەم. میوانی بابەتێکی هێندە گرنگیش نەبوو. گەرەکم بـوو قسە بکا. لەمەڕ مێرە چاو سەوزەکە، لە ئێمیل ، لە خێزانی ئێمیل. هـەروەك فیلمێکـی کـە بەرنامەی داهاتووەکەیت دیبێ و گەرەکت بێ سەر لە بەری ببینی. بەڵام دەتگوت هاوسـێکەم هەر هیچ وازی ئاخۆتنی نەبوو. بەرادەیەك کپ و بێدەنگ دە قالیچەکەی عەردی ژوور راما کە وەستام و ماڵاواییم کرد. بۆ مانەوەم پڕکێشی نەکرد، گفت و لفتی سارد بـوو. هـەر دەتگـوت ئەو ئافرەتە نییە کە چەند شەو لەمەوبەر تایبەتی ترین رووداوەکانی ژیانی بۆم گێڕاوە.

ئەو چێشتانەی کە بۆ شێو لێمنابوو، نامە سەر ئاور گەرم بنەوە. پلاو خۆرێشتی فسنجان، دۆڵمەی گەڵا مێو و ئێکرا، بەرچێشتێکی کە بۆخۆم کـەیفم زۆر پێـدەهات و بـەو بـیرەوە کـە رەنگە خاتوون سیمۆنیان بێ، لەجاران زۆرتر تیژم کردبوو. سەوزی خواردن و ترشیم لە سەلاجە دەیەنا دەر کە ئێمیل گوتی «تووشی زەحمەت بووی.»

لام لێ کردەوە، لە پاڵ مێزی چێشتخانە وێستابوو. گوتم «زەحمەتی چی؟» پاشـان لـە زارم هاتە دەر «بۆ تۆ کە خۆش رادەبرێ.» لایەنی رەخنەگر تێم خوری «ئـابڕوت چـوو.» زووەکـی گوتم «مەبەستم ئەوەیە بۆ هەمووان هەر خۆش رادەبرێ.»

قاپی ترشی و قوڵینەی سەوزی لە دەستم ساند و نایە سـەر کەشـەف، پـاڵ قـاپی سـاڵاد. «کلاریس، دەبێ باخۆین. کەی دەرفەت دەبـێ؟» زنجیری ملـی کـەوتبووە سـەر کراسـەکەی، دڵەکوتەم گرت.

نینا گەیشتێ. «ئەمن چ بکەم؟ ئەوانە ببەم لەسەر مێز بیانچنم؟» بە هێمـای سـەر گـوتم «ئا.» دەنگم دەر نەدەهات. نینا کەشەف بە دەس لە چێشتخانە وەدەرکەوت.

ئێمیل گوتی «ئێوارەی دوو شەممە؟» خەریکی تێکردنی پلاو بووم و چەشنی کارەبا بە بیرم داهات کە دووشەممانە درەنگ لە قوتابخانە دێنەوە، چونکە مەشـقی جـەژنی کۆتـایی سـاڵە و ئارتووش سەر لە بەیانییەوە دەچێتە خوڕەمشار و شـەوێ دەزۆریەتـەوە و ئـالیس لـە نۆبـەی شەودا کار دەکا و دایکم میوانە. سەرم راوەشاند کە واتە «ئا.»

نینا لە ژووری دانیشتنەوە ئێمیلی بانگ کرد و ئێمیل لەکاتی چوونە دەر لەگـەڵ دایکـم وێك کەوتن و گوتی «ببوورن.»

دایکم وەڵامی نەدایەوە. خۆی گەیاندە لای مێز و لەبن گوێمـدا گـوتی «ئێسـتا بـە هـەر دوومان بڵێ کەر. هەر لەخۆوە نیگەران ببووین. نـازانی چـۆن بـە ئـالیس رادەگـا بێگومـان

قسمەت و نسیب وابووە. ئێستا هەرمەنی نیە قەیدی ناکا، ئەدی بۆ نیوەی پڵاوەکەت رژانـدە سەرمێز؟»

ئێمیلی و ئارمەن هەتا سێ جار نەمگوت «منداڵینە. شێو» نەهاتنە سەر مێز. سـووفی و دووانەکان ویستیان لەسەر جۆلانە شێو بخۆن. تا هاتم بڵێم نا سووفی دەستی دەنێو قەدم وەرێنا. «پووری رێگەمان بدە لە لای شازادە خاتوون شێو بخۆین.» نینا گوتی «چی ؟ شازادە خاتوونی چی؟» سووفی گوتی «دارە بی هەر ئەو کیژە پاشایەیەکە ــــ » نینا پەڕیە نێو قسەکەی سووفی و بە منی گوت «من چێشت بۆ منداڵەکان تێدەکەم. تکایە ئەتۆ دانیشە.» گارنیك بە دەم بەهـ بەهـ گوتنەوە پڵاوی تێکرد و ویوڵێت بە ئێمیل- ی گوت «دۆڵمەت پێخۆشە؟»

چاوم بە مێزی شێودا گێڕا کە کەم و کووڕیەکی نەبێ و بـیرم لـەوە کـردەوە کـە ئـەوە لـە کەیەوە بە یەکتر دەڵێن تۆ؟ چووم پلـەی کۆلێرەکـەم زیـاد کـرد. ئـالیس چێشـتی بـۆ یـووپ تێدەکرد، دایکم پێی گوت «گۆشتی خۆرێشتت کەم داناوە. پڵاوێ زیاتر تێکە.»

ئەمن بێ قاپ بووم. لەکاتی تەیار کردنی مێزی میوانان هەمیشـە خـۆمم لـەبیر دەکـرد. بەرەو چێشتخانە چووم و گوتم «ئێوە دەس پێبکەن ، ئەمن ئەوە هاتم.» کەس چاوەڕێی خولـّق کردن نەبوو، گشتیان خەریکی خواردن بوون. جگە لە ئێمیـل و ویوڵێـت کـە لـە پـاڵ یـەکتر دانیشتبوون و قسەیان دەکرد. چاوم بە نینا کەوت کە بە چاو تروکاندن هێمـای ئـەو دووانـەی دەکرد. خەریك بووم لە ژوور وەدەر دەکەوتم کە ئێمیلم دی لێوەکانی وێکنابوو و زەق چاوی دە ویوڵێت بڕیبوو. چاو تروکاندنی نینای دیبوو؟

لە نێوەڕاسـتی چێشـتخانە وەسـتام. بـۆ دڵەکوتـەم لێبـوو؟ بـۆ برسـیم نـەبوو؟ بـۆ وازی زۆریانەوەی سەر مێزم نەبوو؟ بۆ شەو کۆتایی پێنەدەهات؟ دەستم کرد بە شـۆردنی قاپـەکانی شەوچەرە و شەربەکانی خواردنەوە. ئێمیل چ قسەیەکی پێم بوو؟ هەر ئێستا لە بابەت چییەوە لەگەڵ ویوڵێت دەئاخۆت؟ بۆ جاڕز ببووم؟ کۆلێرەکان بۆچی فێنکاییان نەدەدا؟ هەر کە دەنگـی قیژەم بیست لە چێشتخانە دەرپەڕیم.

ویوڵێت وێستابوو و دە جلە سپیەکەی رامابوو، دامێنەکە پەڵەیەکی گەورەی سەوز رەنگی تێکەوتبوو. ئێمیلی زاری بەهەر دوو دەس گرتبوو و لێکدا لێکدا دەیگوت «ببوورن، لە دەستم بەر بۆوە، ببوورن.» قاپی ترشی لە سەر عەردی سەرنخوون ببوو.

دایکم گوتی «زووکەن خوێ بە پەڵەکە دابکەن.» و خوێدانەکەی دایە دەس ئارتووشی بیدا بە نینا کە دەسماڵ قاقەزی لە جلی ویوڵێت دەخشاند، گارنیك گوتی «هیچ نیە. پەڵەی ترشـی

ئاوی وێکەوێ پاك دەبێتەوە.» ئالیس گوتی «قەزا و بەڵا بوو.» یووپ گوتی «گـازا چـی؟» و ئالیس دەستی کرد بە روونکردنەوە. ئێمیل بە ئێمیلی گوت «ئەتۆ کە ترشیت پێخـۆش نیـە، بۆچی قاپەکەت راکرد؟» سەر کۆنەی نەدەکرد. هەر دەیپرسی. ئێمیلی چڕ و چاوی تێك نابوو، نینا گوتی «دەستی وێکەوت. خۆ بـە ئانقەسـتی نـەبوو.» چـاوم لـە ئێمیلـی کـرد. دەسـتی وێکەوت بە ئانقەست نەیکرد؟

لەگەڵ ویۆلێت چوومە دەسشۆری و پەڕۆیەکی خاوێنم هێنا پەڵەکە پا بکاتەوە. پەڕۆی لـە دەستم رفاند، زوو زوو لە جلی خشـاند و لـە ژێـر لێـوەوە بۆڵانـدی «منـداڵی نـەفام، جلـە دلڕفێنەکەمی پیس و پۆخڵ کرد. لە لەندەنێ بە دیاری هێنابوویان، چەندم خـۆش دەویسـت.» پاشان پەڕۆکەکەی فڕێدا عەردی، قـژەکانی لەبـەر نـەینۆکی دەسشـۆری رێـك و پێـك کـرد و هەروەك ئەوەی من لەوێ نەبم، گوتی «کچەتیوەی بەدرەسەن. راوەستە. دەرسـێکت پـێ بـدەم کەیفی پێبکەی.»

زۆریامەوە لای مێز. ئێمیل لە جێوە رابوو و هەتا ویۆلێت دانیشـت هـەر بـە پێـوە بـوو. ئێمیلی لە پاڵیەوە وێستابوو گوتی «داوای لێبوردن بکە.» ئێمیلی بە دەنگێکی بەرزەوە گوتی «ببوورن پەڵەم خستە جلە کەشخەکەتان.»

ویولێت بە دەم زەردەخەنەوە دەستی نایە سەر کوڵمەی ئێمیلی. «ئازیزەکەم، هـەر وەسـەر خـۆتی مەیەنـە. هـەر بەڕاسـتی زۆریشـم کـەیف پێنـەدەهات.» ئێمیلـی کشـاوە دواوە و وەدەرکەوت. ویۆلێت چاوی لەمن کرد و بزەی هاتێ. «دەستاوتان خۆشە.» چـاوم لـە دەوریـی ئێمیل کرد. بڕێ سالاد و ئیکڕای تێکردبوو. داهاتمەوە تەبەقی دۆڵمە راکەم خولقی بکـەم کـە سووفی و دووانەکان بە هات و هاوارەوە رایانکردە ژوورێ.

ئارمینە قیژاندی «بۆقێکی هێندی کیسەڵێك خۆی هەڵدایە نێو جۆلانە.»

ئارسینە گوتی «بۆقێکی هێندی کیسەڵێك.»

سووفی رووی دەمن کرد و گوتی «پووری، ئیرەیی بـە شەمشـەمە کوێرەکـان بـرد.» و لـە پێکەنینان لەخۆ بۆوە.

نینا گوتی «چی؟» سووفی دەستی بە گێڕانەوەی حەقایـەتی "پاروانـا" کـرد. نینـا قـاپی چێشتی لە دەستی سووفی وەرگرت و گوتی «باشە، باشە. هەڵێ بڕۆ. جارێ وەختی حەقایـەتان نییە.» سووفی گوتی «ئەتۆ قـەت حەقایـەت ناگێڕییـەوە. پـوورە کلاریـس بـۆی گێڕاینـەوە.

حەقایەتێکی زۆریش خۆش بوو.» قژی نێوچاوانی سووفی لادا و لەگەڵ دووانەکان ناردمە دەرێ. «بزانن بۆق و شازادە خاتوون چ دەکەن.»

گارنیك گوتی «بەسەرهاتی "پێگۆف" و "شەمخاڵ"تان بیستووە؟»

نینا گوتی «کێ؟ چمخاڵ؟»

گارنیك گوتی «چمخاڵ نا، شەمخاڵ. بەرپرسی پێوەندی گشتی کۆمپانیا.»

نینا گوتی «ئەها، کەوابوو چمخاڵ.» قاقا پێکەنی و رووی تێکردم. «ئیکرا یەگجار خۆش بووە.»

دایکم گوتی «فرە تیژ بووە. ئەگەر تەماتەکەی کەبابی بووایە باشتر بوو.»

گارنیك گوتیە ئارتووش «ئەتۆ دەتزانی شەمخاڵ وەلیعەهدی داغستان بووە؟»

ئارتووش دۆڵمەی دەسدایە، «هێندێ شتم بیستبوو.» روانیمە دەوریی ئێمیل کە هێشتا دۆڵمەی رانەکردبوو.

گارنیك قاپەکەی بۆ لای نینا راداشت. «خۆرێشت تێدەکەی؟ لەو فسنجانەی کلاریس هەر چەندەکی بخۆی کەمت خواردووە. بیری لێ بکەنەوە. کوڕی پاشای پێشووی داغستان ئێستا بۆتە میوانداری باڵوێزی یەکیەتی سۆڤیەت.»

نینا گوتی «لە راستی دا داغستان کوێیە؟ خاتوون وسکانیان پێپسیتان بۆ تێکەم یا کانادا؟»

یووپ بە دەم کۆخەوە گوتی «ئیزنم پێدەدەن ئەمن بیگێڕمەوە؟» و باسێکی دوور و درێژی لەبارەی داغستان یا خۆی گوتەنی داگستانەوە کرد کە لە جێنارەتی زەریای خەزەر و گورجستان هەڵکەوتووە و چون وڵاتێکی شاخاوییە هەر بۆیە ناوی داغستانی بەسەر دابڕاوە و لە تورکیدا داغ بە واتای کێوە و تا بەر لە شۆڕشی رووسیا پاشای بووە و بە دوای هاتنە سەرکاری کۆمۆنیستەکان سەر وە کۆمارەکانی یەکیەتی سۆڤیەت بووە و پاشا بەرەو ئەورووپا دە لینگانی وەرێناوە وێستا کوڕی هەمان پاشا بۆتە بەرپرسی پێوەندی گشتی کۆمپانیای نەوت لە ئابادانداناد.

هەموو کپ و بێدەنگ بۆ چەند ساتێ دە یووپ رامابین هەتا ئەوەی ئالیس چەپڵەی لێدا و گوتی «هەر بژی! ئاگاداریەکی زۆر دروست و تەواو.» یووپ سوور هەڵگەڕا، «ئۆگرییەکی فرەم بە مێژوو و جوغرافیا هەیە.» گارنیك لای لەمن و نینا کردەوە و لەسەر خۆ گوتی «ئەگەر

هەڵەم نەکردبێ دەبێ سیخورِ بێ» و لە تریقەی پێکەنینی دا. نینا بە تەشەرەوە گوتی «دیسان تەرِ زمانیت کرد؟»

گارنیك بە دەنگێکی بەرز گوتی «بە کورتی — لەکاتی سەردانی پێگۆف لە پالاّوتنگەدا، شەمخاڵ هاورِێی هێندێ بەرپرسان و کاربەدەستانەوە دەچنە پێشوازی. ولیعەهدی پێشوو و باڵوێزی یەکیەتی سۆڤیەت لە سەرەتا دا زۆر بە وردی دە یەکتر دەروانن.» هەستا سەرپێ و وێستا و کەوچك و چەنگاڵ بەدەس ئۆینی چەپ چەپ روانینی دەرێنا. «دەور و بەر دڵەراوکێی ئەوەیانە نەوەکو کێشە ساز بێ.» بە کەوچك و چەنگاڵ ئۆینی شەمشێربازی دەرێنا. «دوای ئەوە کۆمۆنیستی ئاورگەم و راسەقینەخوازی هیوابراو تۆقە دەکەن، کەوابوو بە زمانی رووسی چاك و خۆشی دەکەن، هەموو پشوویەکی راحەت دەکێشن.» نینا گوتی «هۆی چاولێکە! کەوچك دە چاوی ئاغای بێرت لەنکستێر راچوو.» و دەوریی پلاّو و خۆرێشتی بۆ لای گارنیك برد. گارنیك دانیشت و پاشەوەی پێکەنینەکەی تەواو بوو گوتی «شەمخاڵم چەند جار دی. مێرێکی چەندە شۆخ و خۆش خولّق و فرە خوێندەوارە. بە پێنج شەش زمان دەئاخوێ. وەی وەی لەو فسنجانەی.» سالاّدی تێکرد و گوتی «دنیایەکی سەیرە. پاك کەرەوەیان دەسداوەتێ و ولاّتەکان لەسەر نەخشە پاك دەکەنەوە.»

ئارتووش گوتی «هێشتا وەختی ئەوە نەهاتووە فلاّنستان و بێهمانستان پاك بکەینەوە و بنووسین بەرابەری؟»

گارنیك دەستی بۆ قولێنەی سەوزی خواردن برد، « و گشتمان رووسی باخۆین و ماکسیم گورکی وەخوێنین.»

من و نینا گوتمان «دەس پێمەکەن.» و ماوەیەك کپ بوون. هەر ئالیس و دایکم بوون کە شێوەی دروست کردنی فسنجانیان شی دەکردەوە، ئێمیل شتێکی بە بن گوێی ویۆلێت گوت و بە دوو قۆڵی پێکەنین. نینا بە گارنیکی گوت «کەوابوو چەمخاڵ، ها؟» گارنیك لێوی نینای قورنجی و گوتی «شەکرۆکە.»

یووپ شتێکی بۆ ئالیس دەگێراوە و ئێمیل و ویۆلێت دیسان سرتە سرتیان بوو. هەتا هاتم بیر لەوە بکەمەوە باسی چی دەکەن، ئالیس گوتی «گوێ بدەنێ.» پاشان بە یووپی گوت «بیلێ، بیلێ.» یووپ سوورهەڵگەرِا و سەری راوەشاند. ئالیس رووی لە ئێمە کرد. «گوێ بدەنێ.» کێ دەزانێ برِەیم و بوواردە یانی چی؟». پاشان زۆریا لای یووپ، «ئەتۆ ئەوانە لە کوێ فێر بووی؟» یووپ دیسان سوورهەڵگەرِا و ئالیس رووی لە ئێمە کرد و گوتی «دەی؟

کەس نازانێ؟ بڕەیم ناوی جۆرە خورمایەکە، بەر لەوەی ئینگلیزییەکان زەویەکانی ئابادان بکرن، گەرەکی بڕەیم بە گشتی دارستانی ئەم چەشنە خورمایە بووە.» گارنیك گوتی «تەح تەح لەو دۆڵمەیە، دیارە خورماش فرە بەتام و چێژە.» یەکەمجار بوو کە ئارتووش بە سەرنجەوە گوێی بۆ قسەکانی خوشکم شل دەکرد. ئالیس کەوچك و چەنگاڵی نایە نێو دەوری و سینگی رەپێش خست. «جا گوێ بدەنە پاشماوەکەی. ئەگەر زانیتان ناوی بووارده لە کوێوە هاتووە؟ نازانن؟ گشتی ئەم عەردانە هی مێرێکی عەرەب بووە کە کیژێکی ئێجگار جوانی بووە بە ناوی "وەردە" لە عەرەبیدا بە گوڵ دەڵێن وەردە.» رووی دە یووپ کرد. «راستم گوت؟» یووپ سەری راوەشاند و ئالیس درێژەی پێدا «بە مێری عەرەبیان دەگوت "بوو وەردە" واتا "باوکی وەردە". ئینگلیزی یەکان کە عەردەکان دەکرن، گەرەکەکەیان بە ناوی خاوەن عەردەکە دەکەن، "بوو وەردە" وردە وردە دەبێتە بووارده». سەری بۆ لای راستی لار کردەوە، «بوواردەی باکوور» ئەوجار بۆ لای چەپی لار کردەوە «بوواردەی باشوور.»

ئارتووش گوتی «چ سەرنج راکێش.» گارنیك لە ژێر لێوەوە گوتی «گوتم سێخوڕی شتێ ـــ » و بە سێخوڕمەی نینا بێدەنگ بوو. ئالیس چاوی دە یووپ بڕی. «چ ئاگاداریگەلێك. هەربژی!» یووپ دیسان سوور هەڵگەڕا و پێکەنی. دایکم قوڵینەی سەوزی لە پێش هەموان راگرت، بیرم بۆ ئەوە چوو کە ئەگەر حەقایەتی یووپ راسەقینە بێ، باوکی "وەردە" لەو مێرە عەرەبە دەگمەنانەیە کە لە بری کوڕ بە ناوی کیژ ناسراوە. یووپ و ئارتووش بە یەکەوە دەئاخۆتن. یووپ گوتی «رەنگە ئاوسانە بێ، هەڵبەتە.» ئارتووش گوتی «راسەقینە یا ئاوسانە، سەرنج راکێش بوو.»

مێزی شێوم کۆکردەوە و پێم وابوو کەس تێنەگەیی شێوم نەخوارد، ئێمیل گوتی «دۆڵمەکە ئێجگار بەتام بوو. ئەگەرچی خۆت دەمت لەچێشتەکە نەدا.» و یارمەتیدام. دایکم گەیشتێ. «ئێوە فەرموون، کۆکردنەوەی مێز کاری پیاوان نییە.» ئێمیل بەرەو نینا چوو کە خەریك بوو بانگی دەکرد و دایکم لەژێر لێوەوە بۆڵاندی «ئەی کە قینم لە پیاوی ژنانەیە. لەکاتی شێو خواردندا بیستت یووپ چی بە ئالیس گوت؟ گوتی ـــ » قاپە پیسەکانم لەسەر یەك دانا و رامکرد. بەرەو چێشتخانە چووم و لە دڵی خۆمدا گوتم «نەم بیست و ناخوازم ببیسم. وازم لێ بێنن.»

نینا کە ویستی بڕوا بە سرتە پێی گـوتم «پـێم وایـە جـوور بـوو.» ویوڵێـت هـەر گـوتی «سوپاس.» و دایکم گوتی «لەبیرت بێ فسنجانەکە دە قاپێکی فەغفووری بکەی.» مـاڵاوایی و سوپاسی یووپ پێنج خولەکی خایاند. دەرگەی ماڵێی لەسەر هەمووان داخست.

خەریکی شوردنی قاپ و قاجاغ بووم کە سەر و کەلارەی ئـارتووش لـە چێشـتخانە پەیـدا بوو، پاڵی وە قاپشۆریدا و گوتی «کیژەکان داوای حەقایەت دەکەن.» و پێکەنی. لـە هـەوەڵی شەوێوە یەکبین پێدەکەنی. گوتم «وازی حەقایەت گوتنم نییە.» چاوێکی لێکـردم. «بۆچـی؟» چاوم لێی نەکرد. «شەکەتم.» بە ردێنە بزن ئاساکەی کایەی دەکـرد. لام لێکـردەوە و مـاوەێی لێی ورد بوومەوە. پاشان گوتم «بۆ ردێنەکەت ناتاشی؟»

# ٣٤

دە ماڵێکی فرە مەزندا بووم کە داڵان و چەند هۆدەی سـەروەیەکی بـوو. مرۆڤـانێکی زۆر دەهاتن و دەچوون کە هیچ کامیانیم نەدەناسی. دەستی دووانەکانم گرتبوو و گەرەکم بوو بچمە دەرێ و بە ڕێگەی دەرکەوتنم نـەدەزانی. قەشـەیەکی بـاڵا بـەرز هاتـە پـێش و گـوتی هـەتا مەتەڵەکەی هەڵنەدەم ناشێم وەدەرکەوم. پاشان دەستی دووانەکانی گرت و رایکێشان و لەگەڵ خۆی بردنی. بە دوای قەشەو دووانەکاندا رامکرد.

لە حەوشەیەکی ئێجگار مەزندابووم، چوار دەوری هۆدە بوو. ئەستێرکێکی خڕی بێ ئاو لە جەرگەی حەوشە دا هەڵکەوتبوو. دەگریام و دووانەکانم بـانگ دەکـرد کـە ئـافرەتێکی گـەنج منداڵ بە باوەشەوە لە دەرکەی حەوشە وەژوور کەوت. دامێنێکـی سـووری لەبـەر دابـوو کـە عەردی دەماڵی. دووانەکانم بانگ دەکرد و دەگریام و ئافرەتی دامـێن سـوور پێدەکـەنی و لـە دەوری ئەستێرك سەمای دەکرد و منداڵەکەی هەڵداویشت و دەیگرتەوە.

لە خـەو راپـەڕیم . پشـووم سـوار ببـوو و شـەڵاڵی ئارەقـە بـووم. ئـارتووش خـەوتبوو، سەرچەفەکەم لا دا. ژاکێتێکی تەنکم لەسەر جلی خەو لەبـەر کـرد، سـەرپایەم لـەپێ کـرد و چوومە حەوشە. هەوا بوومەلێڵ بوو. بۆنی گوڵی سـێوەرە دەهـات و گوڵـە سـوورە خونچـەی تازەی دەرکردبوو.

چەند جار لە نێوان ڕێگە باریکەکەو دەرگە ئاسنییەکە دا هاتم و چووم و بیرم لەو خەونـەی دەکردەوە کە دیبووم.

لەسەر جۆلانەکە دانیشتم کە بە هۆی شێدار بوون و ڕتووبەتەوە تەڕ ببوو. لقی دارەبیـەکان نەدەگەیشتە پاڵگەی جۆلانەکە. ماڵی خەونەکەم ناسیاو نەبوو. قەشەم نەدەناسی و مەتەڵەکەم لەبیر نەمابوو. تەنیا هەر حەوشەو ئەسـتێرکە خڕەکـەم لـە حـاڵی ئاسـاییدا دیبـوو. تـەڕایی جۆلانەکە ئازاریدەدام.

رابووم و بەرەو حەوشـەی پشـتە ڕۆیـیم. دووانـەکان قولکەیـەکیان لـەنزیك شـێرەی ئـاو هەلکەندبوو. یەکێ لە کایەکانیان ئەوە بوو کە قولکە پڕ بکەنەوە، بەرد و گیا و گڵ دە قولکە بکەن، بە قوڵە دارێکیش لێکی بدەن و بڵێن ئاش دروست دەکەین.»

دایکم گوتی «نێوان ئیسفەهان و "نەماگەرد" دوو سەعاتەڕێ نابێ.» بەڵام ئەو دەم کە دە پازدە ساڵانە بووم ڕێگەکەم دوور و درێژ دەهاتە بەرچاو.

ئالیس لە درێژەی ڕێگە دا ورتاندبووی. «ئەدی کەی دەگەینێ؟»

دایکم گوتبووی «دەچینە نەماگەرد ڕۆن بکڕین.» باوکم کەیفی بەو چێشتانە دەهـات کـە دایکم بە ڕۆنی خۆماڵی لێیدەنا.

دەس لەناو دەستی باوکم بە کۆلانە تەسکەکاندا دەڕۆیشتم و لە منداڵە لـەڕ و چـڵکنەکان ورد دەبوومەوە کە بە دیوارە کاگڵی یەکانەوە مەلاس ببـوون یـا لـەو دیـو پەنجـەرە خـێچ و خوارەکانەوە لە مسافیرە شارەییەکان زەق ببوونەوە.

ئالیس بێ نێوبڕ بۆڵەی دەهات. «لەبەر تۆز و خۆڵ خەفە بووم.» بەڵام ئەمن هۆشی گەرما و تۆز و خۆڵم نەبوو. لە ئافرەتانی گوند ورد دەبوومەوە کە جلگەلی ناوچەییان لەبـەر دابـوو و گەنجەکان دەمی خۆیان بە سووچی لێچکە ڕەنگاو ڕەنگـەکانیان گرتبـوو. هۆیەکـەییم کـە لـە دایکم پرسی، لەبەر گەرما و تۆز و خۆڵێکی کە بە هۆی شەماڵەوە وەسەرو چاومان دەکـەوت، بە بێ وازی گوتی کیژە گەنجەکان نابێ لەنك* دایـك و بـاوك یـا خەسـوو و خـەزوور بـاخۆن. لێچەکی زەرد و سوور و سەوز تەنیا ڕەنگ گەلێك بوون کە لە نێو دێ دا دەمـدی. ئـەوی تـر هەمووی هەر بۆر بوو.

لە حەوشەیەك وەژوور کەوتین. ئـالیس دەسـتی دایکمـی رادەکێشـا کـە «بگەڕێینـەوە.» ئەستێرکێکی بێ ئاو لە جەرگەی حەوشـە دابـوو. چـوار دەوری حەوشـە هـۆدە هـۆدە بووکـە دەرگەی گشتیان لە دار بوو بە بـەردە نووسـگەلێکی شووشـەیی کـە تـۆز و خۆڵیـان لەسـەر

نیشتبوو. چەند ئافرەتی گەنج لە سووچی حەوشە دەوری تەندووریان ئەنگاوتبوو و نانیان پێــوە دەدا. ژنێکی پیر یەکبین رەخنەی لە کارەکەیان دەگرت و دەیپرتاند.* باوکم لەگەڵ مێری خاوەن ماڵەکە کە یەکی چاو زەق و لە باوکیشم بەخۆوەتر بوو دەئاخۆت. ئالیس بێ نێوبڕ نقەنقی بوو. بە بێدەنگی چاوم لە دەور و بەر دەگێڕا و هەستم دەکرد ئێستایەکە دەبێ دەس بە گریان بکەم.

ئافرەتێکی گەنج لە دەرگەی کریاوەی ماڵەوە وەژوور کەوت، بـالاّ بـەرزو لـەر و پێخـاوس بوو. گیاوشکێکی زۆر دە قژە ئالۆزو درێژەکەی کەوتبوو. سەگێکی لەڕ و گڕوێی لەگـەڵ بـوو. ئافرەتەکە هەر کە چاوی بە ئێمە کەوت لە تریقەی پێکەنینی دا، ئالیس کـپ بـوو و بـە دوو قۆڵی لە ئافرەتەکە وردبووینەوە کە گۆرانی دەگوت و لە دەوری ئەستێرکی بێ ئاو دا سـەمای دەکرد. سەگەکە لەبەر دەرگەی حەوشە وەرکەوتبوو و دەیلووراند. بـۆ مـاوەیێی هـەر دەنگـی گۆرانی ئافرەت و هاش و هووشی با و لوورە لووری سەگ دەهات. مێری خانەخۆێ داهاتەوە و کوتە دارێکی لە عەردی راکرد. روو لە ئافرەتەکە هەڵیسووڕاند و گوڕاندی «بـڕۆ، بـڕۆ دەرێ. حەیات بێ» ئافرەتە گەنجەکان لە ژێـر دەم بێنەکانـەوە پێکـەنین و ژنـەی پـیر پێمـانی گـوت «مەترسن، شێتە بەلاّم بێ ئازارە.» پاشـان وردکـە بـەردێکی لـە قـەراغ تەندوورەکـە راکـر، تووڕیدایە لای ئافرەتەی دین و گوڕاندی «حەیات بێ.» ئافرەتەکە دەموچاوی خۆی بە هەردوو دەس گرت و دایە گریان ، پاشان جارێکی تر گۆرانی گوت و بـە دەم سـەما کردنـەوە لەگـەڵ سەگەکەی لە دەرگەی حەوشە دەرکەوت.

دایکم لەکاتی گەڕانەوە بۆ ئیسفەهان گوتی خەڵکی جولفـا دینـەکان دەبەنـە نەماگـەرد. بنەماڵەگەلێك هەن کە بۆ راگرتنی دینەکان پارە وەر دەگرن. هـەتا ئیسـفەهان هـەر گریـام و ئالیس چەند جار پرسی «تۆز و خۆڵ بنەی هات، هەواکـەش فێنـك بـووە، ئـەی گریانەکـەت لەچیە؟»

چەند جار بە دەوری دارە مۆرتك و کەردووی سەوزیدا گەڕام. داهاتمەوە و سەوزیەکانم بـژار کرد سێ چوار مۆرتکی وشك کەوتبووە ژێر دارە مۆرتك. رەنگیـان رەش دەینوانـد. مۆرتکـە وشك و رەشەکانم هەڵگرتەوە. ئەوجار لە عەردی دانیشـتم. پـاڵم وەدارەکـە دا و مۆرتکـەکانم ئەودەس ئەو دەس پێکرد.

سەرم هەڵێنا و روانیمـە لقـی دارە مۆرتکـەکان. یوومـا گوتبـووی یـا لـە جێگایـەك دا خوێندبوومەوە کە دار مورتك هەمان داری "سێدر"ە کە سـێدری سـەر شـۆری لـە گەلاّکـەی دروست دەکەن؟ بیرم بۆ ئەوە چوو کە چەند دارمان هەیە کە بەرەکەی لەگەڵ ناوی دارەکە یـەك

نییە؟ سێدر، بەرەکەی مۆرتك و نەخل میوەکەی خورمایە، دارێکی تر کە هاوناوی بەرەکەی نەبێ بە زەینم نەگەیی. گوتم چ باشتر کە هەر دوو دارمان لە ئابادان دا هەیە. لەجێوە رابووم. مۆرتکە وشك و رەشەکانم توورِ دایە نێو سەوزیەکان و گەرامەوە ژووری خەو. جلەکانم بە بێدەنگی لەبەر کرد. نووسراوەیەکم لەسەر مێزی تەلەفۆن بەجێ هێشت و لە ماڵ دەرچووم.

# ٣٥

کلێسا تاری بوو و بۆی کوندری لێدەهات.

خێزانی خزمەتکار دەرگەی کردەوە و لەمەرِ نەخۆش بوونی زارۆکەکەی بۆمان دوا و ئەمنیش برێ پوولم پێدا. گوتم پێویست ناکا چراکان هەڵکەی و کوندریش ناخوازم و دەرگەی کلێسام لە پشتەوە را گاڵە دا.

لێچکەکەم لەسەر مێزی نزیك دەرگە راکرد و کردمە سەرم. خاچم کێشا. بەسەر فەرشی عەننابیدا تێپەرِیم و بەرە و مێحراب چووم. لەسەر یەکێ لە دوو قەنەفەی ریزی پێشەوە دانیشتم و نازانم تا چ ماوەیێ لە وێنەی سەردەمی منداڵی مەسیح رامام کە لە باوەشی داکیدا بوو، هەتا ئەوکاتەی رووناکایی بەربەیان لە پەنجەرەی رەخ مێحراب و لەو بەر شووشە رەنگییەکانەوە هاتە ژوور و کلێسا نەختێ رووناکایی تێزا.

چاوم لە شەمدانییەکانی مێحراب و گوڵدانە زێوینە مەزنەکانی مێحراب کرد کە گوڵی پلاستیکیان تێدابوو و هەر وەها دە جامی شەرابی پاقژ و حەمایلی بە ئاڵتوون دروای قەشەی رەخ جامەکە رامام. گشتی ئەوانەم گەلێك جار دیبوو، بەڵام هەر دەتگوت یەکەمجار بوو چاوم پێیان دەکەوت.

وێنەگەری مەسیح شێوەی سەردەمی منداڵی ئارمەنی دەدا. کەوتمەوە بیر وتەکەی نینا. «هەر کە ئەم وێنەگەرییە دەبینم منداڵییەکانی تێگرانم بیر دەکەوێتەوە.» پێم وابوو مەسیح وەمنداڵی دووانەکانیش دەچێ و بە گشتی مەسیح شێوەی منداڵی هەموو منداڵەکان دەدا.

هەناسەیەکی قووڵم کێشا. چۆکم دادا. خاچم کێشاوە، چاوم نووقاند و خوێندمەوە: «ئەی باوکی گشتمان کە لە ئاسماندای. ناوت پاقژ بێ.» یەکەمجار ئەم دوعایەم کەی خوێندبۆوە؟ «مەزنی تۆ شایانە. مەیل و ئیرادەت بەو چەشنە کە لە ئاسماندا رەنگ دەداتەوە لەسەر

عەردیش دا وێنەی ببێ.» دوایین جار کەی بوو؟ «بەشە رزقی ئیمڕۆمان پێبەرە. چاو لە قەرزەکانمان بپۆشە، هەر وەتر ئێمەش لە قەرزدارانمان خۆش دەبین.» دەتگوت یەکەمجار بوو دەمخوێندەوە. «و ئێمە تاقی مەکەوە بەڵکو لە ئاکارە چەوتەکانمان رزگار بکە.» دوعاکەم تەواو کرد. «چونکە مەلەکووت و هێز و تووان و شکۆ و مەزنایەتی بۆ هەمیشە لە تۆڕایە.» چاوم کردەوە «ئامین.» خاچم کێشاوە و دیسان دە وێنەی مەسیح و مەریەم رامام. مەریەم شاڵێکی شینی لە کۆڵ بوو و مەسیح دە پەڕۆیەکی زەرد دا قۆنداغ پێچ کرابوو و لە باوەشی دایکیەوە بوو.

پێیەکانم تەزیبوون، لە جێوە رابووم و بەرەو مێزی مۆمەکان چووم. پوولم دە سندووقە دارینە چکۆڵەکە کرد و وەك هەمیشە حەوت مۆمم راکرد. شەش دەنکیان بۆ منداڵەکان و ئارتووش و ئالیس و دایکم و مۆمی حەوتەم بۆ باوکم. مۆمی حەوتەمم هەڵکرد و لە ژێر لێوەوە گوتم «یارمەتیم بدە.»

بە دەوری کلێسا دا گەڕام. نزیك شوێنی کۆڕی گۆرانی، لە پاڵ کۆنە ئۆرگ، تەتەڵەگەلێکی بچکۆلە کە خەڵك بۆ وەدەس هێنانی ساغ و سلامەتی یا وەدیهاتنی قەست و نییەتەکانیان پێشکەشی کلێسایان کردبوو.، بەدیوارەوە هەڵواسرابوون. ئەو گشتە ساڵە، ئەو هەموو جارە هاتبوومە ئەم کلێسایە، ئەم تەتەڵانەم قەت بە وردی نەخوێندبۆوە. زۆربەیان بە زمانی هەرمەنی بوو، چەند دانەیەکیان ئینگلیزی و بەردێکی چکۆڵەی مەڕ مەڕ کە بە زمانی فارسی لەسەری نووسرابوو:

مەریەمی دەژ*، دایکی داخدار

بە برینەکانی رۆڵەکەتم سوێند دای و

رۆڵەکەمت بۆم گەڕاندەوە.

دەستم بە بەردە چکۆلەکە دا هێنا و گوتم «ئافرەتەی بەستەزمان.» کە گەیمە بەر دەرگەی کلێسا لە خۆمم پرسی «بەچی را بزانین دایکی منداڵە نەساخەکە تەتەڵەکەی پێشکەش کردووە نە باوکی؟» زۆریامەوە لای مێحراب ، خاچم کێشاوە و وەدەرکەوتم.

بەرەو ماڵ بوومەوە. هەواکەی گەرم و دڵگر بوو. لەمێژبوو چێژم لە گەرما نەدیبوو؟ مابوو بگەمە سینەما تاج، چاوم لە دەستە راست کرد. لە بنەبانی کۆلانی بنبەست دا، دەرگە مەزنە شینەکە وەك هەمیشە داخرابوو و پاسەوانێکیش روژان ئاسا لەبەر دەرگە وێستابوو. بیستبووم گەڕەکێکی وەك بازاڕی کوێتییەکان لەوبەر دەرگە شینەکە دا هەیە کە قاوەخانە و دووکان و

ماڵی تێدایه. ئافرەتانی ئەوبەر دەرگەی شین پێدەچوو ساڵ بە ساڵ لاقیان لەو گەڕەکە نەدەنایە دەرەوە. زۆرجار پێم خۆش بوو ئەوبەر دەرگەی شین ببینم بەڵام لێم روون بوو ئەمکارە دژوارە.

مێرێکی عەرەب پێنج شەش بزنی وەپێش خۆیدا بوو و بە پیادەڕێدا دەڕۆیی. مێرێکی تری عەرەب بە سواری دووچەرخە لەگەڵی دەهات و بە یەکەوە دەئاخۆتن. دووچەرخە سوار هەوڵی ئەوەی بوو پێ بە پێی هاورێکەی باژوێ و تەگەری پێشەوە یەکبین بەولاو بەو لا دا دەچوو، بۆی گازی پالاوتنگە دەهات و ئاسمان ساو و پەڵە هەورێکی لێ بەدی نەدەکرا.

لەجێ جێی شەقامدا دارخورما بەرەو ژوور هەڵچووبوون و کۆمەڵگەلی گیاو گوڵ لە چەندین شوێنی دا بەرچاو دەهات. پێیدا رۆیشتم هەتا گەیمە سینەما تاج. ئەم گشتە ساڵە لە ئابادان بووم و هەموو جارێ سەرم لە جیاوازی نێوان بەشی کۆمپانیا نەوت و شوێنەکانی تری شار سوڕ دەما. هەر دەتگوت لە چۆلەوارێکی بێ ئاو گیا را پێت دەنایە ناو باغێکی سەوزەوە.

هەر دوو بەری شەقامە پانەکان ، خانووبەرەی یەك چەشنیان لێ دروست کرابوو بە شمشادگەلی یەکدەستەوە کە وەمندالانێك دەچوون کە تازە لە ئارایشتگا گەڕاونەوە. بەڕیز وێستاون و چاوەڕێی نازمن کە بێ بلێ «بەهـ بەهـ، مندالی چەند پاك و خاوێن و رێك و پێکن.»

لامدایە شەقامەکەی خۆمان. تەنیا دەنگی سیرسیرە و قیرەی نێو بە نێوەی بۆقەکەمان دەبیسرا. دە دەور و بەرم روانی و پێم وابوو ئەم شارەگەرم و کپ و سەر سەوزەم پێخۆشە دەرگە ئاسنیەکەی حەوشەم کردەوە و وەژوور کەوتم.

ئارتووش و مندالەکان لە چێشتخانە بوون. دووانەکان پەشێو و بە پەرۆش تێم روانین و هەر کە بزەی سەرلێومیان دی ئامبازم بوون. ئارمەن هاتە پێش و کولمەکەییم کە ماچ کرد کشاوە. ئارتووش گوتی «قاوە دروست بکەم؟»

هەلۆیستی مندالەکان ئەوە بوو کە بۆ فراوێن نەچینە یانە. ئارمینە گوتی «دەبێ وانەکانمان بخوێنین.» ئارسینە گوتی «چی وای بۆ تاقیکردنەوەکان نەماوە.» چێشتەکانی دوێ شەوم گەرم کردەوە.

ئارتووش دۆلمەی لەگەڵ پلاوی سپی خوارد و گوتی «بە گوێی دایکت نەگاتەوە، دۆلمە لەگەڵ پلاوی سپی زۆر خۆشە.» گەلێك جار لەبەر ئەوە کە دایکم گوتبووی هەرمەنیەکانی جولفا دۆلمە لەگەڵ برنجی سپی دەخۆن پێی پێکەنیبوو. کاتێ لەسەر مێز هەلدەستا گوتی «چێشتەکانی دوێ شەو لەو پەڕی خۆیدابوو. بەتایبەت دۆلمەکە قسەی لەسەر نەبوو.»

# ٣٦

ئاشخێن تۆزی دۆلابەکانی ژووری خەوی دەتەکاند و یەك بین دەئاخۆت.

«کلاریس خاتوون گیان، دەبەر بەژنت مرم، لە دلّت گران نەیە، بەلاّم پێم خۆش نییە لە مالّە خاتوون سیمۆنیان کار بکەم. لە لایەکەوە تێی هەلّپێچاوم کە رۆژی هەینی هەر دەبێ بێی. هەینی میوانم هەیە، شووەکەم حەمامێ دەکا، هەزار بەدبەختیم هەیە، سەرەڕای ئەوە لە هەموو کارەکانم رەخنە دەگرێ. "بۆ ئاوات شۆرد؟ بۆ وەهات ئوتوو کرد؟" پاشان بێ نێوبڕ لەگەلّ کوڕ و نەوەکەی کێشەیەتی، کوڕەکەی ئێجگار باشە. لام تا کام قسە ناکا. بەلاّم نەوەکەی — وەی، وەی، وەی چ مار برژێنێکە. زمانی هێندەی ترێزووێیکە. جوون دەدا و شت داوێ و هەرچی لەبەر دەستی بێ بە مقەست وەرێدەگەڕێتێ و —» پەڕۆی تۆز تەکێنی دانا. «لە پالّ تەلەفۆنەوە بیستم بە یەکێکی دەگوت "ئەگەر ئەمنت خۆشدەوێ دەبێ بدەی لە بناگوێی ئاغای وازگێن" کلاریس خاتوون گیان خۆ دەیناسی؟ مامۆستایە —»

ئاشخێن کە تۆز تەکاندنی لەبیرکردبوو پێم گوت ئاغای وازگێن دەناسم و دوای خاوێن کردنەوەی دۆلابەکان بچێ دۆشەکچە راحەتیەکانی ژووری دانیشتن بتکەکێنێ.

لە ژووری خەو هاتمە دەر و بە خۆمم گوت «کچەتیوە نازانم لە پالّ تەلەفۆن لەگەلّ کێی بوو؟ ئارمەن؟ نەکا ئارمەن بدا لە بناگوێی —» بەرەو زەنگی تەلەفۆنەکە چووم. دەبووا لەگەلّ ئارمەن ئاخۆتبام. تەلەفۆنەکەم راکرد.

دەنگی وەك هەمیشە هێدی بوو. «گەرەکم بوو بابەتی میوانداری پێنج شەممە شەو سوپاست بکەم. زۆرمان زەحمەت دای. سەرەڕای ئەمە دوێ شەو کتێبێکم دۆزیەوە، گوتم رەنگە پێت خۆش بێ. دامناوە دووشەممە بیهێنم. خۆ بڕیاری دووشەممەت لەبیر نەکردووە؟»

لایەنێکی بیرگەم قیژاندی «بلێ دووشەممە کارم هەیە. بلێ وەختم نییە. بلێ دەست و بالّم بەندە بلێ —» بە هەلّە داوان وەلاّمیم داوە کە هیچ زەحمەت نەبوو و سوپاس بۆ کتێبەکە و بڕیارەکەشم لەبیر نەچووە. تەلەفۆنەکەم دانا. دوو لایەنی بیرگەم دەگیانی یەك بەربوون.

پالّم وه میّزی تەلەفۆن دا و هەولّی ئەوەم بوو بیر لە شتیّکی تر بکەمەوە. بە چ بیانوویّیکەوە لەگەلّ ئارمەن بدویّم؟ ئاشخیّن ئەوجار ئیدی بۆچی هاوار دەکا؟ کات ژمیّر بوو بە چوار و چارەگیّك ، مندالّ چیان لیّهات؟

کە سەرم هەلّیّنا هەر سیّکیانم لەم بەر پشت دەرگەوە بینی کە گەیبوونە جەرگەی ریّگە باریکەکەوە. دووانەکان هەنگلّە شەلەیان دەکرد و ئارمەن دەستی نابووە گیرفانی و لە پشت سەری کیژەکانەوە دەهات. ئاشخیّن دیسان دەنگی لّی هەلّیّنا. «کلاریس خاتوون گیان.» دەرگەم کردەوە.

ئارمینە گوتی «هیّلۆ! بیستەك و دوو نۆزدە.»

ئارسینە گوتی «هیّلۆ! دوو نۆزدە و بیستەك.»

گەلیّك جار شکم بۆ ئەوە چوو بوو کە نەکا دووانەکان هەر بەتایبەتی هەلّەی هاوچەشن دەکەن هەتا نمرەی وەکو یەك وەربگرن. بەلاّم چۆن؟ بە مامۆستاکانیانم گوتبوو لە کلاسدا لەسەر قەنەفەی جیا و دوور لە یەکتر دانیشن.

ئارمەن دەرگەی مالّیی گالّە دا و راوەستا هەتا دووانەکان لە هەلّبەز و دابەز بوەستن. چاوەڕوانی چی بوو؟ چۆن بوو رۆژان ئاسا زووەکی نەچووە ژوورەکەی دەرگەکە دابخا؟ هەر کە چاوم لیّی کرد گوتی «تەلەفۆن لە میس جوودی دەکەی؟ یەك دوو حەوتوو هەتا کۆتایی تاقیکردنەوەکان لە کلاسی پیانۆ واز بیّنین.» دووانەکان بە مەبەستی داکۆکی لە وتەی براکەیان سەریان بادا. بە هۆی ئۆگری لە ناکاوی بە وانە و تاقیکاریەوە هیّشتا هەر واقم وڕمابوو کە واق وڕمانەکەمی فرەتر کرد. «میّژوو دەپرسیەوە؟ سبەی تاقیکاریم هەیە.»

ئاشخیّن هاتە دالاّن. «کلاریس خاتوون گیان.» نقورچیّکم لە دووانەکان کوتا. سلاّو بکەن. ئاشخیّن دەنگی نزم کرد و قوربانی سەدەقەیان بوو. «سلاّو لە گولّ، سلاّو لە سونبول، قەندو هەنگوین، شیرو شەکر. نا! بیّشك کاری تۆ نییە.»

ئارمینە و ئارسینە بە یەکەوە گوتیان «چی کاری ئیّمە نییە؟» ئاشخیّن گریّی لیّچکە چەرمووگەکەی لە پشت ملیەوە توند گریّدا و هیّمای کردە ژووری دانیشتن. «ڕاحەتی ژووری دانیشتن.»

هەموو بە یەکەوە چووینە ژووری دانیشتن. دۆشەگچەی راحەتیەکان لەسەر یەك هەلّچنرا بوون. ئاشخیّن یەکیّ لە راحەتیە یەك نەفەریەکانی نیشاندا. چووینە پیّش.

نێوڕاستی بەشێکی کە دۆشەگچەی دەکشا سەری و دیاری نـەدەدا  دڕابـوو. پێدەچـوو یەکێك بە چەقۆ یا شتێکی نووك تیژ دڕاندوویێتی. رووم لە ئارمەن کرد کە گێژ و وێـژ تێم راما و گوتی «بە خوا ــــ » و لە ژوورەوە رایکردە دەرەوە. دووانەکان چاوێکیان لە ئاشخێن کرد و پاشان روویان دەمن کرد.

«ئارمەن نەیکردووە.»

«بە خوا ئارمەن نەیکردووە.»

هێشتا نەمپرسیبوو ئەدی کێ کردوویە گوتیان «نازانین کێ کردوویە، بەڵام ــــ »

« ــــ بەڵام ئارمەن نەیکردووە.»

ئاشخێن کە دەستەکانی نابووە سەر سکی سەری راوەشاند. وەی، وەی، وەی ـــــ »

بە دووانەکانم گوت بەرشێو لەسەرمێزی چێشتخانەیە و گوتمە ئاشخێن جارێ شوێنی دڕاوە کە بە دۆشەکچە داپۆشێ.

پووڵی ئاشخێنم دا و ئاشخێن گرێی لێچکەی لە ژێر چەناگەیەوە توند کرد. هەر کە گرێی لێچکە لە پشت ملەوە بوو بەو مانایەیە کە دەیەوێ دەس بە کار بێ یا خەریکی کارە و لە ژێر چەناگەی کە دەبەست یانی لە کار کردن بۆتەوە. زنجیری کیفی داخست و بەستەکانی جل و چێشتم کە پێدابوو بیبا نایە ژێر هەنگڵی و سوپاسی کرد. دەرگەم لە پشتەوە را داخست و لەو بەرەی دەرگاوە ماوەیێ چاوم لێکرد. بەستە و کیف بە دەس و پشوو هەڵماڵاو لە رێگە باریکەکەوە بەرەو دەرگە ئاسینەکە رێکەوت. بە خۆمم  گوت «ئافرەتەی بەستەزمان. جگە لە زەحمەتکێشان چی لەم ژیانە دەسکەوت.» بەرەڵبێنـەم کردەوە و توورم دایە نێو قولێنەی جلە گەمارگرتووەکان. لە تەواوی ئەو رۆژەدا هاوشان لەگەڵ ئاشخێن کارم کردبوو و بەرەڵبێنەکەم گەمار گرتووبوو.

چوومە ژووری ئارمەن، بەو مەبەستەوە کە لەبابەت دڕانی راحەتیەوە هیچ قسەیەك ناکەم. قسەی گرنگترم بوو کە بیکەم. کتێبی مێژووی کە پێدام پرسیم «ئەرێ چ باس لە ئاغای وازگێن؟» لەسەر تەختی دانیشت. «خراپ نییـە. بۆچـی؟» کتێبەکـەم کـردەوە «هەروا.» هەستا کیفی قوتابخانەی کردەوە و بە شوێن شتێ داگەڕا. ئەسقەزا ئیمڕۆ کە چوومە دەفتەر، ئاغای وازگێنیش لەوێ بوو. «کتێبی مێژووم لێك نا. «بـۆ چـووبوویە دەفتەر؟» قەت ئارمەنیان بانگ نەدەکردە دەفتەری قوتابخانە مەگەر بـۆ تـەمێ کـردن لەمەڕ بزۆزی و خراپەکاری. گـوتم هـەر بەڕاسـتی نـەکا لـەبناگوێی بەرپرسـی دابـێ.

قاقەزێکی چوار سووچی وەدەستمدا. «بۆ ئەمە.» بەندی دڵم پسا، بێشك ویستوویانە بچمە قوتابخانە. بێگومان دیسان تەمێ کراوە. بێگومان ـــ قاقەزەکەم خوێندەوە: «ڕێز گرتن لە ئارمەن ئایوازیان بە بۆنەی هەوڵ و تەقەلّلا لەوانەی ماتماتیك دا.» لەجێوە دەرپەڕیم و لە باوەشم گرت و ماچم کرد. لە پێکەنینی دا و گوتی «خنکاندمت.»

کە لە جۆش و خرۆش کەوتم گوتم «ڕاستییەکەی ئەمڕۆژانە زۆرم پەرۆش بووی.» لەبیری ئەوە دابووم کە بە چ شێوەیەك وتەکەی ئێمیلی بێنمە گۆڕی کە گوتی «دەزانم بۆ بە پەرۆش بووی. بە من دەکەی ئەوها مەبە. هیچکات بۆم بە پەرۆش مەبە. کوڕەکەت نەفام نییە. ئێستا مێژوو بپرسەوە.» و داهاتەوە کتێبی مێژووی لە عەردی راکرد و دایە دەستم. بۆچی لەبیرم چووبوو کوڕەکەم لە خافڵگیر کردندا پسپۆرە؟

دەسنووسەکەی وازگێنم هەتا دووشەممە تەقە لێ هێنا. ماش پڵاو و خۆرێشتی تەماتەم بۆ ئارتووش لێنا کە کەیفی پێدەهات. کێکی بادامیم بۆ منداڵەکان دروست کرد. لەسەر ئارمەنیش نەمپرتاند بۆچی ژوورەکەی ڕێك و پێك نییە و دووانەکانم بردە دیتنی فیلمی تام بەند ئەنگوشتی، ئارمەن گوتی «تایبەتی منداڵانە.» و رەگەڵمان نەکەوت. شەوی دوایە هەرکە گوتی «سینەمای یانەی نەوت فیلمی تەڕەزانی هێناوە،» گوتم «بەو مەرجە دەتانبەم سبەی لەسەر لەخەو رابوون نووکەتان* نەیە.» دووانەکان لەوەی کە حازر بووم دوو شەو لەسەر یەك بیانبەمە سینەما هەم سەریان سووڕما هەم خۆشحاڵ و هەتا ئارتووش نووکاندی کە وازی ئاژۆتنم نییە،» دووانە گوتیان «تاکسی دەگرین.» سەر و سەکوتی هەر چواریان هەر بۆ وە دەبوو چاویان لێبکەی. کاتێ گوتم «ڕێگای یانە فرە دوور نییە، لەو دەمەی رۆژێدا شەقامەکانیش چۆلن کەوابوو ـــــ ئارمەن دەئاژۆت.»

لە سینەمای سەر ئاوەڵای یانەی نەوت هاوڕێی منداڵەکان بە پاڵەوانبازیەکانی تارزان حەپەسام و بە کارە جوانیەکانی چیتا پێکەنیم. لە هەوای گەرمی شەودا، لە لایەك بۆی چەم دەهات و لە لایەکی ترەوە بۆی کەباب کووبیدەی میوانخانەی یانەی نەوت. بە شایی و خۆشی منداڵەکانم کەیف خۆش بووم.

# ٣٧

بەیانی دووشەممە هەور و هێڵ بوو و بایەکی بە قەوەتی دەهات.

منداڵەکانم ڕێدەکردە قوتابخانەکە ئارمینە گوتی «ئەگەر هەڵیکردە باهۆز چی؟» ئارسینە گوتی «بێشك خاتوون مانیا مەشقەکە تەعتیل دەکا.» ئارمەن کیفەکەی دەسدایە و ڕێکەوت و گوتی «چ باشتر.»

دووانەکانم ڕاسپارد «لەبیریان نەچێ کتێبی چیرۆك و پەڕاوی وەرگێڕاوەکە بدەنە خاتوون مانیا یا ئاغای وازگێن.» ئارمینە گوتی «بەڵێنیت دابوو بۆمانی بخوێنیەوە.» گوتم «ئاغای وازگێن پەلەی بوو. کاتی بڵاوکرایەوە بە یەکەوە دەیخوێنینەوە.» گوتیان «باشە.» و ڕوومەتە خڕپنەکانیان هێنایە پێش یەکترمان ڕاموسی و هەتا بەر دەرگە ئاسنیەکە لە تەکیاندا چووم.

ئەگەر مەشق تەعتیل بووایە منداڵەکان زوو دەگەڕانەوە ماڵ. گەرەکم بوو زوو بگەڕێنەوە یا نا؟ دەبووا دوعام کردبا هەڵکاتە باهۆز یا دوعام کردبا هەڵنەکاتێ؟ ئێمیلی لەبەر دەرگەی ماڵەخۆیان وێستابوو. ساکۆی سورمەیی و پێسیر تۆڕی لەبەر دابوو و گۆرەوی بەلەك کورتی چەرمووی لەپێ کردبوو. پاس گەیشتێ. ئارمەن لەپاڵ دەرگەی پاس وێستا هەتا ئێمیلی سوار بوو. ئارتووش لە پشت فەرمانی شۆڤرلێت دانیشتبوو. هەناسەم ڕاگرت. ماشێن بە دووهەمین سلف هەڵبوو و هەناسەکەم دەردایەوە. ئارتووش بزەی هاتێ و بەڕێبوو پاشان تۆڕمزی لێدا و سەری لە پەنجەرە وەدەرنا. «ئیمڕۆ درەنگ دێمەوە. لەبیرتە؟» بە دەم بزەوە سەرم بۆ لەقاند کە ئا لەبیرمە. شۆڤرلێت و پاسی قوتابخانەکە دوور کەوتنەوە دەرگەی ئاسنیم پێوە دا و بە حەوشە دا ڕۆیشتم. با چەند گوڵەقاقەزی وەحەوا خستبوو و هەڵیدەسووڕاندن.

هێشتا دەرگەی ماڵەوەم پێوەنەدابوو کە جیرەی کرانەوەی دەرگە ئاسنیەکەم بیست. لەم بەر دەرگە تۆڕیەکەوە دیم کە دەهات. فانیلە و دامێنی ڕەش لەبەردا، کەوشی پانییە تەخت لەپێدا و شاڵی چەرموو بە شانەوە. بۆ یەکەمجار بە دیتنی گەشامەوە.

لە پشت مێزی چێشتخانە دانیشت و لەبری چا و شیر، داوای قاوەی کرد. هەتا خەریکی قاوە بووم دەنگی لێوە نەهات، جگە لەوەی کە «هەڵیکردۆتە باهۆز. ئەودەم لە هیند بووین بە شوێن ئەم چەشنە هەوایە دا باران دەباری.» قژەکانی لە پشت سەریەوە

کۆ کردبۆوه. جگه له جووتێك گوارەی مرواری جەواهێرێکی تری نەبوو. قــاوه و قــاپی بیسکویتی نایسم لەسەر مێز دانا و له هەمبەری دانیشتم. مــاوەیی بــەبێ دەنگــی ده فینجانەکەی راما. له دەرێ بای دەهات و دەتگوت هەرچی تۆز و خۆڵی چۆلەوارەکانی خوزستان بوو له تەك خۆی رادەدا. گوڵە نۆکەکانی سەر قەڕنیز بوو دەلەرینەوه.

لێم پرسی «حاڵت خاستر بووه؟» مەبەستم ئەوه نەبوو که هەر قسەیەکم کردبێ، هەر بەڕاستی پەرۆشم بوو. هەرچەند که ئیمرۆ رەنگی سپی هەڵنەگەڕابوو و تەنیا لێوی بــه ماتیکی پەمەیی سوور کردبوو.

قومێکی له قاوەکه دا و سەری هەڵێنا. چاوەکانی وەك دوو هەڵماتی رەش دەینواند. کۆخی. «ئەو شەوه نازانم بۆچی ئاخۆتم، خووم به دەردی دڵ نەگرتووه. هــیچ کــات لــه بابەت خۆمەوه لەتەك کەس نەئاخۆتبووم، رەنگبێ، چــونکه لام وابــوو کــەس تێناگــا. بۆچی وەمزانی تۆ تێدەگەی ، نازانم.»

کپ بوو. گوڵدانی سەر قەڕنیز لەگەڵ هاژەی بانخوون بۆوه.

یەکێ له گووارەکانی له گوێ دەرێنا شلکەی گوێی دامــالی و گوارەکــەی ده گــوێ کردەوه. له سەرەخۆ دەئاخۆت. وەك ئەوه نەخوازێ دەنگی ببیستن. «ئێمیل تەنیا رەنگی چاو و هۆگری به کتێبی له باوکی بۆ به میرات ماوەتەوه. بــه پێچــەوانەی بــاوکی کــه شیعری له ژیانی راسەقینه هەڵداوارد، ئێمیــل ده چــیرۆك و شــیعر دا دەژی. هــەر لــه منداڵیەوه بێ نێوبڕ ئەویندار دەبوو. پێی وابوو ئەوینداری دایکی ئێمیلی بووه. کیژه له بنەماڵەیەکی دەسکورت بوو. بــاوکی هەمیشــه ســەرخۆش بــوو و زوو زوو لێــی دەدا. ئێمیل دەوری رزگاریدەری گێڕا و باشه — ئاخر کیژه کەشخه بوو. لەپێشدا دژایــەتیم لەگەڵ زەماوەند کرد بەڵام پاشان که کار له کار ترازا ملم دا. هێشتا دوو مانگی لــێ بەسەر نەچوو بوو تێگەیی به هەڵەچووه. کیژه پاش چەند ساڵ مرد که ئەوەش ویســتی خوا بوو.

گوڵدانی گوڵە نۆکه به هاشەیەکی تری با کەوته حەوشه، دەنگی شکانیم له حەوشه بیست. به تەواوی پەرۆشیم بوو. بۆ ئەوه که گوڵدان شکابوو یا لەمەڕ ئەوه که یــەکێ بەم سانایییه له مردنەوه دەدوا؟

گوتی «هەڵبژاردنەکانی* هەمیشه سەهوو بوو. ئــەویش لەمــەڕ بــێ زەیــنی یــەوه چەندین و چەند جار ئەم شار و ئەم وڵات ئەو وڵاتم کرد لەمەڕ ئەوه کارێك نەداته دەس

خۆی و من و ئێمیلی. بۆ من ئیتر زۆر گرینگ نییه بەڵام ئێمیلی توانای ئەوەی نییـە، دەترسم کارێکی بێ جێ بکا. دایکی لەبابەت روحیەوە ـــ »

رســتەکەی تــەواو نــەکرد، ســەری بــادا و دوامــین قــومی قاوەکــەی خــواردەوە و فینجانەکەی نایە نێو ژێر پیاڵە. هەر بۆ ئەوە قسەیەکم کردبێ هێمام کـردە فینجـان. «فاڵتان بۆ بگرمەوە؟» بێ جێ دەئاخۆتم. نـە بـاوەڕم بـە فـاڵی قـاوە بـوو، نـە هـەر فاڵگرتنەوەم دەزانی. هەر بۆ ئەوەم بوو شتێکم درکاندبێ.

وەك ئەوە لە خەو رابێ، لە ناکاو ئەسکەملی کێشا دواوە و وێستا. دەستی بە قژیدا هێنا، شاڵەکەی سەرشـانی رێـك خسـت و گـوتی «وەخـتم گرتـی. فـاڵ؟» چـاوی لـە فینجانەکانی قاوە کرد و زەردە خەنەی هاتێ. «لەمێژ ساڵە فاڵی منیـان گرتۆتـەوە.» پاشان چاوەکانی لێك نا، کردیـەوە و دە سـیاقەڵەمی سـایات نـوا رامـا. شـیعرەکانی پێخۆش بوو. دەیگوت لە دڵەوەی گوتوون. خۆشی هەمیشە لە دڵەوە گوتی. هیچ کەس نەیزانی.» هەتا دەرگەی ماڵ لە تەکیدا چووم. لەبەر دەرگە زۆریاوە دەستی نایـە سـەر قۆڵم و بێ وازانە پێکەنی. «ئێمیل زوو دڵی دەدۆڕێنێ.» شاڵەکەی هەتا ژێر چەناگەی هێنایە خوار. «چاوت لە سەری بێ. هەڵوێستێکی دروست نییە. نەسحەتی بکە.»

لە درێژایی رێگە باریکەدا بەرێبوو شاڵی سەر شانی بە هۆی باوە دەشەکاوە. باریکە رێ تەژی لە گوڵە کاغەزی سوور و شین بوو، دارە بی چەشنی ئافرەتێکی کە بـە هـۆی خەم و خەفەتەوە پرچی برنێ شێواو و جاڕز بوو. دڵۆپە گەلی بارانە بەر لەوە وەعەردی کەون دەبوون بە هەڵم و ئاسمان سوور داگەڕابوو.

## ٣٨

سەرم بە هەموو ژوورەکاندا کرد و شوێنی هێندێ شتانم گۆڕی کە پێویستیش نەبوو. لەبەر یەك یەکی پەنجەرەکان وەسـتام و روانیمـە دەرەوە، گـەڵا تەماتـەکان بـێ پشـوو دەلەرینەوە و گوڵەکان چەپ و راست دەبوونەوە. دارەکانی ئارمینە و ئارسـینە گشـتی گوڵەکانیان بە با دابوو. دارەکەی ئێمیلی هێشتا چەند گوڵی پێوە مابوو. دارە بی پرچی دەڕنی، تەنیا دارە سێدر بوو کە دەتگوت پەکی بە با و با هۆز نەکەوتووە.

هەموو پەردەکانم داداوە. گوتم بچم گوڵدانە شکاوەکە لە ژێر پەنجەرەی چێشتخانە ڕاکەم نەچووم. گوڵدانە خۆشەویستەکەم شکابوو و دەتگوت نە بای هاتووە و نە باران. فیتەی تەحتیل کە بەرز بۆوە چوومە ژووری خەو. کەوتمەوە بیر ئاغا مورتەزا کە هەر کە فیتەی تەحتیلیان لێدەدا، وەك ناوێکی نەهێنی پاقژ بهێنێ دەیگوت « فیدۆس!» و گورجێگی شڕە و بڕەی خۆی کۆدەکردەوە و دەڕۆیی. زۆری کێشا هەتا لە ڕووم هەڵات بپرسم فیدۆس یانی چی؟ ئاغا مورتەزا پێکەنی «یانی فیتەی تەحتیل.»

لایەنی ڕەخنەگر زەردەخەنەیەکی هاتێ. بۆیە بیر لە ئاغا مورتەزا دەکەیەوە هەتا نەپرسم بۆ لێوت سوور دەکەی؟ بۆچی سەرت دادێنی؟ بۆ بەو گشتە ڕازاییەوە کرێم لە دەستت دەسووی؟» شەیەکەم نایەوە سەر مێزی خۆ ڕازاندنەوە. دەیەوێ چ بڵێ؟ ئەگەر گوتی چ بڵێم؟ دەبێ چ بڵێم؟ دایکی گوتبووی «هەڵوێستێکی دروست نییە.» دامێنم ڕاس و ڕیس کرد. لایەنی دلۆڤان ڕێنموونی کرد. «بڵێ بە یەکەوە دۆستین دۆستگەلی باش.» ئارەقەی بن هەنگڵم وشك کردەوە و دەنگی زەنگی دەرگەم کە بیست ڕەنگی چڕی سووراوەکەم بە دەسماڵ قاقەزی پا کردەوە، لە دالاندا بیرم لەوە دەکردەوە کە بۆچی هەوا تاری بووە؟

هەتا دەزگیرەم بادا، دەرگە بە تەوژم کرایەوە. ئێمیل هاتە ژوور و بڕێ لە تۆز و خۆڵ و گەڵا و گیای لەگەڵ خۆی ڕەپاڵدایە دالانەکەوە. شتگەلێکی بۆری وەك کوللەیان دەنێو دابوو. هەر دوومان دەرگەمان بە زەحمەت بۆ پێوە درا و پاڵمان وەدەرگە دا. ئێمیل پشووی سوار و قژ و دەموچاوی خۆڵاوی ببوو. گوتم «چییە، چ بووە؟»

دەستی بە سەریدا هێنا. کراسەکەی داتەکاند. «کوللەکان.»

گوتم «چی؟» دەبیست کوللەی مردوو و نیوە ڕۆح. بێشك ڕەنگم بزڕکابوو و بێگومان هەڵدەلەرزیم، چونکە قۆڵمی گرت و پرسی «بۆ هەڵدەلەرزی؟ نەت بیستبوو؟» وەك گێژان چاوم تێ بڕی. «چیم نەبیستبوو؟» شاڵواری تەکاند «کوللەکان جارو بار لە کاتی کۆچکردنیاندا — ئەتۆ حاڵت باش نییە. وره دانیشە.» دیسان گێژ و وێژ لێی ڕوانیم و ئیزنم دا بمباتە چێشتخانەی تاریك و نووتەك. لەسەر ئەسکەملی دانام. چرای هەڵکرد دەرگەی سەلاجەی کردەوە و ئاوی بۆم تێکرد. شەربەی کە دایە دەستم گوتم «مندالەکان.»

ئەسکەملێکی تری هێنا پێش، لە هەمبەرم دانیشت و داهاتەوە لام. خەمت نەبێ. بەر لە هاتن تەلەفۆنم لە مەکتەب کرد، هەتا دنیا ئەهوەن دەبێتەوە لەوێ رایانـدەگرن. پەنجەرەیەك کریاوە نییە؟ کۆلێرەکان کووژانەوە؟» هەر چاوم لێی کرد. نازانم چۆنم چـاو لێکرد کە چاوەڕوانی وەڵام نەمایەوە، هەستاو رایکرد.

قومێکم ئاو خواردەوە یا نا؟ رابووم چوومە لای پەنجەرەکە. سەر قەرنیز تەژی لـە کوللە بوو. مردوو و نیوە گیان. گوتم خۆزگا گوڵدانەکەم لە ژێر پەنجەرە راکردبا. هەوا تاریك بوو و دەنگێ دەبیسرا کە تا ئەوکاتە شیعرەکەییم قەت نەبیستبوو. ئێمیـل لـە پشتەوە را گوتی «دەنگی باڵی کوللەکانە.»

لە لای یەکتر وەستاین و چاومان لە حەوشە کرد. کوللە لە ئاسمان دەباری. دەنگـی کەوتنە خوارەوەیان چەشنی خشە خشی چەمۆڵە بـوونی خـەروار قاقـەز بـوو، بێگومان هەڵدەلەرزیم یا رەنگم هێشتا هەر گۆڕا بوو، چونکە گوتی «دانیشـی باشـتر نییە؟»

لەسەر دوو ئەسکەمەلی هەمبەر یەك دانیشتین. گوتی «تا ئێستا شتێکت لە بابەت ئەوەوە نەبیستبوو؟» هەر کە سەرم بادا گوتی «کوللەکان کۆچ دەکەن.» رووەمەتی رێك نزیك رووەمەتم بوو. «هێندێ جار چەند کیلۆمێتر دەفڕن.» شوێنە بڕاوێکی چـکۆڵە بـە چەناگەیەوە دیار بوو. «کە ماندوو بوون، دەبنە دوو قۆڵ. قۆڵێکیان دەچێتە ژێـرەوە و قۆڵی سەرەوە لەسەریان دادەنیشن و ماندوویان دەحەسـێننەوە.» شـوێنە بڕاوەکـە بـە دیارەوە نەبوو، «ئەوانەی ژێرەوە بە هۆی ماندوو بوونەوە دەمرن و دەکەونە خوارەوە.» لە پەنجەرەوە روانییە دەرێ کە هێشتا هەر تاریك بوو. قۆڵ قۆڵ بوون گەلێ جار لەکاتی تێپەڕین بە سەر زەریـا و ئوقیانووسـدا روودەدا و گـەلێ جـاریش ئـەودەم کـە بەسـەر شارەکاندا تێدەپەڕن.»

دەنگی دەرەوە نەدەبڕاوە. هەنوکە چەشنی دەنگی چەندین فڕۆکـە بـوو کـە راسـت بەسەر سەرم دا بڕوا. پێدەچوو هەروا هەڵبلەرزم چونکە گوتی «تاقەت بێنە هەر ئێستا لایەك وەلایەکی دەکەوێ.» یەکجێ بیرم کەوتـەوە کـە «دایکـت؟» روانییـە پەنجـەرەی تاریکەوە. حەبی خەوی خواردبوو. خەوتووە. حاڵی باش نییە. هەر چەند جارێك حـاڵی زۆر تێك دەچێ.»

کپ دانیشتم هەتا دەنگی فڕۆکە و خشە خشی قاقەز نزم و نزمتر بۆوە. هەوا بەرەو روناکی دەکشا. هەر دەتگوت خەونم دەدی.

بە دەنگی زەنگی تەلەفۆن راچەنیم. دەستم نایە سەر روومەتم و توند گوشیم. رەنگبێ لەمەڕ ئەوە کە لە خەو نەدیتنم دڵنیابم. تەلەفۆن سێهەمین جار زەنگی لێدا.

بە دایکمم گوت حاڵم خاسە و زۆر باش بوو کە ئالیس لە نەخۆشخانەوە تەلەفۆنی کردووە و چ خاستر کە یووپ تەلەفۆنی لە ئالیس کردووە و نا، ئارتووش لە خورەمشارەوە تەلەفۆنی نەکردووە و منداڵ لە قوتابخانەن و ئا. رووداوێکی ترسناك بوو ـــ» هەتا پرسیم «کەوابوو ئەتۆ تەنیای؟» گوتم «پاشان تەلەفۆن دەکەم.» و گوشیم دانا.

هێشتا دوو هەنگاو دوور نەکەوتبوومەوە کە دوو جار دەنگی زەنگی تەلەفۆن هات. بە نینام گوت «ئا، ئا، ترسێنەر بوو. چەند باش بوو کە گارنیك لە ماڵ بوو و چەندە باشیش کە هەر ویۆلێت پێکەنیوە. ئارتووش چۆتە خورەمشار و ئا، خۆشم گەرەکم بوو تەلەفۆن لە قوتابخانە بکەم.» کاتێ پرسی «کەوابوو لەم هەڵڵاوبگرەدا تەنیا بووی؟» گوتم «دوایە تەلەفۆن دەکەم.» گوشیم داناو زۆریامەوە چێشتخانە.

هێشتا هەروا لەسەر ئەسکەمل دانیشتبوو. پێیەکان بڕووکەیەك لێك والا، لە پشتێند بۆ سەرێ چەماوە بەرەو ئەسکەملی رووبەڕوو. دەیڕوانیە پەنجەرە.

پاڵم وەشیپانەی دەرگەدا. دەستم بە قژم داهێنا و هەستم کرد دەستم خۆڵاوی بووە. وەك ئەو دەمانەی گڵی گوڵدانم دەگۆڕی یا لە باغدا شتێکم دەچاند. دوو جار لەسەریەك پشمیم.

پرسی «چاکتر بووی؟» سەرم بادا کە «ئادی.» لە ژێر لێوەوە گوتم «حەساسیەتم بە گڵ هەیە.» ئەسکەملەکەم کەمێ کێشاوە دواوە و دانیشتم. دەهات ئارەقە بکەم. چەند چرکە سات هەر بێدەنگی بوو و بۆی گڵ.

لێم روانی. «چاولێکە کلاریس، دەزانم ئەزموونی ئەم کارەت نەبوو، بەلام ـــــ» لە دڵی خۆمدا گوتم «زووکە بیلێ.»

لە دڵمدا گوتم «مەیلێ.»

هەناسەیەکی قووڵی کێشا. بەرجەوەندی نێو حەوشە دڵگر نییە. دەزانم کەیفت بە کوللە نایە، بەلام ـــــ»

ئـەمجارە نـاعیلاج بـووم رووم‌ـەتم بـە هـەر دوو دەس بگووشـم هـەتا دڵنیـابم کـە نەخەوتووم. بەرجەوەندی نێو حەوشە؟ کەیفم بە کوللە نایە؟

لە جێوە رابوو. رابووم و چووینە دالان. دەرگەی ماڵەوەی کردەوە. چاوم لە حەوشـە کرد. بێشك زۆر باشم دەدی. بێگومان ئەم یەکەیان دروست نەبوو.

چیمەن و دارو شمشاد و باریکە رێ، هەموو شت و هەموو شوێنی وەك یەك بۆر بوو. رەنگی بۆری کوللە. چەند ساتێ تێپەڕی هەتا تێبگەم تەنیا هەر رەنگ نییـە، بـەڵکو خۆیەتی، کە گشت شوێنێ تەژی لە کوللەیە. سەرم خـەریك بـوو دە گێـژەوە دەهـات. دەستی نایە سەرشانم. «گرنگ نییە، خاوێنیان دەکەینەوە.» نەمزانی کەی گەڕامەوە و چ وەختێ لەسەر ئەسکەمل دانیشتم.

ئێمیل قاوەی دروست دەکرد و ئەمنیش وڕوکاس دەگوڵدانەکەی سەر مێز رامابووم. دوو گوڵە سوورەکەی نێو گوڵدانم بەیانی ئەو رۆژەی کە دایکی رۆیـی لـە باغچـەکە دا چنیبوو. گوتم «ئەوە چۆنە ئەم گوڵانە کوللەیان لەسەر نییە؟»

قاوەمان خواردەوە و ئێمیل لە بابەت هـەموو چەشـنە کوللەیەکـەوە دوا. کوللـەی چۆلەوار، کوللەی سوور، کوللەی مەراکشی. چەشنێکی کوللە تەنیا نێرەکەیان باڵـدارە کە ئەویش نەبۆ فڕین. باڵەکان لێك دەسوێ و بۆ راکێشانی سەرنجی مێوینـە دەنگیـان لێوە دێنێ. رادەی کوللەکانی هـەر گـرۆپ کـە لـە زیادیدایـە. رواڵـەت و کردەوەیـان دەگۆڕێ. رەنگیـان لـە قاوەییـەوە دەبێتـە چـێرەیی یـا زەرد و خۆیـان لەگـەڵ ژیـانی کۆمەڵایەتی رادێنن. لە کتێبی پاقژدا، یووئیلێ کـە یـەکێ لـە پێغەمبـەرانی قـەومی یەهوودە، خەڵك ئاگادار دەکاتەوە کە لەمەڕ تاوانەکانیان تۆبە بکەن هـەتا لـە بـەڵای هێرشی کوللە بپارێزرێن.

بە بیستنی دەنگی پاس راچەنیم.

لە جەرگەی باریکە رێدا تووشی دووانەکان بووم کە پێدەچوو تێرو تەسەل گریـابن و تا منیان دی دیسان دایانە گریان. ئارمەن لە پشت سەرمەوە دەهات. رەنگـی سـەر و چاو و ئارەقەی تەوێڵی وادەنوێنێ کە رواڵەتێکی هەمیشە لەسەرخۆی هەیە. دووانەکانم لە باوەش گرت و ماچم کردن و چەندجار گوتم «تەواو بـوو، تـەواو بـوو. ئـادی ، فـرە ترسێنەر بوو.» پاشان رووم لە ئارمەن کرد. دەستی نایە سەر شانم و هەر کە پرسی «لە تەنیاییدا نەترسای؟» بوغزم گیرا. ماچم کرد و لە ژێر لێوەوە گوتم «تەنیا نەبووم.»

دووانەکان لەم لا و لەولام بەسەر کوللەکاندا تێپەڕین و چووینەوە ماڵ. ئێمیل و ئارمەن ئەو کوللانەی رژابوونە دالآن بە پێ فڕێیاندانە حەوشە، دوانەکانم بردە دەسشۆری و دەست و چاویانم شورد. کە هاتمەدەر، ئێمیل لەبەر دەرگە لەتەك ئارمەن دەئاخۆت. ئارمەن لێم راما. «ئەگەر کارێکت بوو، بانگم بکە.» دە ژوورەکەی خزا دەستێکم بەسەرو چاوم داهێنا. هێلنجم دەهاتێ، دڵە کزەم لێ بوو و سەرم دەگێژەوە دەهات. پالم وەمێزی تەلەفۆندا.

ئێمیل روانییە دەرگەی داخراوی ژووری ئارمەن و پاشان لەمن راما«گەرەکم بوو باخۆم. نەکرا.» سەری بەرداوە. «پاشان رەنگبێ.» بەرەو دەرگە چوو. «بێگومان ئێمیلی گەڕاوەتەوە. بەڵکو ترسابێ.» سەری وەرسووڕاند و چاوی لێم کرد و پێکەنی «گەرچی خراپتر لە دایە گەورەی لە هیچ شتێ ناترسێ.» دەستی نایە سەر دەسگیرەی دەرگە. ماوەیەك بێ هەست و خوست وێستا. پاشان دەستی لەسەر دەسگیرە هەڵگرت و لای لێکردمەوە. «بەلاّم دەبێ بلێم. تەنیا هاوەڵی من هەر تۆی. بێگومان ئەتۆ تێدەگەی. لێبڕاوم لەگەڵ ویوڵێت زەماوەند بکەم.»

## ٣٩

تەپلەکەکەم بەتاڵ کردە نێو سەتلێ زبڵ کە ئارتووش هاتە چێشتخانە. «دوێ شەو نەخەوتووی؟» چاوم بە هەموو شوێنێ داگێڕا جگە لە چاوەکانی. «خەوم لێنەدەکەوت. کتێبم خوێندەوە.» دەستی نایە سەر شانم. «بێگومان رووداوەکەی دوێنێ نارەحەتی کردووی. رەنگت بزرکاوە. هەوڵ بدە ئیمرۆ وچان بدەی. تەلەفۆن لە خزمەتکاری کۆمپانیا بکەم.» چووە دالآن. رووداوی دوێنێ؟ بێشك مەبەستی لە کوللەکان بوو. شوێنی دەستی لەسەر شانم گەرمدا هات.

پەردەی چێشتخانەم داداوە حەوشە نەبینرێ و خەریکی رێك و پێك کردنی مێزی تێشت بووم. دوو لایەنی بیرگەم مشت و مڕیان بوو.

لەم حەفدە ساڵەدا چەند جار نیگەران بووە؟ چەند جار نیشانی داوە یا بە زمان گوتوویە؟»

« زۆر بەدگمەن.»

«هێشتا دروست هەر ئیمڕۆ ئەشێ کاتی یەکێ لەو «زۆر بەدگمەن» ا نەبێ؟»

«بۆچ نەبێ؟»

«لە بەرەوە کە ـــــ »

ئارمەن هاتە چێشتخانە و قسەیەکی کرد. چاوم لێ کرد. «لە بەرەوە کە ـــــ »

ئارمەن تێم راما. «شتێکت گوت؟»

گوتم «چیت گوت؟»

«گوتم هەر ئێستا قەیتانی کەوشم توند دەکەم. رەنگت بۆ بزرکاوە؟»

روانیمە کەوشەکان. «لە بەرەوەی کە ـــــ »

دووانەکان رایانکردە ژوورێ. «بەیانی باش.» «بەیانی باش.»

ئارمینە گوتی «دوێ شەو لە خەونم دا لەتەك ئێمیلی چووینە ئەستێرك.»

ئارسینە بە تل ئەژماردی.«لەتەك ئێمیلی و سووفی و پووری و ویۆلێت و ئاپۆ ئێمیل چووینە ئەستێرك.»

ئارمینە لە پشت مێز دانیشت. «خەڵك بەم گشتیە نەبوو.»

ئارسینە دەس لەسەر پاڵگەی ئەسکەمل گوتی «بوو.»

«نەبوو.»

ئارسینە پێی دە عەردی کوتا. «بوو.»

پێم شك نەدەهات دووانەکان لەتەك یەکتر دژایەتیان کردبێ، ئێستا هەر ئیمڕۆ دەبووایە لەتەك یەکتر دژایەتیان کردبا؟ قیژاندم «بێدەنگ بن.»

بۆ ماوەیێ کپ و بێدەنگ بوون. پاشان ئارمینە سەبرێکی بە خوشکی گوت «ئەمن خەونم دی یا ئەتۆ؟» ئارسینە لێوی هەڵقرچاند. «ئەمنیش لە خەونەکە دابووم، نەبووم؟» ئارمینە فکرێکی کردەوە و گوتی «بووی.» ئارسینە گوتی «کەوابوو سووفی و پووری و ویۆلێت و ئاپۆ ئێمیلیش بوون.» ئارمینە گوتی «باشە، بوون. دایە، تکایە شیر.»

لێو و لووتە داهێڵراوەکەی ئارسینە هاتەوە سەر جێگەی خۆی و گشت دەموچاوی بوو بە پێکەنین. لەپشت مێز دانیشت. «دوێنێ کە بارانەی کوللە دەستی پێکرد خزمەتکاری قوتابخانە گوتی ئاخر زەمان نزیك بۆتەوە. ئاخر زەمان یانی چی؟» ئارمەن

بۆی شی کردەوە. ئەگەر کاتێکی تر بووایە بێگومان لەم ئاگادارییە کەم و زۆر دروستەی سەرم سورِ دەما. کاتێکی تر نەبوو.

ئارمینە نقاندی. «حەوشە تەژی لە کوللە بووە. هەتا لای پاس چۆن ـــ » ئارسینە شیرەکەی نایە سەر مێز. «هەتا لای پاس چۆن ـــ » ئارمەن گـوتی «یـەك یەکـە لـە باوەشتان دەکەم و هەتا نزیك پاس دەتانبەم.باشە؟» دووانە لـە قاقـای پێکەنینیانـدا. «ئەی گیان سوار پشتێ دەبین.»

چاوم لە ئارمەن بوو کە بە دووانەکان پێدەکەنی. گوتم «چەندە گۆڕاوە.» کە شـیری بۆ ئارسینە تێکرد پێم وابوو «گەورە بووە.» پێم خۆش بوو بگریـەم. نەمـدەزانی بـۆو دەمزانی و نەمدەزانی.

ئارتووش دەس بە ردێنەوە هاتە چێشتخانە «کارگێڕی بەشـی خزمـەتکاری دەڵێـی هەموو شتێکی پی گاڵتەیە. گوتم یەکێ بنێرن حەوشە خاوێن بکەنەوە، پێکەنی و گوتی "هەتا دوانیوەڕۆ خاوێن کراوەتەوە". و گوشی دانا. کـە گەیـە کۆمپانیـا دەچـمە لای بەرپرسی بەشی خزمەتکاری بزانم ـــ»زەنگیان لێدا.

بەم بەیانیە زووە کێ بوو؟

بەم بەیانییە زووە یووما بوو. چوار کوڕیژگە بە دەموچـاوی خڕۆکـە و تاوسـووت و سەری بە گوێزان تاشراو لە ریزی پشت سەریەوە وێستابوون. هـەر پێنجیـان تـەلیس و کیسە و کارتۆنی مقەوایان بە دەستەوە بوو و یەك بەخۆ پێدەکەنین کوڕیژگـەکانم هـەتا ئەو رۆژە نەدیبوو و یەکەمجاریش بوو پێکەنینی یووما م دەبینی. چوار ددانی زێڕی بوو و لێچکە سوورە بەربەرینە گوڵ درشتە سەوزەکەی هەتا نێوقەدی داکشابوو.

گوتم «یووما ئەو چ باسە؟ بەو سەلای بەیانییە بانگ کراویە شایی؟»

کوڕیژگەکان ورد پێکەنین و یووما بە دەنگی بەرزەوە پێکەنی. خاتوون موهەندیس ، ئیمرۆ دەستێکی کەمی لە شایی نییە. بە کوڕەکانم گوت لەپێشدا دەچینە لای خاتوونی موهەندیس. خاوەن بەزەیە. رازی بەوە نابێ ئێمەی کلۆڵ و چارە رەش زۆر شەکەت بکا. وەنییە منداڵینە؟» زۆریاوە لای کوڕەکان کە دیسان سەریان بادا و لەسەر خۆ پێکەنین. ددانەکانیان دەو دەموو چاوە قاوەییانەدا چەرمووی چەرموو بوو.

وەك گێژان زەق چاوم دە یووما بڕیبوو کـە ئـارتووش لـە پشـتەوە را گـوتی «چـی بووە؟» گرووپی پێنج کەسی ئێمە چەند خولەك دەگرۆپی چوار کەسی بەرەو روو راما.

یووما زووتر لە هەمووان بە مەبەستەکەی زانی. گەڕاوە و شتگەلێکی بە عـەرەبی بە کوڕیژگەکان گوت و هەر پێنجیان لە پێکەنینیاندا. یووما ئەوجار پێـی گـوتن کـە هاتووە کوللەکان بکڕێ، چونکە عەرەب کوللە سوور دەکڕنەوە و دەیخۆن، «وەکو تـۆو، خاتوون موهەندیس، ها؟ وەکو تـۆو. ئـەمجۆرە.» تلـی ئەسـپێ کـوژە و دۆشـاو مـژەی خەنەلێدراوی وەك ئەوە تۆو بقرتێنێ بەبەر دەمیەوە گرت.

ئارسینە و ئارمینە دوو قۆڵی گوتیان «یەق!» یووما کە نەی بیسـت جـارێکی تـر گوتی «جارجارەش لە دیزە دا دەکوڵێنین.» ئارمەن دایە پێکەنین. یووماش پێکـەنی و گوریژگەکان لە یەکتر رامان و دەتگوت هەموو پێدەکەنین. پێکەنین.

بە یوومام گوت لەپێشدا کوللەکانی رێگە باریکەکە کۆ بکاتەوە پاشان ئەوانی تر، کاتێکیش گوتم پووڵ ناخوازم، هەر دوو دەستە ئێسکنەکەی کە هەرکام دە بیست بازنەی تێدا بوو بەرز کردەوە و گوتی «خوا لە خاتوونیت کەم نەکا، خوا بە دڵی خۆتت لەگەڵ بکا، خوا ـــــ» ئەو هەر خەریکی دوعاکردنی خۆی بوو کە دەرگەم پێوە دا.

ئارمەن دووانەکانی بانگ کردە ژووری خۆی. «سێ وێنەی تـازەی تـاڕزان و چـیتام هەیە.»

ئارتووش پووشەیەکی نابووە سەر مێزی تەلەفۆن و نامەو قاقەزی ئەمبەر ئەو بـەر پێدەکرد «رۆژ رەشی خەڵك بە کوێ گەیوە کە کوللە دەخۆن.»

فەرشی دالانەکە خوار ببوو. داهاتمـەوە راسـتم کـردەوە. «لـە زۆر شـوێندا کوللـە دەخۆن. هەر لە کۆنەوە دەیخۆن.»

ئارتووش چاوی لێم کرد وچی نەگوت. دووانە هاتنـە دالان. کلۆمەکـەیان ترازانـد، سەرەتا تکێیەکی حەوشەیان کرد و هاواریان کرد «هەتا دەرگەی ئاسنینە خاوێن بۆوە.» پاشان لووتیان تێك نا و لە ئارمەن روانین کە لەبەر نەینووکی دالان قژی دادێنا.

ئارسینە گوتی «واتا سواری کۆڵ نابین؟» ئارمینە گوتی «سواری کۆڵ نابین.» و بـە بۆڵە بۆڵ وەدەرکەوتن. ئـارتووش بـە دەم رۆینـەوە گـوتی «کـەوابوو کـارگێڕی بەشـی خزمەتکاری لە خۆوە نەیدەگوت» لە تەکیان چووم. یووما و کوڕەکان مژوول* بوون. بە کەمتر لە دە خولەك سێ تەلیس پڕ لە کوللە لەبەر دەرگە ئاسنیەکەدا بوو.

هەتا ئەو رۆژە شەقامم بەو رادە قەرەباڵغ نەدیبوو. ئافرەت و مێر و منداڵ. شەلاڵی ئارەق و بەلەز دارو شمشادەکانیان دەتەکاند و ئەو کوللانەی بـە لقەکانـەوە نووسـابوون

دەکردە نێو تەلیس و کیسە و هەرچی لەگەڵ خۆیان هێنابوو و لە سەرەوەی کامە دار هی ئەمیان و هەتا کوێی شمشادەکان هی ئەویترە دەمەقاڵێیان بوو. دەمگوت دەبێ هەمووی شار ئاوا بارودۆخێکی بێ؟

پاسی قوتابخانە هێشتا نەهاتبوو. ئارمەنم دی کە خەریك بوو دەچووە ئەوبەر شەقام. ئێمیلی لەبەر دەرگەی جی چوار وێستا بوو. ئارسینە قۆڵمی راکێشا، «شمشادەکان.» ئارمینە زیقاندی «دارەکان.» ئارتووش گوتی «بڕوانە.»

دوو مێری عەرەب شمشادەکانی لای چەپیماڵەوەیان تەکاند. کوللەکان کە رژانە خوار، هەر لقە رووت و قووتەکان بەوێوە مانەوە. گێژ و وێژ دە پاشماوەی شمشاد و دارەکان راماین. تەنانەت هیچکامیان گەڵایەکی سەوزیان پێوە نەبوو. قەت ئابادانم بە بێ رەنگی سەوز نەدیبوو. ئارمینە گوتی «دەڵێی چوونەتە ئارایشتگەری و ـــ» ئارسینە گوتی «و سەریان لە بن بنەوە را تراشیوە.»

زۆرتر لە رۆژانی دی لەوێ مامەوە و بەدوای پاسی مندالآن و شۆوەرلیێتی ئارتووشدا دەستم راوەشاند.

هەر کە زۆریامەوە حەوشە یووما مژوولی تەکاندنی دارە بی بوو. هەر تەنیا لقی درێژ و رووتی دار، شێوەی تلگەلی ئیسکلێت، لە شازادە خاتوون هوانس تومانیان مابۆوە. روانیمە سەر چیمەنەکە. هێشتا بەشێکی تەژی لە کوللە بوو و ئەو جێگەیەی کە کوڕەکانی یوما کوللەکانیان کۆ کردبۆوە، تەنیا هەر خاك و خۆڵ بوو. پێنە دەچوو حەوشە هەتا دوێنێ چیمەنی سەوز و رێکی تەژی لە گوڵ و گیای لێ روابوو، گشت شوێنێ رەنگی گڵی دەنواند. هەر بە راستیش هەمووی هەر گڵ بوو.

## ٤٠

لە دەور و بەری مێزی چێشتخانە دا ئەسکەمل بۆ هەمووان نەبوو.

چەندجار گوتم «لە ژووریٚ دانیشین راحەت تر نین؟» بەڵام لەنێو ئەو هەموو خەڵکە کە هەموو پێکەوە دەئاخۆتن کەس دەنگمی نەدەبیست. ئارمەنم نارد ئەسکەملەکانی ژووری خۆی و دووانەکانی هێناو هەموو دانیشتین.

ئارتووش مژوولی گێڕانەوەی تەلەفۆن لە خزمەتکاری کۆمپانیا بوو و گارنیك قاقا پێدەکەنی. ئارمەن لە پشت سەری ئارتووشەوە پاڵی وە پێشخانی چێشتخانە دابوو. دووانە و سووفی لەمەڕ مەشقی جەژنی کۆتایی ساڵ دەدوان و دایکم بابۆڵەی کەرە و پەنیری بۆ دروست دەکردن. ئالیس لەبەر نەینووکی جیٚ تۆزەکە لێوی سوور دەکرد و نینا گوتی کەم نین ئەو کوللە سندان کوشتووانەی کە لەسەر سەرمانەوە دەگەڕێن و وەك جێت گرەگرِیانە. «مەترسن. مەبزوون. قسە مەکەن». ئاخرییەکەی ئاوم دە شەربە کرد و هاوارم کرد "داسەکنیٚ پیاوەکە. خۆت زیاتر لە هەمووان ترسای". و بە تۆ بزی ئاوم دە گەرووی کرد." بە پێکەنین خۆی خەنی کرد و دەستی کردە ملی گارنیك، سەری خوراند و گوتی "ئادی بە مەسیح. ئەمنی ورچەزلە خەریك بوو زراوم بچیٚ و هاوسەرم و ئەمە هەر دەڵێی.» ویۆلێتی نیشاندا کە جگە لە من تەنیا کەسیٚ بوو کە پێنەدەکەنی و نەدەئاخۆت و فینجانی قاوەی لەنێو ژێر پیاڵە دا خولدەدا.

دایکم سێوێکی چوار قاش کرد و یەکیٚ قاشێکی دا بە دووانە و سووفی و قاشی چوارەمی بۆ ئارمەن راداشت و کە گوتی «ناخۆم» خۆی قەپاڵی لێداگرت. «ئەمنیش کە هەر هیچ نەترسام. تەنیا پەرۆشی ئالیس و کلاریس و منداڵەکان بووم. لە هەموویان زۆرتر نیگەرانی کلاریس بووم کە بە تەنیٚ بوو.»

لە پشت مێز رابووم و بە پەلە دەسم کرد بە کۆکردنەوەی پێشدەستیەکان. سووفی گوتی «پووریٚ، خۆ ئەوانە پیس نین. بۆ کۆیان دەکەیەوە؟» ئارمینە گوتی «نانی، دیسان سێو.» ئارسینە گوتی «نانی، سێو.» دایکم گوتی «ڕاوەستن. دەرفەتم بدەن» و سێوێکی تری لەنێو دەفری میوە دەسدایە.

ئالیس دەیگوت «هەرچەندی بە یووپم گوت باوەڕ بکە ناترسم ، گوتی ئیللا و بیللا هەنووکە خۆم دەگەیەنمە نەخۆشخانە. زۆرم حەول دا هەتا رازیم کرد نەیە. بۆچی هاتبا؟

خۆ منداڵ نیم.» گارنیك دەستی نایە نێو دەوریی نینا، چەند گللە ترێی راکرد و یەك یەکە هاویشتیە زاری. ئالیس گیان، ببوورە، تکایە بڵێ چۆن بە ئینگلیزی گوتی ئیللا و بیللا؟» و خۆشی دایە پێکەنین. دووانە و سووفی بە پێکەنین خۆیان خەنی کرد و دایکم گرتنیە ژێر تانەو تەشەر. «بە دەمی پڕەوە پێمەکەنن لە گەرووتاندا دەمێنێتەوە» ئالیس جێ تۆز و ماتیکەکەی نایە کیف و لە گارنیك مۆڕ بۆوە.

نینا لە دەستی گارنیکی دا «دیسان دەستت کردە نێو دەوریی من؟» پاشان رووی دە ئالیس کرد. «وازی لێ بێنە. خۆ تۆ دەیناسی، بۆ قسەی پڕ و پووچ بە شوێن بیانوودایە. ئەمشۆ قەوڵ و قەرارێکتان نییە؟»

ئالیس لە نینۆکەکانی وردبۆوە، کلکە وانەکەی بە دەوری تلی دا سووڕاندو لێوی وێك هێنا، «یووپ ئەمشۆ گیرۆدەیە. دەبێ نامە لە دایك و پووری بنووسێ.» گارنیك ئەوجار دایە پێکەنین و دوای زۆر پێکەنین گوتی «گیرۆدەیی لەمە فرەتر؟» و چاوی لە دووانە و سووفی داگرت کە بە پێکەنینی وەپێکەنین کەوتبوون.

ئالیس گوتی «هەرئەو رۆژانە ئەشێ ئیزن وەربگرم» نینا نقورچێکی دە گارنیك کوتا و منداڵەکان کە هەروا پێدەکەنین پێی گوتن «ئێوە بۆچی لێرە وێستاون؟ هەڵێن برۆن.»

دایکم خۆی باوەشێن دەکرد و ئارتووش کاردی میوەخۆری لەسەر مێز هەڵدەسووڕاند.

ئارمەن بەسەر سەرمدا لار بۆوە لای دەفری شیرینی ، دوو دانە بیسکوتیم پێدا و روانیمە ویۆلێت کە لەو دەمەوە هاتبوو تەنانەت قسەیەکی نەکردبوو. گوتم «داخوا چ بووە؟»

سووفی گوتی «ئێمە چووینە لای بووکڵەکان ماڵ ماڵێن بکەین.»

ئارمینە گوتی «چووینە لای بووکڵەکان ـــــ »

ئارسینە گوتی «ماڵ ماڵێن بکەین.»

ئارمەن گوتی «ئەمن چووم سواری دووچەرخە بم.»

ئالیس گوتی «عیلاجم نییە دەبێ ئیزن وەر بگرم.»

ویۆلێت رابوو چووە لای پەنجەرە. «کوللە گوڵەکانیان خوارد؟»

تێی روانیم. قژەکانی وەك کلکی ئەسپی لێکردبوو و کەوشی پانییە تەختی چەرمووی لە پێ کردبوو. تلی بە شووشەی پەنجەرەدا هێنا. شوێنی تلی لەسەر شووشە

جێما. گوتی «بەستەزمانانە.» ئەمن وای بۆ چووم یا هەر بەڕاستی سووکە پێکەنینێکی لەسەر لێو بوو؟

ئالیس ئەوجار بە دەنگی بەرز گوتی «دەبێ بچمە تاران کە ــــ »

نینا گوتی «تاران ؟ تاران بۆ؟»

ویۆلێت کە پشتی لە ئێمە بوو گوتی « لەکاتی کۆچ کردنیاندا چەندین کیلۆمێتر باز دەدەن. هەر کوللەیەی رۆژی رێك هێندەی کێشی خۆی خواردەمەنی دەخوا. لە کامبۆجدا چێشتێکی بە تام و چێژ بە کوللە دروست دەکەن.» بۆچی بیرم لەوە نەکردەوە ئەم شتانە لە کوێ دەزانێ؟

ئالیس گوتی «بۆ نوێ کردنەوەی گوزەرنامە. یووپ گوتوویە لە سپتامبردا بەیەکەوە دەچینە هۆڵەندا هەتا دایك و پووری ببینم. هەر لەوێ زەماوەند دەکەین. بەڵکو بەر لەویش جەژنێکی چکۆڵە لێرە بگرین.»

ئەمن، دایکم، ئارتووش ، نینا و گارنیك روومان دە ئالیس کرد.

ویۆلێت روو لە ئێمە گوتی «بەستەزمانانە.»

هەموو دە ویۆلێت راماین کە چاوی دە ئێمە بڕیبوو. «مەبەستم لە کوللەکان بوو.» پاشان رووی دە ئالیس کرد و پێکەنی. «فرە خاسە. پیرۆز بێ.»

ئالیس دەمی خوار کرد و پێکەنی. «سوپاس ویۆلێت. ئاخری یەکێك ئاوەزی ئەوەی بوو پیرۆز بایی بکا.» ئەسکەملی وەلانا و وێستا و سەرەخڕو گەورەکەی وەرسووڕاندە لای دایکم کە بە دەمی گریاوەوە لێی دەڕوانی. «ئەمن رۆیشتم، تۆ دێی یا لێرە دەمێنیەوە؟»

دایکم لەجێوە هەڵبەزی و دەسکی جانتاکەی کە بە پاڵگەی ئەسکەملەوە بوو، توند کێشای. دەسکی جانتا پسا، دایکم جانتا دەسك پساوەکەی لەبن هەنگلی ناو بە دوای ئالیس دا لە چێشتخانە رایکردە دەرێ. ئەسکەمل چەند جار لاپەی برد و بەربۆوە. هەموو چاومان لە ئەسکەمل بڕی.

نازانم چەندەی پێچوو هەتا ویۆلێت لاسای منداڵانی کردەوە و گوتی «یەك دوو، یەك دوو، تۆڕمز. لە حاڵەتی مۆر بوونەوە دا ــــ » پاشان هاتە پێش، ئەسکەملی راکرد و لە پاڵ مێزی داناو لەسەری دانیشت.

ئێستا ئیدی هەموو چاومان لە ویۆلێت کرد کە گێلاسێکی دووانەی لەنێو دەفرەکە راکرد. لێیان راما و گوتی «چەند زەریفن.» گێلاسەکانی بە گوێیدا کرد و چاوی لەیەك یەکی ئێمە بڕی. برۆ چڕ و پڕەکانی هەڵتەکاند و گوتی «باشە ئەوە بۆ مات بوونە؟ زەماوەند کردن خۆ کارێکی چەوت نییە، هەیە؟ باشە، ئەمنیش ئەوە خەریکی زەماوەندم»

دووانە و سووفی هەر لەو کاتە دا بە هەناسە بڕکێ سەر و کەلارەیان پەیدا بوو. بە دەمە لاسکێ لە قوتابخانە تلیان هەڵێنا «ئیزن بۆ دووچەرخە ئاژۆتن.»

ویۆلێت خێچەیەکی لە منداڵەکان کرد و سەری راوەشاند. «گوارەکەم کەشخە نییە؟» گیلاسەکان جوولانەوە و منداڵەکان پێکەنین. ویۆلیتیش پێکەنی. «منداڵینە، پێتانخۆشە لە زەماوەندی من دا ببنە پێخەسووی بووك؟»

ئارمینە و ئارسینە و سووفی هەڵپەڕین و چەپڵەیان لێدا «فرەخاسە. فرە خاسە. جل چ رەنگێك لەبەر کەین؟»

ئارمینە گوتی «ئەمن پەمەیی.» سووفی گوتی«ئەمن شین.» ئارسینە گوتی «ئەمن پەمەیی.» ئارتووش چاوی لەمن کرد، گارنیك لە نینا راما و نیناش لە ویۆلێت. کیژەکان دەست لەناو دەستی یەك دا هەڵدەسووڕان و هاواریان دەکرد «زەماوەند، زەماوەند.»

ویۆلێت گێلاسەکانی لە گوێ کردەوە و خواردنی.

گارنیك بە نینای گوت «چی گوت؟» نینا بە ویۆلێتی گوت «چیت گوت؟»

ویۆلێت لە جێوە رابوو، دەنکەکانی نایە نێو پێشدەستی و گوتی «منداڵینە، وەرن بڕیار بدەین کێ جلی چ رەنگ لەبەر بکا. ئەمن بێشك دەبی جلی چەرموو لەبەر بکەم، چونکە بووکم، ئێوەش ـــــ» و لەتەك منداڵەکان لە چێشتخانە دەرکەوت.

نینا وێستا «لە سەریداوە.» بە گارنیکی گوت «ڕابە، رابە، بزانم ئەم کیژە پوورەی لەمن شێت تری تۆ چیەتی.»

هەر من و ئارتووش لە چێشتخانە دا ماینەوە کە ئەویش جێ شەکرەکەی لەسەر مێز دەهێنا و دەبرد. خش، خش، خش، هەر دەنگم نەکرد، دەنگم نەکرد، دەنگم نەکرد. هەتا ئەوەی قیژاندم «بەسە وازبێنە.»

# ٤١

ڕاحەتیە چەرمە سەوزەکە راحەت نەبوو، پێیەکانم خڕ کردەوە و درێژم کردەوە. ڕێك دانیشتم، خوار دانیشتم. دەستم نایە سەر دەستم، هەڵمگرت. سەرم وە پاڵگە کرد. چاوەکانم لێك نا، کردمەوە. کتێبی ساردۆم لە قەفەزە دەرێنا. لەو شوێنەوە کە نیشانەم کردبوو دوو دێرێکم خوێندەوە و کتێبەکەم وێك نا، گرینگ نەبوو کە پیاوی چیرۆك ئاخریەکەی لە نێوان ئەوین و دەروەست بوون کامیان هەڵدەبژێرێ. رقم لە مێری چیرۆك دە بۆوە کە بەو رادە نەفامە، لە ئافرەتەکەی چیرۆکیش رقم دەبۆوە کە تێناگا نەفامی مێری چیرۆك تاچ رادەیە. رابووم و بەرەو چێشتخانە چووم و خۆم بە خۆمم گوت «خۆت نەفامتر لە هەموویانی.»

لە کات ژمێری دیواری وردبوومەوە. چی وای بۆ هاتنەوەی منداڵەکان نەمابوو. دەرگەی سەلاجەم کردەوە. شیرمان نەمابوو. کەمێك پەنیرمان مابوو و هەرچی گەڕاشم کەرەم نەدۆزیەوە. دڵنیابووم تێشت کەرەمان بوو. روانیمە دەوروبەری چێشتخانە. جێ کەرەیەك هەر لە بەیانیەوە لەسەر پێشخان مابۆوە و کەرەکە تواوبۆوە. قاپ و قاچاخی نەشۆراوی تێشت دەنێو قاپ شۆریدا لەسەریەك کەڵەکە کرابوو.

قاپ و قاچاخی تێشت لە ماوەی ئەم حەڤدە ساڵە دا چەند جار هەتا ئێوارە بە نەشۆراوی مابوونەوە؟ رەنگبێ تەنیا یەك دوو جار ئەویش لە مانگەکانی دوایی کە پێگرانی دووانەکان بووم. سیاقەڵەمی سایات نووام بەرچاو کەوت. دوو دانە لە پۆنیسەکانی کەوتبوو و لایەکی دەموچاوی شاعیر بەسەر دیوارەوە لە هات و چۆ دابوو. لێی نزیك کەوتمەوە. چەندە کرێت بوو. بۆچی تا ئێستا وەمدەزانی کەشخە و جوانە؟ رەنگبێ لەبەر ئەوە بووبێ کە کیژی پووری ئارتووش لە ئەرمەنستانەوە ڕێی کردبوو. گرینگ نەبوو لە کوێوە هاتووە. ناحەز بوو و ئەمنی نەفام هەتا ئێستا پیم وابوو جوانە.

سیاقەڵەمەکەم لە دیوار کردەوە و چەمۆڵەم کرد. هێندەم چەمۆڵە کرد هەتا لەنێو دەستم دابوو بە گلۆڵە. گلۆڵەکەم چەند جار هەڵاویشت، زۆرپیامە لای زبڵدان و توورم هەڵدا. سایات نوای چەمۆڵەبوو وە لێواری سەتڵ کەوت و بەر بۆوە. کیفەکەم راکرد و لە ماڵ وەدەرکەوتم.

دەرگە ئاسنییەکەی جی چوار نیوە کریاوە بوو. چووم هەتا گەیمە سەرچاوەی ئاو. لە پاڵ ئەسکەملۆ و دارە بێ گەڵاکان و ژاڵە بێ گوڵەکان تێپەڕیم. دەڕۆیشتم و هەوڵم دەدا چاو لە دەوروبەر نەکەم. ئابادانم هیچکات خۆڵاوی نەدیبوو هەر دەتگوت شار شەکەت و بێوازە. هەروەك خۆم کە زۆر شەکەت و فرە بێواز بووم.

گەیمە دووکانی ئەدیب، مقەوایەکی چوار سووچ بە دەرگە هەڵواسرابوو: "تەحتیل".
بۆچی ئەو نووسراوەیەم قەت نەدیبوو؟ چونکە هیچ کات. لەو دەمەی رۆژێدا نەهاتبووم شتێ بکڕم، چونکە دەمزانی دووکان لە یەك هەتا سێ دادەخرێ.

چاوم لە کاتژمێرەکەم کرد. بۆ سێ پێنج خولەکی دەویست. منداڵەکان هەتا سەعاتێکی تر لە قوتابخانە دەگەڕانەوە و کەرەم نەبوو و پەنیرم کەم بوو و منداڵەکان بێ بەرشێو دەمانەوە. بۆ لەبیرم کردبوو کەرە و پەنیرم نییە؟ بۆچی لەبیرم نەمابوو دووکان دوانیوەڕۆیان دادەخرێ؟ لە بەیانییەوە لەبری بە ماڵ و ژیان راگەیشتن لەنێو راحەتی سەوز دا خۆم مەڵاس دابوو و پێم وابوو بە ئافرەتی چیرۆك و نەزانییەکەی و مێری چیرۆك و نەفامیەکەی و ـــ

هەناسەیەکی قووڵم کێشا و بە حەڵقەی زەماوەند لە دەرگەی شووشەییم دا. رێك لە جەرگەی "ل"ی تەحتیل.

ئاغای ئەدیب کە دەرگەی کردەوە پشووم دایە دەر. «ئێوەن خاتوون موهەندیس؟ قەت ئەو دەمانە تەشریفتان نەدەهات؟»

دووکان گەرم و تاری بوو. ئاغای ئەدیب کەرە و پەنیری دەکێشا و دەئاخۆت. «گەرمای ئاوات دیبوو؟ دەڵێن هی کوللەکانە. دوای هێرشی کوللەکان هەوا گەرمتر دەبێ. بێشك منداڵەکان دیسان خۆ لە ئاوێ دەدەن. خوا دەزانێ هەتا شەو چەندیان دەبنە قووتی کۆسە. فەقیرانە چ بکەن، گەرما هێزی مرۆڤ دەبرێ. ئەمن کە هەتا ئێستا گەرمایەکی ئاوام نەدیبوو.»

لە تەرازووەکەی ئاغای ئەدیب وردەبوومەوە کە لە چەند جێوە ژەنگی گرتبوو و تایەکانی خوارو خێچ بوون. وازم نەبوو بە ئاغای ئەدیب بڵێم «ئەتۆ گەرمای لەوەی بە تەوژمتریشت دیوە. منیش دیومە. ئەمشۆ و سبەی شەو و دوو سبەی شەو منداڵانی گەڕەکی عەرەبەکان و ئەحمەدئاوا و ئەو گەڕەکانەی کە نە ناویان دەزانم و نە قەت رێم تێکەوتووە، خوا هەر بۆخۆی دەزانێ چەندجار خۆ دە زەریا داوێن و ئەگەر کۆسەگیانیان

نەستێنی، دەستێك یا پێیەکیان لێ دەستێنێ و ئێمە لە ئالیس دەبیسین کە "دوێنێ حەوت کۆسە لێدراویان هێنانە نەخۆشخانە، ئیمڕۆ هەشت دانە، دوێ شەو دەدانە". و ئەمن و دایکم و ئارتووش پەکوو پەکوومانە و بە دوای بێدەنگیەکی کورت کە لامان وایە بۆ مردن یا لە دەسدانی ئەندامێکی لەش بەس و بە جێیە، هۆشمان دەخەینە سەر منداڵەکانی خۆمان کە دەڵێن «بەرشێو چیمان هەیە؟ شێو چیمان هەیە؟ مردین لە گەرمان. بۆچی پلەی کۆلێر زیاد ناکەن؟"»

ئاغای ئەدیب گوتی «هەڵوا شەکەری هەرە باشمان هێناوە. بدەمە خزمەتتان؟»

لە ماڵدا جگە لەمن کەس هەڵوا شەکەری پێخۆش نەبوو، گوتم «تکایە دوو سیر.»

پاکەت بە دەستەوە بەرەو ماڵ بوومەوە. شەقام چۆل بوو و هەوا داغ. تەنانەت بۆقەکانیش کپ ببوون. دەرگەی ماڵە جی چوار داخرابوو.

لە حەوشەکە وەژوور کەوتم. لەبەر دەرگەی ماڵ وێستابوو. بە قەراخ باغە خۆڵێنەکان و دار و دەوەنە رووتەکاندا تێپەڕیم.

گوتی «فەرموو کلاریس.» رەنگی سەوزی چاوەکانی تەنیا رەنگی سەوزی دەور و بەر بوو. گوتم «فەرموو» و دەرگەی ماڵێم کردەوە. «کەرەم کرِی. هەتا نەتواوەتەوە بیبەم دە سەلاجەی بنێم.» بە دوای مندا خۆی گەیاندە چێشتخانە. کەرە و پەنیر و هەڵوام دەنێو سەلاجە نا و دەستم کرد بە شۆردنی قاپەکان. لە پشت سەرمەوە نە دەنگی رێگە رۆیشتن بیسرا، نە راکێشانی ئەسکەمل لەسەر مووزاییك، کەوابوو دانەنیشتبوو. کەوابوو هێشتا لەبەر دەرگەی چێشتخانە بوو.

لایەنی بە ئەدەب و نەزاکەتی بیرگەم گوتی «باش نییە، خولقی بکە.» سەرم وەرسووڕاند. مژوولی روانین لە شوێنی بەتاڵی سیاقەڵەمی سایات نوا بوو.

گوتم «دانانیشی؟»

دانیشت و دەستی پێکرد. هەر لە یەکەم رۆژەوە کە ویۆلێت لە ماڵە مە دەبینێ هەر دەتگوت یەکێك دەڵێ هەر ئەو ئافرەتەیە کە هەموو ساڵێ بە شوێنی دا وێڵ بووە. سبەی ئەو رۆژە لەکاتی وەدەرکەوتن لە کۆمپانیا دیسان ویۆلێت دەبینێ کە بە هەڵکەوت بە وێدا تێدەپەڕی. لە تەك یەکا دەچنە میلکبار قاوە دەخۆن و دەئاخۆن. چەند جارێکی تر لە رەخ زەریا بەڵێنی بە یەکتر دەدەن.

قاپەشۆڕاوەکان لە شوێنی خۆیاندا بوون. لە هەمبەریا دانیشتبووم و گوێم پێدەدا و قسەکانی ئارتووشم بیر دەهاتەوە. «ویۆلێت پرسیارێکی زۆری لەمن و ئێمیل کرد کە لەکام بەشی کۆمپانیا ئیش دەکەین و چ دەکەین. هیچ بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو ئەم بابەتەنە بۆ ئەو خاس و دەلال بن.» و وتەکانی نینا. «ویۆلێتی بەستەزمان هێشتا هەر لە بابەت تەلاقەکەیەوە خەفەتبارە. مەغرەبانە بە تەنیایی لە ڕەخ زەریاوە پیاسە دەکا.» و ویۆلێت خۆی بە منداڵەکانی گوتبوو «هەر لەم ڕۆژانە دا بۆ خواردنی بەستەنی دەتانبەمە میلکبار.» و لە وەڵامی گارنیک دا کە گوتی «بەڵات لێدا، میلکبار لە کوێ پێدەزانی؟» تەنیا هەر بزەی هاتبوویە.

ئێمیل جاڕز ببوو. دەستی دە قژی وەردەدا، دە گیرفانی دەنا. ئەسکەملی دەکێشا دواوە، دەیبردە پێش و دەئاخۆت. «دایکم بە هیچ کارێکم قایل نییە و هەمیشە پێی وایە بە سەهوو دەچم. وەدەزانی ئاقڵم پێی ناشکێ. خۆی بە درێژایی تەمەنی هەموو کارێکی لە رووی حیسێب و کتێب بووە. باوەڕی بە ئەوین نییە. بەڵام ژیان یانی ئەوین، وەنیە؟ بێشك ئەتۆ لەگەڵ من هاوڕای، وەنیە؟»

ماوەیێ بێدەنگ بوو و بە چاوەڕوانییەوە لێم ڕوانی.

جگەرەکەم لەنێو تەپلەك دا کوژاندەوە و کپ بووم. پێم وابوو گەرەکم نییە بزانم مێری چیرۆکی ساردۆ چ هەڵوێستێك دەگرێ. لام وابوو چیرۆکەکانی ساردۆم پێخۆش نییە. جگەرەیەکی ترم پێکرد.

ئێمیل گوتی «نەمدەزانی جگەرە دەکێشی.» دیسان لە بابەت ویۆلێتەوە دوا کە کیژێکی چەند بێ گرێ و گۆڵە. چەندە دلۆڤانە. چ بێ داوایە. چەندە ئۆگری شیعر و مۆسیقایە. ڕێك وەك نووسراوەکانی ساردۆ دەئاخۆت.

قیژ و هۆڕی منداڵان کە لە حەوشەوە بیسرا ئێمیل لەجێوە ڕابوو. «لەگەڵ دایکم دەئاخۆی؟ نامەوێ دڵی بیەشێ بەڵام ئەگەر ڕازی نەبێ چارەم نییە ـــ» ماڵاوایی کرد، پاشان بە دڕدۆنگیەوە چاوی لێم کرد ئەوجار قۆڵمی گرت و گوتی «تکا دەکەم.» و ڕۆیی.

بەرشێوم دەدایە منداڵان و هەوڵم دەدا گوێ لە قسەکان بگرم. «تاقیکردنەوەی ماتماتیك فرە سانا بوو.» «دوو حەوتوومان بۆ جەژنی کۆتایی ساڵ ماوە.» «ئیمڕۆ

مەشقی شیعری چوار وەرزمان کرد.» « لە شانۆ دا ئێمیلی سێندرێلایە.» «شازادەی شانۆ هاوپۆلی ـــــ »

ئارمەن بابۆڵە و شەربەی شیری راکرد و ئەسکەملی کێشاوە دواوە. «سبەی تاقیکردنەوەی جوغرافیام هەیە.»

چاوی دووانەکان بە دوای ئارمەنەوە گەڕا هەتا چوویە ژوورەکەی و دەرگەی داخست. پاشان دەنگەکانیان هێنایە خوار. ئارمینە گوتی «ئارمەن دوای مەشقی شانۆ لە بناگوێی هاوپۆلەکەیدا کە شازادەیە.» ئارسینە گوتی «بەڵام بەر لەوەی شەڕ بکەن ئاغای بەڕێوەبەر پەیدا بوو.» پرسیم «ئێمیلی چی کرد؟» بە یەکەوە گوتیان. «پێکەنی.»

# ٤٢

دەمەو زەردەپەڕ بوو، رۆژ هێزێکی ئەوتۆی بە بەرەوە نەمابوو. بەم پێیە شۆڤرلێتە کۆنە لە شەقامدا راگیرابوو و دەرگای کاڕێژ بۆ میوانداری لە کادیلاکی سەوز لەسەر گازەرەی پشتێ بوو. دووانەکان چەمابوونەوە سەر مێزی چێشتخانە و لە گۆواری مانگانەی "لۆسابیر" ورد ببوونەوە. گۆوارەکەم راکرد. «سبەی تاقیکردنەوەتان هەیە.»

ئارمینە لووتی هەڵقرچاند. «تاقیکردنەوە ئیمڕۆ بوو کە لێیان وەرگرتین.» ئارسینە لووتی تێك نا. «هەر نەبێ هەتا لاپەڕەی ئاخر چاوی پێدا بگێڕین.» گۆوارەکەم تووڕ دایە سەر پێشخان. «بەر لە خەوتن. ئێستا مێژوو دەور بکەنەوە لێتان بپرسمەوە.» لە یەکتریان روانی و بێدەنگ لە چێشتخانە وەدەرکەوتن. یەك دوو حەوتوو بوو خۆیان بە هیچ شتێکەوە ماندوو نەدەکرد. دەمگوت دەبێ لەبەر چی بێ؟ واتا منداڵەکانیش هەستیان بە بێ وازی من کردووە؟

ئارتووش گوتی «ئەوانە هێندە ئارایان لەگەڵ قاوە نایە، چا دەخۆنەوە.» کەترییەکەم تەژی کردو نامە سەر ئاور و دوای نیو سەعات کەشەفە چام بردە ژووری دانیشتن. میوانەکان لە ژێر لێوەوە سوپاسیان کرد و ئارتووش بزەی هاتێ و دەرگەی ژووری لە پشت سەرمەوە داخست.

چوومە ژووری خەو، لەسەر قەرەوێڵە راکشام و چاوم لە پانکەی ساپتیە بوو. لەگەڵ خۆم دوام، بۆچی هەر نەفامی دیتران دەبینی؟ بۆچی بە دروستی گوێ نادەیە قسەی خەڵکی؟ بۆچی رەخنە لە ئالیس دەگری؟ خۆت کە خراپتر لە هەمووانی.

رابووم بەرەو پەنجەرە چووم. دەمەو زەردەپەڕ بوو و رەنگی لقە رووتەکانی سێدر بۆر دەینواند دەبوا خۆم بە شتێکەوە خەریك کردبا کە بیر لە شتێ نەکەمەوە. کەشەوەکان رێك و پێك بکەم؟ حەوتووی پێشتر رێك و پێکم کردبوون. کتێب بخوێنمەوە؟ کتێبەکان لە ژووری دانیشتن بوون و نەمدەویست کاتی ئارتووش و میوانەکان بگرم. ئەمە ئیتر بیانوو بوو. وازی خوێندنەوەی کتێبم نەبوو. شێویش حازر بوو. بچمە کارێژ. لەمێژ بوو گەرەکم بوو ئەو شتە بێکەلکانەی کە لە کارێژ دا کەڵەکەمان کردبوون توور هەڵدەم.

هەر کە لە دەرگەی ماڵ وەدەرکەوتم، دەنگێکم بیست و هەستم کرد یەکێك بەنێو شمشادەکاندا چووە کارێژ. کێ بوو؟ میوانەکانی ئارتووش کە هێشتا هەر لە ژووری دانیشتن بوون و منداڵەکان خەریکی دەور کردنەوە بوون. دەرگای کارێژی ئێمە و ماڵە ئاغای رەحیمی هەردوویان داخرابوون. گوتم نەکا هارو هاجی ئارمەن هۆی دابێتەوە؟ نەکا بەڵایەك بەسەر کادیلاك بێنێ؟ ئەمن چاو لێکە پێم وابوو کوڕەکەم مەزن بووە. دەرگەی کارێژی خۆمانم کردەوە.

نازانم ئەمن زۆرتر ترسام یا مێرە گەنجەکەی داهاتبۆوە نێو سندووقی دواوەی کادیلاك. قیژاندم. مێرەکە کە بەستە قاقەزێکی بە باوەشەوە بوو روی تێکردم و تا هاتم دیسان بقیژێنم، پێی دە تۆزگری ماشێن هاڵا و بەر بۆوە و هاواری لێ هەستا «ئاخ!» و قاقەزەکان بە گۆڕێ وەر بوون.

ئارتووش لە پشت مێزی چێشتخانە دانیشتبوو. «چەند جار دەپرسی؟ گوتم ئاگام لێنەبوو. نەمدەزانی. لەخۆڕایی وایان کرد،» جێ شەکریەکەی سەرمێزی دەهێناو دەبرد.

هەڵدەلەرزیم و هاوارم دەکرد و هیچ گرینگیش نەبوو خەریکە هاوار دەکەم. «نەتدەزانی؟ دۆستە ئازیزەکەت کادیلاکەکەی هەر بەتایبەتی لە کارێژی ئێمە رادەگرێ کە ــــ»

«دۆستی من نییە.»

«جا هەرچی بێ. دوژمنی ئازیزت. دیارە کە دۆستت نییە. دۆست ئەمکارە لەگەڵ دۆستی ناکا. خۆی لێرە چا و قاوە دەخواتەوە و هاتەران پاتەران دەڵێ و رادەسپێرێتە

پاکارەکەی* بێ راگەیەندراو لە کارێژەکەی ئێمە هەڵگرێ. ئەدی ئەگەر بە شوێنیەوە بوون؟ ئەگەر بە ماڵمان وەردەبوون؟ تۆ کە هێندە بەردی سیاسەتت لە سینگتەوە دەدا و لێی دەدەی لەخۆڕایی زەماوەندت کرد. لەخۆڕایی منداڵت بوو. ئەگەر بێرە وەربیان ئەمن و منداڵەکان چیمان بەسەر دەهات؟ جگە لەخۆت بیری کەست لەبەر نییە.»

گوتم و گوتم و گوتم ئارتووش بیستی و بیستی و بیستی. ئەوجار جێ شەکریەکەی لەسەر مێز راکرد. هێشتا هەر هاوارم دەکرد «بێ فکری، لەخۆ رازی.» ئارتووش بەجێ شەکریەکە خافڵا بوو.

«لە بەیانییەوە هەتا شەوێ بۆ تۆ و منداڵەکان دەچەوسێمەوە کەچی؟ کە هەر کارێکی خۆت پێتخۆشە بیکەی. شەترەنجێن بکەی. بە خەیاڵی خۆت کاری گەورە گەورە بکەی. پاڵەوان بازی دەرێنی و منداڵەکان وەگیانم بێنن و دەرفەتی ئەوەم نەبێ بۆخۆم و کەس جارێکیش نەڵێ "ماندوو بووی". و ــ » دەسماڵ قاقەزیم نایە سەرچاوم و وە هۆقە هۆق کەوتم. ئارتووش هەروا سەری جێ شەکرەکەی هەڵدەگرت و دایدەناوە.

بۆ یەکەم جار بوو ئیزنی بە خۆی نەدابوو لە نێو قسەکانمدا بچێتە دەرێ و هەرچی لە دڵم دا بوو هەڵمدەڕشت.

هەرچی گوتت بە گوێم کردی. ژیان لە گەڕەکی بێریم دا کاری بۆرژوواکانە، باشە. ماشێنی تازە مۆدێلمان بۆ چییە، باشە. میوانم هەیە، باشە. شەترەنجم پێخۆشە، باشە. بە شوێن شاهێندە دا چووم، باشە. هەنووکە ـــ هەنووکە وای لێهاتووە راگەیەندراو لە ماڵی منەوە بڵاو دەکەنەوە و کاکی خانەخوێ دەڵێ "ئاگام لێی نەبوو. سەرەڕۆیانە کردوویانە". ئەگەر هێندە نەفام بی نەزانی لە ماڵت دا چ باسە ئەدی ـــ »

وتەکەم تەواو نەکردو بە دەمی ئاوەڵاوە دە ئارتووش رامام کە سەری جێ شەکرەکەی هەڵدەگرت و بە بێدەنگی هەر وەك ئەوە باغچە ئاو بدا، شەکرەکانی بەسەر مێز و ئەسکەمل و عەردی چێشتخانە وەر کرد. پاشان سەرەکەی داناوە، نایە سەرمێز و لە چێشتخانە دەرکەوت.

# ٤٣

لە پشت مێزی چێشتخانە دانیشتبووم و گیرفانی رووپۆشی دووانـەکانم دەدووریـەوە کە دیسان لێواریان داتلێشابوو.

بە دوای کێشە لەگەڵ ئارتووشدا، خۆم و ئاشخێن چەندجار چێشـتخانەمان گەسـك دابوو، بەڵام لەو ریزە دوور و درێژەی مێروولەکانەوە کە هەموو بەیانییەك لە قـەراخ و سووچەکاندا دەمدی دیار بوو شەکر هێشتا لە هێندێ شـوێنێ هـەرماوە. لـەو رۆژەوە لەفزم دە لەفزی ئارتووش نەگەڕابوو و بە پێچەوانەوە هەمیشە لەگەڵ خـۆم بـە کێشـە هاتبووم کە حەق بە من یا نـا. دووانـەکان جۆلانـەیان دەکـرد و بـە دەنگـی بـەرزەوە شیعریان دەخوێندەوە:

سەگێکی کەشخەمان بوو.

چەند خەمی ئەو سەمان بوو

جیڕەی دەرگە ئاسنیەکەی حەوشە هات. پاشان دەنگـی پێکـەنین و قیـژە و هـەرای دووانەکان.

«سوپاس سووفی.»

«سوپاس مامۆ گارنیك.»

«هەرتك سەوز. چەندە کەشخە.»

«هەر وەك هی سووفی.»

«سوپاس . سوپاس.»

ئاوری چێشـتی لۆبیـام کوژانـدەوە و چـووم دەرگـەم کـردەوە. دووانـەکان هـەرکام "هۆلاهۆپ"ێکی سەوزی بە دەستەوە بوو و خۆیـان هەڵداویشـت. لەبـەر دەرگـە گـوتم «ئاخری کاری خۆت کرد؟» گارنیك چاوی لێم کرد و دەستی راوەشاند و بـۆ لام هـات. «قسەی پیاوان یەکە. گوتبووم دەیکڕم، کڕیم.»

لە چێشتخانە دا ساکۆ و قوتووی دەرزی و داوم لەسـەر مێـز راکـرد و نامـە سـەر یەکێك لە ئەسکەملەکان. هـەر مانگـەی لەیسـتۆکێکی تـازە دەکەنـە مـۆد. بێتـوو هەموویان بکڕین ، هەم ئێمە نابووت دەبین هەم منداڵەکان بەد عـەمەل دەبـن، تۆمـەز هەر هیچ بەدئاکار نین. قاوە دەخۆیەوە یا شەربەت؟»

گارنیك دانیشت پەڕۆیەكی زەلامی لە گیرفانی دەرێنـا و لەسـەر و ملـی خشـاند. «لەپێشدا ئاوی سارد، دوایە قاوە و ئینجا شەربەت. منداڵ هەر ئەو چەند ساڵە وردن و لەیستۆكیان خوشدەوێ. چاو لەسەریەك دانێی باڵایان كـردووە و وەك ئێمـە چـارەڕەش بوونە. تا ئێستا كەسیش بەم خەرجانە نابووت نەبووە. ئارتووش لەكوێیە؟»

شووشەی ئاوم لە سەلاجە دەرێنا و شەربەش لە قەفەزەكەدا. ئاوم دە شەربە كـرد و نامە سەر مێز و قاوە جۆشم راكرد. قاوەم پێوا. «قاوەی تەژی لە شەكر یا كەم شەكر؟ نینا لە كوێیە.

گارنیك یەكپشوو ئاوی خواردەوە و شەربەی بەتاڵی نایە سەر مێز. «لەگەڵ ویوڵێت چوونە بازاڕ سەرچەفی ئامریكایی بكڕن. دیسان بلّێ منداڵ مرۆڤ نابووت دەكەن. تەژی لە شەكر، ئارتووش هێشتا نە زۆڕیاوەتەوە؟»

چاوم لە قاوە بوو كە هەڵنەچێ گوتم «ئەمنیش دەبێ سەرچـەف بكـڕم.» قـاوەم دە فینجانەكان كرد و لە پشت مێز دانیشتم.«گاتا لێوەكەم؟»

فینجانی قاوەی كێشایە لای خۆی. «كێشەتان بووە؟»

دەنگی منداڵان لە حەوشە دەهات. «چل و پێنج، چل و شەش، چل و حەوت ــــ »

گارنیك قومێكی قاوە فڕ كرد و گـوتی «چـۆنم زانـی ، هـا؟» چـاوی لـێم كـرد و پێكەنی. «یەكەم ئەوەی كە سەد جار قاوەت بۆ دروست كردووم و دەزانی قاوەی تـەژی لە شەكرم پێخۆشە. دووهەم ئەوە كە دیسان پرسیم ئارتووش لە كوێیە قسـەی دیكـەت كێشایە نێو قسان. چ بووە؟»

بیرم لەوە كردەوە مەبەستەكە بـاس بكـەم؟ نەیكـەم؟ گـوتم «لـە دەسـت سیاسـەت كاریەكانی ئارتووش وەڕەزم.» دەنگی سووفی لە حەوشەوە هـات، «هەركـەس سـەدجار سووڕاندی بردوویەتەوە.»

گارنیك ماوەیێ چاوی تێبڕیم. پاشان فینجانی چەندجار بەسەر مێزەكە دا هێنـا و برد. ئەوجار لە پەنجەرەوە روانیە دەرەوە. «باشە، هەركەس باوەڕێكی هەیە.» ئارتووش زۆرجار گوتبووی «داشناكەكان بەر لەسەری دمی خۆیـان بـەو لاوە هـیچ جێیـەكی تـر نابینن.» گارنیك هـەموو جـارێ گوتبـووی «سـەری دەمـی خۆمـان فـەرزتر لـە دوور دوورەكان نییە؟»

رابووم و چێشتی لۆبیاکەم لێکدا. «مەسەلەی باوەڕ نییە. مەسەلەی لە خۆ رازی بوونە. ئێمەی ئافرەت هەر لە بەیانیەوە دەبێ بچەوسێینەوە هەتا هەموو شتێ بۆ پیاوان حازر و ئامادە بێ کە بە خەیاڵی خۆتان دنیایەکی باشتر دروست بکەن. نە ئێمەتان مەبەستە، نە منداڵ.»

پێم وابێ پێنج خولەکێك "ئێمەی ئافرەت" و "ئێوە پیاوان"م کرد و گارنیك کپ گوێی پێدام. ئیرادی کارەکە لەوە دابوو کە وتەکانم تەنانەت لای خۆشم نابەجێ بەرچاو دەهات. شتێکم جێ خستبوو. دڵنیابووم لە جێیەکەوە حەق بە منەو بەم پێیە نەمدەزانی چۆن بڵێم کە وەبەر چاو نەیە نیقە و ناڵەی ئافرەتێکی بە پرتە و بۆڵەیە کە لەگەڵ شووەکەی بەکێشە هاتووە.

گارنیك رابوو و چووە لای ئاورەکە، سەری قابلەمەی لۆبیای راکرد، بۆنی کرد و گوتی «بەهـ بەهـ سەیر لۆبیایەکە لەم بیرە دام کە ئەگەر ئێمە پیاوانی خۆت گوتەنی لەخۆڕازی هەوڵ نەدەین خۆت گوتەنی دنیایەکی باشتر چێبکەین، ئێوەی ئافرەت لەم قابلەمەیەدا چ لێدەنێن؟ تازە ئەگەر قابلەمەیەك مابێ.» سەرە قابلەمە بە دەستەوە لێم روانی. پاشان سەری چەماندەوە و بزەی هاتێ.

کیژەکان لە حەوشە قیژاندیان «نەوەدو هەشت ، نەوەدو نۆ و حیلکە حیلك!!!.» دڵنیا بووم قسەی گارنیك دەبێ وەڵامێکی هەبێ دڵنیابووم و شتێکم بە زەین نەدەگەیی. گوتم «چێشتی لۆبیا ناخۆی؟»

## ٤٤

یووپ گوتی «هیوادارم ئەتۆش وەك من و ئالیس ئەم هەڵوێستەت بە کەیفێ بێ. نامەیەکم لە دایکم و پوورم رێکردە هۆڵەندا، ئەوانیش خۆشحاڵ و رازین. ئەگەر تۆش رازی و کەیف خۆش بی، من و ئالیسیش کەیف خۆشین.» ئارتووش گرێی بۆین باخەکەی شل کردەوە و لە نێو راحەتیەکەدا ئەو تەنیشت ئەو تەنیشتی کرد.

ئالیس رۆژی پێشتر گوتبووی «بە ئارتووش بڵێ بۆین باخ لێ بدا. خۆشت جلی بەرێوجێ لەبەر بکە. لێویشت سوور بکە. منداڵەکان رێکە لای نینا یا چووزانم ــــ بە

کورتی دەس بزێوی نەکەن.» تەنانەت هەر بۆی نەچووم بۆچی. بۆنەی بە رواڵەت خوازبێنی بۆ لە ماڵە خۆی ناگرێ؟

بۆ ئەوەی کارێکم کردبێ، هەستام شیرینیم گێڕا. یووپ لەو نان خامەییانەی راکرد کە ئالیس کڕیبووی و دەستی لەو شیرینیانە نەدا کە من دروستم کردبوو. گوتی «نان خامەم زۆر پێخۆشە. شات شات لاو*.» و چاوی لە ئالیس کرد و بزەی هاتێ. ئالیس پێکەنی و رووی لە من کرد. «ئەوە خەریکم ئەرمەنی فێر دەکەم.» پاشان قاپی شیرینی خۆماڵی وەلانا. «هەر نان خامەیی پێخۆشە.» و سەری خوار کردەوە و لە یووپ راما.

دایکم گوتی «شات شات مێرسی*» و بە پێکەنینێکی کە هەر دەتگوت بە دەم و چاوی وەنووساوە لە مەودای فرە کورتی نێوان یووپ و ئالیس راما و سەری بادا.

ئارمەن لە ژووری خۆی بوو و دووانەکان چووبوون سواری دووچەرخەبن. پوولم پێدان لە "دێری" نان بکڕن و «هەرچی گەرەکتان بوو» لە ئوستوور. چاویان روون بۆوە.

یووپ تەرزی ئاوی گەرمی ماڵە خۆیان لە هولەندای بە وردی بۆ ئارتووش شی کردەوە و ئارتووش بە سەرنجەوە گوێی پێدەدا. نەمزانی دەیویست کاتێك دیاری بکەن یا هەر بەڕاستی مەبەستەکە بۆی سەرنج راکێش بوو.

ئالیس بە دەم روانین لە ساپیتە گوتی «بیستوومە ئێمیل و ویۆلێت زەماوەند دەکەن.» لەو دەمەوە زەماوەندی لەگەڵ یووپ یەقین ببوو لەکاتی ئاخۆتن دا چاوی لە چاوم نەدەکرد یا ـــ ئەگەرچی بەژنی لەمن کورت تر بوو ـــ بە چەشنێ دەئاخۆت کە هەر دەتگوت لە سەرەوە را چاوم لێدەکا. «ویۆلێتی بەستەزمان، بەو خەسووە نابەجێیەوە بێشك لای وایە هەرکە زەماوەندیان کرد خاتوونی کورتە باڵا هەر زووەکی جەواهێراتەکەی لەپێشدا دەنێ.»

دایکم لە چنینی مێزی شێو دا یارمەتی دام و لە هاتووچۆی نێوان فراوێن خۆری و چێشتخانە دا بێ نێوبر ئاخۆت.

«ئاواتم بوو ئالیس لە کلێسای ئابادادا زەماوەند بکا. دەبەر خاچی مێحرابی مریەم. تا ئێستا هەرچی نەزر و نیازم بووە پێیداوم. بە سلامەت لەخۆبوونەوەکانی تۆ. زوو چا بوونەوەی دەستە شکاوەکەی ئارمەن، برینگەری ئالووی دووانەکان. ئەمەش دوامینیان. دیسان سێ خەروار سالادت دروست کرد؟ ئێمە خۆ سالادخۆرمان نییە. هەرچەند کارێکی باشت کرد، چێشتی ئەم رۆژانەی ئالیس بۆتە سالاد و هیچی تر.

دوانەکان و ئارمەن لەسەر مێزی چێشتخانە دا کایەی مار و پیللەیان دەکرد.

«چوار هات.»

«نەخێر، سێ بوو.»

«چوار بوو. وەنییە ئارسینە؟»

«چوار بوو. ئارمەن تەشقەڵەی مەکە.»

«یەك ــ دوو ــ سێ ــ چوار. وژژژ چوومە سەرێ. ئارسینە نۆرەی تۆیە.»

دایکم ساسی بە سالاد داکرد. «هیچ پێم خۆش نییە یووپ پێی وابێ لەو خەسوانەم کە خۆ دە هەر کارێك هەڵدەقوتێنن. ئەگەریش چوونە هۆڵەندا و ویستیان لەوێ زەماوەند بکەن، با بیکەن. کلێسا لەگەڵ کلێسا جیاوازی نییە.»

ئارمینە گوتی «نانی باسی کلێسای کرد بیرم کەوتەوە. ئیمرۆ یەکێ لە پۆلە شەشەمیەکان قسەیەکی خۆشی گێڕاوە. بیگێڕێنەوە ئارسینە؟»

ئارسینە گوتی «بیگێڕینەوە.» پاشان ئارمەنی ئاگادار کردەوە کە «شوێنی مۆرەکەت لەو ماڵە دایە. سەرەوەی ئەم مارە زلە. دیسان تەشقەڵەی نەکەی. ئارمینە بڵێ. دایە، نانی، گوێ بگرن.» و بە نۆبە دەستیان دایە گێڕانەوە.

«منداڵێکی بەدفەڕ* زوو زوو دەچوو لە دەرگەی کلێسای دەدا.»

«هەتا قەشە دەرگەی دەکردەوە رایدەکرد.»

«جارێکیان قەشە لە پشت دەرگە خۆی شاردەوە.»

«هەر کە منداڵەکە لە دەرگەیدا،»

«قەشە یەکجێ دەرگەی کردەوە.»

«منداڵە بەدفەڕەکە حەول بوو و گوتی ـــ »

«زۆر ببوورە، عیسا لە ماڵە؟»

دووانەکان خۆیان هێندە پێکەنین لەخۆ بوونەوە. ئارمەن گوتی «دووپاتە بوو.» و دایکم هەولێدا پێنەکەنێ. «مرۆڤ گاڵتە بە حەزرەتی عیسا و کلێسا نادا گوناحە.»

بە منداڵەکانم گوت باروبارخانەی کایە کۆ بکەنەوە و قابلەمەی پلاوم نایە سەرمێز، دایکم دەستی کرد بە پشکنینی قولێنەی سەوزی خواردن. «خۆم بە یووپم گوت بێشك دەبێ جەژنەکە لێرە بگرن.» هیوادار بووم قولێنە بگاتە سەر مێزی شێو، دایکم بە بیانووی سیس و ژاکاو بوون نیوەی سەوزیەکان دە سەتلی زبل نەکا. «خۆ کیژەکەم لە

سەرەرێ نەدۆزیوەتەوە بە بێ بەڕێوە بردنی رێو رەسم بینێرمە ماڵە شوو. دەوریەکەم دەیە بیبەمە سەر مێز. مەخابن کە بنکرِ نەرم بووە.»

خۆرێشتی قورمە سەوزیم لە دوو قاپ کرد و لە ژێر لێوەوە گوتم «ئالیس با هەر زەماوەند بکا. لەنێو کلێسا، لە دەرەوەی کلێسا، بە هەلپەڕین، بێ هەلپەڕین. هەر زەماوەند بکا.»

دایکم بە پێکەنینەوە رووی تێکردم. «تێگەیشتی یووپ چی گوت؟ گوتی ـــــ »
پەڕیمە نێو قسەکەی. خۆرێشتەکان بەرە هەتا پارنجەکە تێکەم.

دایکم دەمکێشی لەسەر پارنج راکرد جەژنیشیان نەگرت، نەگرت پارەیەکی زۆر خەرج بکەین بیدەین خەڵك بیخوا کەچی؟ « ـــ پارنجێکی فرە خۆشە. دەوریەکە بدە خۆم تێیدەکەم، توشەکەت بوویە.

دەوریم وەدەستیدا. پالم وەپێشخان دا و شەربەتی ویمتۆرکە بۆخۆمم دروست کردبوو خواردەوە. شەکەت بوونم بیانوو بوو. ئەو پارنجەی دایکم پێی وابوو هەر ئەرمەنیەکانی جولفا دەزانن لێی بنێن و هەموو سالێ رایدەسپارد لە ئیسفەهان بینێرن، خۆی دروستی کردبوو و گەرەکی بوو خۆی تێیبکا نەوەکوو من خرای بکەم.

سەهۆڵی* شەربەت توابۆوە و شەربەتەکە شیلەوتێن ببوو و وازی ئەوەم نەبوو سەهۆڵ تر بیەنم. پاشان بیرم کەوتەوە بۆ شێو سەهۆڵمان پێویستە و زۆڕیامەوە لای سەلاجە.

دایکم زۆر بە وردی کوتە گۆشتەکانی لەسەر پارنج ریز کرد. «خۆیان دەزانن. ویستیان جەژن بگرن، نەیان ویست نەیگرن. بە ئێمە چی کە خۆی تێهەڵقوتێنین.»

سەهۆڵەکانم کردە نێو دەفرێکی بلوور. دایکم سەرەکەی راست و چۆپ کرد و روانیە دەوریی پارِنج. «کوا بزانم زاوا ئازیزەکەمان پارِنجی پێخۆشە یا نا؟» و قاپەکەی راکرد و بەرەو دەرگەچوو. «بەلام خۆزگا جەژنیان گرتبا.»

دووانە خۆیان بە ژوور داکرد.

« دایە.»

« دایە.»

« چاو چی هێناوە.»

«چاو چی هێناوە.»

یووپ دوو بووکڵەی بۆ دووانەکان هێنابوو. بووکڵەیەکی کوڕ و یەکی کچ، دەفری جەمەدم ڕاکرد و لەتەك دووانە و بووکڵەکان چووینە ژووری دانیشتن. بە دەنگێکی بەرز گوتم «کەرەم کەنە سەر مێز.» بە بۆنەی هێنانی بووکڵەکانەوە سوپاسی یووپم کرد و هێمای دووانەکانم کرد سوپاسی لێ بکەن.

ئارمینە چووە لای یووپ. ڕوومەتی بردە پێش و گوتی «سوپاس».

ئالیس گوتی «بلێ سوپاس ئاپۆ یووپ.»

ئارسینە ڕوومەتی بردە پێش و گوتی «سوپاس ئاپۆ یووپ.»

یووپ هەرتکی ڕاماوسی و ئارتووش پرسی «چ ناوێکتان لە بووکڵەکان ناوە؟»

دووانە لە یەکتر ڕامان. پاشان بە یەکەوە گوتیان «دەبێ بیری لێ بکەینەوە»

ئارمەن کە بە زەبتی نوێ و بریقە دارەوە وەژوورکەوت هەموو وێکڕا گوتمان «چەندە کەشخەیە!» یووپ سوور هەڵگەڕا و ئارمەن لێی چووە پێش و تەوقەی لەگەڵ کرد و سوپاسی لێکرد و یووپ چەندجار گوتی «تکایە، تکایە.»

یووپ لەکاتی شێوخواردن دا تاریفی پارنجی کرد و دایکم چەند جار گوتی «ئانوش، ئانووش» و ئالیس گوتی یانی «نووشی گیان، نووشی گیان.» پاشان دایکم بە یارمەتی ئالیسەوە ڕاژەی کردەوە کە پارنج شتێکی وەك ساواری گەنم یا جۆیە کە لەپێشدا سووری دەکەنەوە و پاشان لەگەڵ گۆشت و ڕۆن و پیوازێکی زۆر و زەردە چیوە وەك پلاو دێمی دەکەن و لەکاتی دێمکردندا دەبێ زوو زوو لێکی بدەن هەتا بنکڕ نەگرێ. ئالیس کە لە وەرگێڕانی وتەکانی دایکم شەکەت ببوو گوتی «باشە دەی، واز بێنە! خۆ بڕیار نییە سۆزی کێبەرکێی چێشت لێنان بدا.»

یووپ لەکاتی ماڵاوییدا دووانەکانی ڕاموسی. ئاڕمینە گوتی «بۆ بووکڵەکانیش ناومان دیاری کرد.» ئارسینە هاتە بن گوێم و پرسی «نازناوی ئاپۆ یووپ چ بوو؟ سەبر بلێ.» گوتم و ڕایکردە لای ئارمینە و سرتەیەکی لەبن گوێی دا کرد.

ئارمینە بووکڵە نێرینەکەی لە پێش ئێمە ڕاگرت. «ئاغای یووپ هانسێن.» قاقای ئالیس وەسەر پێکەنینەکەی ئێمە کەوت.

یووپ دەستی درێژ کرد، لەبری تەوقە کردن چوومە پێش و لە باوەشم گرت و هەردوو کولمەم ڕاموسی و پیرۆزباییم لێکرد. ئارتووش و دایکم بێشك پێیان سەیر بوو

و ئالیس؟ خوا دەزانێ چۆنی بیر دەکردەوە و هەر هیچ بۆم گرینگ نەبوو چی بیر دەکردەوە. هەر بۆخۆم دەمزانی چەندە قەرزداری یووپ هانسێنم.

ئەو شەوە چیرۆکی کیژێکم بۆ دووانەکان گێڕایەوە کە چونکە کاری چەوتی کردووە خەون دەبینێ کە بۆتە بۆق و زۆر دەترسێ و بەیانی کە لەخەو را دەبێ دەبینێ بۆق نییە و کەیف خۆش دەبێ و لێدەبڕێ ئیتر کاری چەوت نەکا.

ئارمینە باوێشکی هاتێ «چیرۆکێکی سەیر بوو.»

ئارسینە گوتی «بەڵام برێ زمان لووس بوو. وەنییە ئارمینە؟»

ئارمینە خەوی لێکەوتبوو.

لەتەك ئارسینەوە «سێ دانە سێو لە ئاسمانەوە کەوتە خوار»ەوەمان خوێندەوە. چرای ژوورم کوژاندەوە هاتمەدەر و لە دالاَندا بە خۆمم گوت «هەق بە ئارسینەیە. چیرۆکێکی بێتام بوو.» و چوومە ژووری دانیشتن.

بە دوای رۆیشتنی میوانەکان، ئارتووش دەستی بە سکی داهێنابوو و پێکەنیبوو. «هێندەم پارنج خواردوە وەختە بتەقم. چووم بخەوم.» و چووبووە ژووری خەو.

لەهەمبەر تەلەویزێونی کووژاوە دانیشتم و پێیەکانم راکێشایە سەر مێزی پێش راحەتی. دەستم چووە لای سەرم و خەریکی لوولە کردنی قژم بووم. حاڵم خاس بوو و خەوم نەدەهات. بۆ؟ چونکە هەموو قاپەکانم شوردبوو و ژووری دانیشتنم خاوێن کردبۆوە و دایکم گوتەنی ماڵ ببوویە دەستە گوڵ؟ یا چونکە ئالیس ئاخریەکەی خەریك بوو زەماوەندی دەکرد و بە پێچەوانەی بۆچوونە سەرەتاییەکەی من و دایکم، مێرێکی باش و دلۆڤان دەهاتە بەرچاو؟ یا رەنگبێ لەمەڕ دوێنێ کە ئارتووش لە رۆژان زووتر هاتەوە ماڵ، بە دوو گوڵدان گوڵە نۆکەی پەمەیی و چەرمووە. ماوەی چەند چرکە سات گێژو وێژ دە گوڵدانەکان رامام، پاشان چوومە پێش و هەرکە لە باوەشی گرتم گریانم هات.

چرای ژووری دانیشتنم کوژاندەوە و بە خۆمم گوت رەنگە لەبەر ئەوەش بێ کە چونکە ئیمڕۆ بەیانی لەخەو رابووم و دیتم بۆق نیم.

# ٤٥

دەی بەیانی بوو.

نینا لە پاڵ تەلەفۆنەوە گوتی «دەبینی ئەم خاتوونە زیرەکە چۆن بۆ خۆی هەموو کارەکانی جێبەجێ کرد؟ چاو لە من، کە لام وابوو هیچ نازانێ و دەبێ یارمەتی بدەم. ئیدی هەر ئەوە ماوە بە شێوەی یاسایی خەسووی داهاتووم ببینم. دووسبەی کە جەژنی کۆتایی ساڵی منداڵەکانە. بە بیرم داهات کە پێنج شەممەی داهاتوو میوانیان بکەم. ئەتۆ و ئارتووشیش دەبێ بێن. ئالیس و دایکت هەتا پێنج شەممە لە تاران دەگەڕێنەوە، وەنییە؟» گوتم دەگەڕێنەوە.

«ئەگەر وایە ژمارەی سیمۆنیانم پێ بدە بانگێشتنیان بکەم.»

«ژمارەی پێشووی خۆتت لەبیر نییە؟»

«چی؟»

«ژمارە تەلەفۆنی جی چوار. لەبیرت چۆتەوە؟»

وا توند پێکەنی کە ناعیلاج بووم تەلەفۆنەکە لەگوێم دوور خەمەوە. «دایکت گوتەنی پێم بڵێ کەرە. زۆرم ئاگا لە خۆم بوو کە ئێستاکەش ــــــ » ئاخری ماڵاوایی کرد.

تەلەفۆنەکەم داناوە و چوومە ژووری دانیشتن. مەکینەی بەرگ دروو لەسەر مێزی فراوێن خۆری بوو. جلی جەژنی کۆتایی ساڵی دووانەکانم دەدروو. بەهار حەریری چێرەیی بوو و هاوین کەتانی سوور. بۆ پایز تافتەم کڕیبوو و دەوری قۆڵەکان و داوێنی دامەنی زستان کە لە خامی چەرموو بوو پێستی کەروێشکم لێ دروو بوو. یەکێ لە خزمەکانی ئارتووش لەمێژ ساڵ بوو کوتە پێستەکانی لە تەورێزەوە هێنابوو، بیرم هاتەوە لەتەك ئالیس فرە پێکەنیبووین لەمەڕ ئەوە کە «مرۆڤی تێگەیشتوو پێست بە دیاری دەباتە ئابادان؟» دایکم گوتبووی «رایگرە. بەڵکو بە کەڵك هات.»

بە گوڵە گەنم تاجی سەرم بۆ پایز دروست کرد. گوڵەگەنمەکان یووما هێنابوونی، ئەویش دوای ئەوە کە زۆرم پێگوت چیم گەرەکە.

ژووری ماڵ فێنك و بێدەنگ بوو، بۆی کێکی بادامی کە نابوومە نێو فیێر هەموو شوێنێکی تەنیبوو. گوڵە گەنمەکانم بە چەسپ بە یەکترەوە لکاند و بیری ئەوەم کردەوە بۆچی بە نینام نەگوت ئەم رۆژانە لە سیمۆنیانەکان بێ خەبەرم؟ دەمزانی ئیمێلی چەند رۆژێکە نەچۆتە قوتابخانە. دووانەکان کە گوتیان «رەنگە نەخۆش بێ ئیزنمان دەدەی سەرێکی لێ بدەین؟» گوتم «نا» ئارتووشیش کە گوتی «ئیمێیل چەند رۆژێکە نەهاتۆتە کۆمپانیا. سەری لێنادەی؟» گوتم «نا.» دووانەکان لووتیان گرژ کرد و ئارتووش هەر برۆی هەڵتەکاند و شووی لێ هەڵنەکێشا.

گوڵە دەسکردە شین و پەمەییەکانی کە بڕیار بوو ئارمینە لەگەڵ جلی بەهاری لەسەری بنێ لە نەوارێکی پانم دروو. بۆچی نەمدەویست بە شوێن سیمۆنیانەکاندا بچم؟ رەنگبێ لەمەڕ ئەوە گەرەکم نەبوو خۆ دەکار و بارەکانیان هەڵقوتێنم. ئەگەر چووبام و لەگەڵیان تێکەوتبام دەبووایە لایەنی کامیانم گرتبا؟ دایك یا کوڕ؟ دوو لایەنی نەوارە درێژ و پانەکەم کە لە پەموو دروست کردبوو و سەرو بەندی زستان بوو بە یەکەوە لکاند و لە پەنجەرەوە روانیمە دەرەوە.

ئەم بنەماڵە سێ کەسیەم لەچەند رۆژ بەر لەمە نادروست دەهاتە بەرچاو. دەتگوت ئەوان لەمن یا من لەوان دوور کەوتبوومەوە، هەستم بەوە دەکرد گشتی ئەم رووداوە فیلمێك بووە کە زۆر لەمەوبەر دیومە و وازی لە نوێوە دیتنەوەیم نییە. لە دەرەوە بایەکی هێدی دەهات و لەنێوان لق وپۆی دارە بێعارەکاندا، پەنجەرەی ژووری دانیشتنی جی چوار دیار و نادیار دەبوو. بۆ سەر و بەندی هاوین هێشتا بیرێکم نەکردبۆوە. ئەگەر ویستبام گوڵی پێوە بلکێنم شێوەی بەهاری دەدا. جگە لە گوڵ چ شتێ نیشانەی هاوین بوو؟ چی وام بە زەین نەگەیی. بە خۆمم گوت «پاشان بیرێکی لێدەکەینەوە.» نا، دڵم نەیدەویست بچمە ماڵی سیمۆنیانەکان. هەروا باشترە خۆی تێنەقوتێنم. چاوم لە جلەکان کرد و بیرم بۆ ئەوە چوو بۆ هاوین بە شمشاد تاجێك دروست بکەم.

# ٤٦

حەوشەی قوتابخانەیان رازاندبۆوە گلۆپی چکۆڵەی رەنگی بە دارەکانەوە هەڵواسرابوو و دیوارەکان تەژی لە وێنەگەری منداڵان بوو، سەکۆی شانۆ بە پەردەی مەخمەری سەوزەوە، لە بنەبانی حەوشە هەڵکەوتبوو، ریزی ئەسکەملەکان لەپێش سەکۆوە دەستی پێدەکرد و هەتا بەر دەرگە درێژەی بوو. ئارمەن ئەندامی کۆڕی چاودێری بوو کە باوك و دایك و میوانەکانی رێنموونی دەکرد و بەرپرسی بووفەش بوو.

لەسەر ئەسکەمل دانیشتم و لەگەڵ ناسیاوەکان چاك و خۆشیم دەکرد کە ئارتووش دەستی نایە سەرشانم و گوتی «مانیا» و هێمای کردە پێپلەکانەکانی لای سەکۆی شانۆ. مانیا لەسەر پێپلەکان را دەستی رادەوەشاند کە «وەرە.»

بە ئارتووشم گوت جێگەکەم راگرێ و چوومە پشت شانۆ. کیژەکانی کۆڕی هاوخوێنی بە دامێنی سورمەیی و فانیلەی چەرموو و کوڕەکان بە شاڵواری سورمەیی و کراسی چەرموو بێ نێوبڕ دەئاخۆتن و قیژە و هەرایان دەکرد و هاوار هاواری ئاغای ژوورا مامۆستای مۆسیقاکە لێگدا لێگدا دەیگوت «بێ ێ ێ دەنگ!» بێفایدە بوو.

مانیا وەك هەمیشە نیگەران و لە جۆش و خرۆش بوو. نەواری سەری کیژە قژ سوورەکەی بەست و گوتی «هەڵێ لەسەر جێگەت راوەستە و هێندە مەجووڵێوە کە نەوارەکەت زوو بکرێتەوە.» پاشان زۆریا لای من. «ئەتۆ بە ئێمیل سیمۆنیان نازانی؟»

لە چەند رۆژی رابردوو دا ئارمینە و ئارسینە یەك بین گوتبوویان «ئێمیلی ئەمرۆش نەهاتبووە قوتابخانە.» خاتوون مانیا گوتی ئەگەر ئێمیلی سبەی نەیە دەبێ سێندریلایەکی تر وەدۆزین.» یەکێ لە قوتابیانی پۆلی حەوتەم بوو بە سێندریلا.» «بە بڕوای ئێمە ئێمیلی سێندریلایەکی کەشخەتر بوو.»

گوتم «ئاگاداری نیم. بیستم یەکێ لە پۆلە حەوتەمیەکانت لەجێی داناوە.»

مانیا دەستی کیژۆڵەیەکی کە پەردەی مەخمەری لادابوو و دەستی بۆ جەماوەر رادەوەشاند، کێشا و گوتی «هۆی کلك براو، کێ بە تۆی گوت بێیە ئێرە؟ هەتا نۆبەی بەرنامەت دێ برۆ بچۆ ژووری جل داکەندن.» نقورچێکی لە کوڵمەی کیژە داگرت و کیژە بە جلی ناوچەیی پڕچین و رەنگاو رەنگ بە پێکەنینەوە لێیدا رۆیی. مانیا روانیە دەور وبەر، «ئا، سێندریلایەکی نوێم دۆزیوەتەوە.» و کیژێکی پێشاندام کە بە

دامێنێکی سەوزی ئاودامێنی لەبەر دەم ژووری جل داکەندن وێستابوو و خەریك بوو لێچکەکەی خوار لەسەر دەنا. «کەشخەیە، وەنیە؟» چاوم لە کیژەکە کرد کە هەر لەوکاتەدا لەمن رامابوو و بزەی هاتە سەر لێو.

مانیا گوتی «ئەم حەوتووە سەرم هێندە قاڵ بوو دەرفەتی ئەوەم نەبوو تەلەفۆن لە سیمۆنیانەکان بکەم.» پاشان بەرەو رووی سێندرێلای نوێ قیژاندی «خاتوون ژاسمەن لێچکە خوار بەستنمان نییە. سێندرێلا بەر لە چوونە کۆشکی شازادە لەو ناز و نیمنازانەی نەدەکرد.» ئەوجار رووی لەمن کرد. «هەنووکە مەبەست سێندرێلا نییە. چارەرەشی ئەوشۆم شازادەیە. دایکی شازادە هەر ئێستا تەلەفۆنی کرد کە کوڕەکەی سوورێژەی دەرکردووە. جا ئێستا نازانم قوڕی کوێ وەسەر کەم.»

گوتم «بێگومان ناخوازی دەوری شازادە بە من بسپێری.» هیچ کارێك لە مانیا دوور لە چاوەڕوانی نەبوو.

دایە پێکەنین. بێ جێش نەبوو. قەڵافەتیشت خراپ نییە.» ئەوجار پێی لەسەر داگرت «گوێ بگرە. ئارمەن بۆ هەموو مەشقەکان دەهات، بەتایبەت بەشی سێندرێلا و شازادە. هێندێ جار هەڵەی منداڵەکانی راست دەکردەوە. لە ئارمەنم باشتر پێ شك نایە. ناردم جلەکانی سوورێژە گرتوویان هێنا. لە ئارمەن دێ. قەڵافەتیان وەکویەکە هەتا بەرنامەی کۆڕی هاوخوێنی و شیعر خوێندنەوە و سەما تەواو بێ - » خەریك بوو لەکات ژمێری دەستی ورد دەبۆوە. «پاشانیش خەڵاتی قوتابیانی پلەیەکەم پێشکەش دەکەن و ـــ بەم پێیە سەعاتێك و چەند چرکەمان دەرفەت هەیە. بەڵکو بتوانین دەورێکی تر پێدا بێینەوە. خراپ نییە، وەنیە؟»

بلێندگۆیان دەبردە جەرگەی سەکۆ، خۆم کێشاوە دواوە وێینەکەوم «ئەگەر ئارمەن ئیزن بدا، بیرێکی خراپ نییە.»

مانیا پێکەنی و دەستی بە پشتم داهێنا. «تۆ برۆ بیدۆزەوە بینێرە ئێرە، ئەمن رازی دەکەم.»

بە نێوان ریزی ئەسکەملەکاندا کە گشتیان پڕ بوو تێپەڕیم، بەم بیرەوە کە دووریش نییە بتوانێ رازی بکا. هەرچەند کە ئارمەن لە کەللە شەقی و نەکردنی کارێکی کە گەرەکی نەبوو بیکا خۆی دیاردەیەك بوو، مانیاش لە کردنی کارێکی کە گەرەکی بوو

بیکا سەیر و سەمەرە بوو. کەوتمەوە بیر چەند ساڵ لەمەوبەر کە قەشــەی بــەد خــولْقی کلێسای رازی کردبوو دەوری قەراڵ لە شانۆی ساڵی نوێدا بگێڕێ.

بە شوێن ئارمەندا گەڕام. لە رەخ بووفە دا خەریك بوو شووشە پێپســی و کانــادای دەنایە نێو سندووقی جەمەد. گوتم بچووە پشت سەکۆ لای مانیا، کاتێ زۆریامەوە سەر جێگاکەم، نینا لە پاڵ ئارتووش دانیشتبوو، جانتاکەی لەسەر ئەسکەملی بەتاڵ راکرد. «وەرە ، وەرە جێگەم راگرتووە. ئێستا بلێ بزانم چ باسە؟» گوتم «کوا گارنیك؟» تونـد گوتی «بە ماوەی چەند رۆژ چۆتە مەعمووریەتی ئەهواز. تەلەفۆنی سیمۆنیانەکان بۆچی وەڵام ناداتەوە؟» چاوم لە دەور و بەر کرد. ویوڵێت دیار نەبوو.

نینا قوڵمی کێشا. «هۆشت لە کوێیە؟ گوتم تەلەفۆنەکەیان وەڵام ناداتەوە. ویوڵێت وەك سەگی گوللە لێدراوی لێهاتووە. هەرچی کردم لەگەڵمان نەهات. لە ماڵدا چاوەڕوان تەلەفۆنی ئێمیلە.»

نوور هاوێژەکانی روو بە سەکۆ هەڵکران و نینا ناعیلاج بوو هاوڕێی حەشیمەت کپ بێ. پەردە لاچوو و مانیا هاتە پشت بلێندگۆ و جەماوەری بەخێرهاتن کرد. چــاوم لــە مانیا بوو، گوتم ئەگەر وەڵامی تەلەفۆن نادەنەوە رەنگبــێ هــەر بەڕاســتی کارەســاتێك روویدابێ. واتا بەڕاستی نەخۆش بوون؟ خۆزگە سەرم دابان. بۆچــی خۆیــان تەلــەفۆنیان نەکرد؟

بەخێرهاتن تەواو بوو و گشتمان چەپڵەمان لێدا. وازگــێن هایراپتیــان هاتــە پشــت بلێندگۆ و نوتقی کرد و راپۆڕتی ساڵانەی قوتابخانەی راگەیانــد. بــۆ دەبــا تەلــەفۆنیان کردبا؟ کوڕی هــاوخوێنی ســروودیان خوێنــدەوە. لــەو ســروودانەی کــە هــەموو ســاڵێ دەخوێندرانەوە. کێوە بەرزەکانی نیشتمانم، مــاڵ ئــاوا قوتابخانــەی ئــازیزم و بەشــێکی کورت لە ئۆپێڕای ئانووش. لە نەفامی خۆم دڵمەند بووم یا لە ئێمیل و دایکی؟ ئارمینە و ئارسینە بوونە بەهار و پایز و هاوین و زستان و شیعرەکەیان بــێ هەڵــە خوێنــدەوە، وەبیرم هاتەوە بە وێنەگری جەژنم نەگوت وێنە بگرێ. بۆ دەبێ لە ئێمیل دڵمەند بم؟ یــا لە دایکی؟ کوڕیژگەیەك لەکاتی هاتنی بۆ پشــت بلێنــدگۆ، لاقــی دەســیم ئــەنگوت و هێندەی نەمابوو بکەوێتەخوار و لەپێشدا هەمووەمان بە پەرۆش بووین و پاشان کە کوڕە لەسەر سەکۆ بەرەوڕووی دایك و باوکی هاواری کرد «خەتا لــەمن نــەبوو.» پێکــەنین و شیعرەکەی کە تەواو بوو زۆرتر لە هەمووان چەپڵەمان بۆ لێدا.

چارێگە سەعاتێك تەرخانی پشوو دان کرا و نینا دیسان دەستی پێکرد. «هەق بە ویۆلێت بوو. هەموو ئاورەکان ئەم خاتوونە کورتە بالآیە هەلێگرساندووە. ئێرەیی بە کەشخەیی ویۆلێت، بە گەنج بوونی، بەوە کە ئێمیل ئەویندار بووە دەبا. بە بڕوای تۆ ئێستا چ بکەین؟ تۆ دەبێ هاریکاری بکەی. دەبێ لەتەك دایکی بدوێی. دەبێ ــــ »

گەرەکم بوو هاوار بکەم «لێمگەڕێ!» ئارتووش قۆلّی گرتم «وەرە کارم پێتە.»

بەرەو بووفیە چووم. ئارتووش شتی ئاوەکی لەو کیژەی کە قۆلّبەندی سووری چاوەدێری بە باسکیەوە بوو کڕی و پێیدام. شتە ئاوەکیە شیرینەکە ئەهوەنی کردمەوە.

کیژەکە گوتی «سلاو خاتوون ئایوازیان. ئارمەنتان بە جلی شازادەوە بینی؟»

چاوم لێکرد بیرم هاتەوە کە چەند جار لەتەك ئارسینە و ئارمینە هاتبووە مالّمان. ئارمەن ناوی نابوو رووبینای خرپن. بزەم هاتێ. «خاس، رووبینا؟»

چاوەکانی لێك ناو گوتی «هەروەك شازادەی راستەقینەی لێهاتووە.» پاشان چاوەکانی هەلّێنا. پێلکەکانی چەندجار لێکدا و چووە لای مێزێکی کە سێ جار گوتبووی «تکایە، دوو دانە بابۆلّەی کالّباس.»

زۆریامە لای ئارتووش. «چکارت پێم بوو؟»

لەگەلّ یەکێك لە مامۆستاکان تەوقەی کرد و چاك و خۆشی کرد و پاشان گوتی «هیچ. مەبەستم بوو لە چنگ نینا رزگارت بکەم.»

وازگێن هایراپتیان خەلاتی قوتابیانی هەلّکەوتەی پێشکەش کرد. ئارمینە و ئارسینە هەرتك خەلاتیان وەرگرت و رایانکردە لای ئێمە. ئارسینە لەپالّ من دانیشت و ئارمینە لەپالّ ئارتووش و خەلاتەکانیان کە کتێب بوو پێشانیاندا. کتێبی ئارمینە وەرگێڕاوی هەرمەنی سەفەرەکانی گالیوێر بوو و هی ئارسینە وەرگێڕاوی لۆرد فونتێلرۆی بچووك. نینا لە نێو ئەسکەمل دا دەجوولایەوە و دەیویست باخوێ و دەرفەتی نەدەبوو. چراکانی حەوشە کوژانەوە، پەردە لادرا و شانۆی سێندرێلا دەستی پێکرد.

ئارمەن و کیژێکی کە دیبووم و مانیا نێوەکەی پێگوتبووم و لەبیرم نەمابوو، دەوری شازادە و سێندرێلایان بە رادەیێ بە باشی گێڕا کە هەموو سێ جار چەپلّەیان لێداو تریقانەوە. ئارمەن بە شالّواری کێشداری رەش و سوخمەی ساز و بەرگ لێدرواو لەسەر شانۆ دا وادەهات و دەچوو کە هەر دەتگوت لە کۆشکێکی راسەقینە دا پیاسە دەکا و

کاتێ لە هەمبەر سێندرێلا سەری دانواند و بە یەکەوە سەمایان کرد گوتم «ئەوانــە لــە کوێ فێر بوونە؟» بیرم هاتەوە ئەوە هەر ئەو "مندالّە چکۆلّەکەیە"؟ بە خۆمم دەگــوت «ئەم گشتە سالّەکەی تێپەڕی؟»

شۆڤرلێت کە بە یەکەم سلف هەلّبوو ئارمەن و دووانەکان گوتیان «هەر بژی شــێوی گیان.» و ئارتووش گوتی «ئێستا لە یانە دا شێو دەخۆین و سەرکەوتوویی کیــژەکان و هونەرپیشە بوونی کوڕەکەمان جەژن دەگرین.» منالّ گوتیان «ئەی گیــان گیــان.» لــە تەکیاندا پێکەنیم و لەبیرم چوو بەلّێنم بە نینــا داوە هەرکــە گەیمــەوە مــالّ بــە شــوێن سیمۆنیانەکاندا بچم.

دووانــەکان هــەر لــە قوتابخانــەوە هــەتا یانــەی گولّســتان هــەر باســی جــەژن و کارەساتەکانی نێو ژوری جل داکەنــدن و پشــت شــانۆیان کــرد. هەرکــە باســی کایــەی براکەیان کرد ئارمەن گوتی «کارێکی هێندە دژواریش نەبوو.»

گەیشتێنی و لە دەرگەی یانە وەژوور دەکەوتین کە ئاڕمینە رووی دەمن کــرد. «بــە کاکی وێنەگرت گوت وێنەی زۆر بگرێ؟»

بە ناڕەحەتیەوە بە شوێن وەلاّمەوە بووم کە ئارتووش گوتی «ئەمن گــوتم.» و دەس لە ناو دەستی دووانەکە لەو لاو لەو لا هەلّبەز دابەزیان بــوو و بــەرەو تــەلاری چێشــت خۆری رۆیی. چەند ساتێ وەستام و لە پشتەوە را سەیرم کرد.

تەلاری چێشت خۆری خەلّکێکی زۆری تێدانەبوو. لە پشت مێز دانیشتبووین و ریزی چێشتمان دەخوێندەوە کە دەنگێکی نزم گوتی «شەوباش.» پاپێونی خاتوون نورولّلایی شینی کەم رەنگ بوو بە گولّی وردی قاوەییەوە.

ئاڕتووش هەستاوە و ئەسکەملی خولّق کرد و خاتوون نورولّلایی گوتی «نابمە هــۆی دەردیسەریتان؟ دیتم هاتن، گوتم سلاّوێکتان لێ بکــەم. خــەریك بــووم لەگــەلّ ئاغــای سعادەت بەرنامەی نوتقی هەینی داهاتووم رێك دەخست.» دەستی بە سەری دووانەکاندا هێنا و بە ئارمەن پێکەنی. پێم وابێ ئارتووش لە رووی ئەدەبــەوە بابــەتی نوتقەکــەی پرسی. خاتوون نورولّلایی گــوتی "مێــژووی مــافی ژن" و چــاوی لــەمن کــرد. بێشــك دەرفەتتان نییە، دەنا فرە پێخۆشحالّ دەبووین بهاتبانــە.» دیســان دەســتی بــە ســەری دووانەکاندا هێناو مالاّوایی کردو رۆیی.

که داوای چێشتمان کرد ئارمینە گوتی «دایە، مافی ژن یانی چی؟» ئارسینە دووپاتی کردەوە. «مافی ژن یانی چی؟» ریزی چێشتم دایەوە خزمەتکار و گوتم «ئەگەر گەورە بوون تێدەگەن.»

چاوم لە خاتوون نورولڵایی بوو کە لەبەر دەرگەی تەلاری کۆبوونەوە لەگەڵ ئاغای سعادەت دەئاخۆت. بیرم هاتەوە فانیلەو دامێنی منیش لە پارچەی جلی خاتوون نورولڵاییە. ئارتووش شتێکی گوت و منالّ پێکەنین. ئارمەن گوتی «دایە بیستت؟» گوتم «ئێستا دەگەرێمەوە.» و لەجێوە رابووم.

خاتوون نورولڵایی هەروەك چاوەنوارم بێ سەر لەنوێ بینینەوەی منی لا سەیر نەبووە. کاتێ پرسیم بۆ ئەنجومەنەکەیان چ کارێکم لە دەس دێ، تێم راما، بزەی هاتێ و گوتی «فرەکار، هەینی لەتەك یەکتر داخۆین.» گوتم «هەینی لەتەك یەك داخۆین» و زۆریامەوە لای مێز.

لەبەر دەرگەی ماڵ کە لە ماشێن دابەزین من و دووانەکان چاومان بریە ئەوبەر شەقام. ئارتووش شۆڤرلێتی دە کارێژ کرد و ئارمەن جلەکانی زستان و هاوین و پایز و بەهاری لە سندووقی پشتەوە دەرێنا. دەرگە ئاسنیەکەی حەوشەی جی چوار لەسەر پشتێ بوو.

ئارمینە سەبرێکی گوتی «دایە سبەی سەرێکی ئێمیلی بدەین؟»

ئارسینە بە پاڕانەوە گوتی «تۆ خوا ئیزنمان بدە سەری بدەین.»

قژی لوولی هەردوویانم لاواندەوە. «بێگومان سبەی سەریدەدەین.»

# ٤٧

کاتێ لەخەو رابووم رۆژ لە نەینۆکی مێزی ئارایشتی دابوو. بیرم کەوتەوە ئارتووش کە ویستبووی بڕوا لەبن گوێم دا گوتبووی «بنوو. خۆ منالّ ناچنە قوتابخانە.» دەستەکانم لە پشت سەرمەوە قولاپ کرد و دەکایەی رووناکی و نسێ لە نەینووك دا رامام. دەنگی جیکە جیکی پاساری یان لە حەوشە دەهات. بە دەنگی بەرز گوتم «ئیمڕۆ درەنگتر لە ئێوە رابووم.» و لەگەڵ خۆم پێکەنیم.

به هۆی جیکه جیکی پاساری یان بوو یا کایەی رووناکی لە نەینووك دا یـا فێنـك بوونی ژووری خەو بوو کە کەیفم ساز بوو.» هەرچی بوو خاس بوو. حـاڵم خـاس بـوو. مەلافەم وەلانا و رابووم.

دۆڵابم کردەوە. چاوم بەو جلانە دا گێڕا کە گەلێك جار لە ماڵەوە لەبـەرم دەکـردن. ئەوجار روانیمە ئەو جلانەی کە کەمتر لەبەرم دەکردن. جلێکی رکێفی گوڵدارم دەرێنـا کە چەند جار زیاتر لەبەرم نەکردبوو، چونکە دایکم و ئالیس گوتبوویان «سەر و سنگی زیاد کریاوەیە.» سەرم لەبەر ئاوێنە دایەنا و هەرتك دەستم لە یەکتر سوو. پێستم وشك نەبوو.

بەرەو چێشتخانە رۆیم و دێڕێکی شانۆی سێندرێلام بە دەنگێکی بەرز گوتـەوە کـە ئارمەن دوێ شەو بە جووڵانەوەی سەرو دەست بـە رێـوەی بردبـوو: «ئـەم کەشـخە بـە نازەکێیە دێ؟ ئـاه، کیـژە خەیاڵـەکانی مـن.» بـەرز پێکـەنیم و سـەرێکم لـە ژووری دووانەکاندا قەرەوێڵەکان کەسیان لەسەر نەبوو. سەرم بە ژووری ئارمەن داکرد. قەرەوێڵە بەتاڵ بوو. مێزی چێشتخانە سێ شەربەی نیوە بەتاڵی شیری لەسەر بوو. شەربەکانم کۆ کردەوە و ئەوە دەمکوت دەبێ لە کوێ بن کە هەرسێکیان وەژوور کەوتن.

ئارمینە گوتی «جی چوار کەسی لێ نییە.»

ئارسینە گوتی «نە ئێمیلی لە ماڵە، نە باوکی ، نە دایە گەورە.»

ئارمەن گوتی «پێم وابێ باریان کردووە.»

یەکێك لە شەربەکان لە دەستم بەر بۆوە سەر موزاییك.

دووانەکان قیژاندیان «ئەی!» و کشانە دواوە.

ئارمەن هاتە پێش «خۆ چیت لێنەهات؟»

گوتم «ئەمن چیم لێنەهات. ئێوە ئاگاداری خۆتان بـن.» گێسـك و خاکەنـدازم لـە سووچی چێشتخانە دەسدایە، بۆ کوێ چوون؟ بۆ چوون؟ کەی چوون؟ دووانەکان بە نـۆڕە دەئاخۆتن.

بێشك ئێمیلی زۆر نەساغ بووە، بردوویانەتە نەخۆشخانەی تاران.»

«ئەدی کوا شرە و برەکان؟»

«بەڵکو دایە گەورە نەساغ بووبێ.»

«ئەدی شرە و برەکان کوا؟»

بێگومان دوێنێ کە ئێمە چووینەتە جەژن باریان کردووە.»

ئارمەن دوو کوتە شووشەی لە عەردی راکرد و هاویشتیە سەتڵی زبڵ و بە دووانەکانی گوت «چەندە دەئاخۆن. هەتا بریندار نەبوونە هەڕۆنە دەرێ.»

ئارتووش ئێوارە کە هاتەوە هەر ئەوەندەی دەزانی کە ئێمیل دەستی لە کار کێشاوەتەوە. بۆچی دەستی لە کار کێشاوەتەوە یا چۆتە کوێ کەس نەیدەزانی.

شێومان دەخوارد کە تەلەفۆن زەنگی لێدا. ئارمەن دەرپەڕی. «ئەمن هەڵێدەگرم.» دووانەکان لە یەکتریان روانی و بە بێ دەنگی پێکەنین و کاتێ پرسیم «دیسان چ باسە؟» بە پێداگریەوە بە یەکەوە گوتیان «هیچ.»

ئارمەن زۆڕیاوە چێشتخانە و بە منی گوت «پوورە نینا.»

دەنگی نینا بە پێچەوانەی هەمیشە شاد و زەنگدار نەبوو «دیتت قوڕی کوێم وەسەری بوو؟ کوڕەتیوە بێ ئاگاداری لێیداوە رۆیوە و ویوڵێت سەر لە بەیانیەوە وەك شێتان لە ماڵدا دێ و دەچێ و دەگریە و جوێن بە زەوی و زەمان دەدا. شوکر کە گارنیك هەتا دووسبەی لە ماڵەوە نییە. بەڵام کە گەڕاوە چی؟ ئەگەر ئەم کیژە بەڵایەکی بە سەرخۆی هێنا وەڵامی دایکی چ بدەینەوە؟ تێماوم چ غەڵەتیەکی بکەم.»

هەوڵم دا ئەهوەنی بکەمەوە و پرسیم «ئێستا هەر بەڕاستی مەبەستەکە بەم رادەیە وەڕاست گەڕاوە؟» و زووەکی لە پرسیارەکەم بە ژیوان بوومەوە. ئەگەر مەبەستەکە هێندە راستی نەبوایە خاتوون سیمۆنیان ماڵ و ژیانی تێك نەدەدا و نەدەڕۆیی. نینا وتەکانی ئێمیل بە ویوڵێت و ویوڵێتی بە ئێمیلی بە وردی دەگێڕاوە و ئەمن بیرم لەوە دەکردەوە دایکە لەبەر ئەم کوڕە تا ئێستا چەند جار ئەم شار و ئەو شاری کردووە؟ هەموو جارێ هەر بەو رادەیە لە ناکاو بووە؟ نەبووە؟ کارێکی دروستی کردووە؟ کارێکی دروستی نەکردووە؟ ئەگەر ئێمیل لەگەڵ ویوڵێت زەماوەندی کردبا رەنگبوو خراپیش نەبوایە، بەڵکو خراپیش بوایە. نەدەبا خۆی تێهەڵقوتێنێ. رەنگبێ کوڕەکەش بناسێ و دەبوا خۆی تێهەڵقوتێنێ. دەنگی نینا لەو گشتە دەبێ و نابێیە رزگاری کردم. «سووفی چەند رۆژێك لە لای تۆ بمێنێتەوە؟ عیلاجم نییە دەبێ لەتەك ویوڵێت بچمە تاران»

گوتم دیارە کە سووفی لەلامان بمێنێتەوە و ئەگەر کارێکی ترم لە دەس دێ پێم بڵێت. نینا بە بێ وازی ماڵاوایی کرد و گووشی دانا.

گووشیم که دانا ئارتووش و ئارمەن لــە چێشــتخانه وەدەرکــەوتن. ئارمــەن گــوتی «شێوی گیان دیسان نەساغە، دکتۆری دەبەینــە ســەری.» و لەتــەك ئــارتووش چــوونه کارِێژێ. پالّم وەمێزی تەلەفۆندا و گوتم لە ناکاو هاتن و لەناکاو رۆیشتن. وەك بارانەی ئابادان کە هەتا دەهات پێت وابوو دەباری، ئیدی نەدەباری. گوتم خۆزیا کرابا رووداوی ئێمیل و ویۆلێت بە گوێی دایکم و ئالیس نەگاتــەوە. وازی رادەربڕینــەکانی ئــالیس و "ئەمن لە هەوەڵەوە دەمزانی" یەکانی دایکمم نەبوو. دەنگی ئاخۆتنی دووانــەکان لــە چێشتخانەوە دەهات.

«لەبیرتە گوتی تەماتە بە ئاغای ژۆرا دابدەین؟»

«ئا. چا بوو بە قسەمان نەکرد.»

«بەڵام خۆی پێیدا دا. پاشان بە ملی پۆلە هەشتەمیەکانیدا هێنا.»

«ئا. لە فراوێن خۆریشدا ئەسکەملی بە ئانقەست لە ژێر رووبینا دەرکێشا. پاشــان گوتی بە ئانقەست ئەم کارم نەکرد. بەڵام بە ئانقەست کردی، وەنیە؟»

«ئادی. بە ئانقەست کردی، کون کردنی راحەتیش هەر کاری خۆی بوو، وەنیە؟»

«ئادی، هەر لەمەڕ ئارمەنەوە لەتەك ئێمە بوو بە دۆست. راپۆنزێلی هەر هیچ خۆش نەدەویست.»

«حەیف بۆ جلە سوورەکەی راپۆنزێل کە وەبەر مقەستی دا. بۆ هێشتمان؟

«لەبەر ئەوە کە گوتی جلێکی کەشخە نییە.»

«جلە چەرمووە قۆڵ پف دراوەکەی خۆشی وەبەر مقەست دا.»

«فێری کردین لە حەوشەی قوتابخانە هاوار بکەین "مارگرێتا، هەر وەك چیتا."»

«کارێکی چەوتمان کرد.»

«کارێکی چەوتمان کرد.»

# ٤٨

منداڵەکان لەتەك سووفی لە ئەستێرك بوون و ئارمەن لە ماڵە هاوڕێکەی. چاوەڕێی دایکم و ئالیس بووم کە دوێ شەو لە تاران گەڕابوونەوە.

تەلەفۆن زەنگی لێدا. گووشیم راکرد و لە نەینووکی داڵانەوە روانیمە خۆم. خۆم لام وابوو یا تا رادەیەك گۆشتن بوومە؟ چەند جار گوتم ئەلۆ، بەڵێ و فەرموون و کەس وەڵامی نەداوە. گووشیم داناو دەرگەم لە دایکم و ئالیس کردەوە. دایکم دەم و چاومی رامووسی و ئالیس توند لە باوەشی گرتم و گوتی «چەند جوان بوویە. دەڵێی نەختێ گۆشتن بوویە. وەنیە؟ بە پێچەوانە من کز بوومە. چاوم لێکە.» و لە داڵاندا خولێکی تەواویدا. راستی دەگوت، لەڕ ببوو. نەمزانی زۆرتر لەبەر کز بوونەکەی سەیر مام یا لە چاك و خۆشی و ماچ و مووچە گەرمەکەی.

چووینە چێشتخانە و دایکم و ئالیس بەستە "پیرۆك و گاتا"کانی کە لە تاران کڕیبوویان نایانە سەر مێز. ئالیس حەجمینی نەبوو. قاوە جۆشەکەی لە دەستم وەرگرت و گوتی «ئەمن دروستی دەکەم.» قاوەی دروست کرد و دەستی پێکرد.

«لێبڕاوین هەر لێرە زەماوەند بکەین. کارتەکانی بانگێشتنم راسپاردۆتە چاپخانەی دۆستی ئاغای داوەتیان. بەڕاست، داوەتیان زۆری سڵاو بۆت هەبوو، مرۆڤێکی فرە خاسە. ئەگەر راینەسپاردبا کارتەکان بەم زووانە حازر نەدەبوون. کێکەکەش هەر لێرە رادەسپێرینە "نگرو". جا هەڵێدە بزانم لە تاران چیم کڕیوە.»

قاوە جۆشی لەسەر ئاور راکرد، نایە سەر پێشخان و رووی تێکردم. دەستەکانی لێك کردەوە، سەری لار کردەوە و بزەی هاتێ. «جلی بووك.»

دایکم دایە پێکەنین و ئەمن بە دڵ پێکەنیم.

ئەوجار من بووم کە چوومە لای خوشکم، باوەشم پێداکرد و ماچم کرد و گوتم «زۆر زۆر پیرۆزە.» بەیانی بە داڕشتنی بەرنامەی رێوڕەسمی زەماوەند و نووسینی ناوی میوانەکان تێپەڕی.

سووفی و دووانەکان کە بۆ فراوێن گەڕانەوە، ئالیس باوەشی بە هەر سێکیان داکرد و گوتی دەبێ ببنە پێخەسوو و جلی شین و چیرەیی لەبەر بکەن.

ئارمینه گوتی «پووری، لەپێشدا تۆ زەماوەند دەکەی یا پووره ویۆلێت ؟» و لەگەڵ ئارسینه و سووفی به چاوەڕوانییەوە له ئالیس رامان. ئالیس و دایکم لەمن روانین.

به منه منەوە گوتم «زەماوەندی پووره ویۆلێت وەدوا کەوتووە، واتا ــــــ »

سووفی کارەکەی خراتر کرد. «هەر بۆیه پووره ویۆلێت دوێنێ و پێرێ هەر دەگریا؟»

ئارمینه و ئارسینه به دوو قۆڵی گوتیان «دەگریا؟»

سووفی چاوی لەمن کرد. دڵەڕاوکێی گوتن و نەگوتنی بوو و ئاخری هەر گوتی.«هەم دەگریا، هەم دەیگوت گشتی خەتای ئەم عەجووزەیه*.»

ئارمینه گوتی «عەجووزه یانی چی؟»

ئارسینه گوتی «یانی کورتەبالا.»

ئالیس له جێوه رابوو. شیرینی بۆ مندالان ده قاپی کرد و گوتی «واتای عەجووزه کورتەبالا نییه، گوتنی هیچ کامێکیشیان جوان نییه. شیرینی بەرن لەتەك بووکڵەکان ماڵماڵێن بکەن.»

کاتێ له چێشتخانه دەچوونه دەر، ئارسینه دەستی دەملی سووفی کرد. خراپیش نەبوو. ئاخری زەماوەندمان هەر هەیه. جلی پێخەسووش لەبەر دەکەین. تۆش که له لامان دەمێنیەوە. وەنیه ئارمینه؟»

دایکم چاوی لێم کرد. «چیه چ باسه؟» ئالیس پالی وەمێز دا.

گێڕامەوە. هەر که بێدەنگ بووم دایکم گوتی «هەر له رۆژی هەوەڵەوە نەمگوت ئەم ئافرەته شێته؟ نەمگوت کوڕەکەشی هەر وەك خۆی شێته؟ درۆ دەکەم بڵێ درۆ دەکەی.»

ئالیس به بەنەکەی دەوری بەستەی گاتاوە خەریك بوو. «لەخۆوە بوختانێ به خەڵکی مەکە. خۆ ئێمه نازانین چ قەوماوە؟ هەرچی بێ پێوەندی به ئێمەوە نییه، بەڵام ــــــ ویۆلێتی بەستەزمان؟»

چاوم له ئالیس کرد، دەتگوت یەکەمجار بوو دەمدی. لەو دەمەوە خوشکم دەناسی وەك ئاو خواردنەوە بوختانی به خەڵکی دەکرد و له بابەت چکۆلەترین کاروباری ژیانی هەمووان رای دەردەبڕی و حوکمی دەدا و ئێستا - «بوختانێ به خەڵکی مەکە؟ پێوەندی به ئێمەوە نییه.» و «ویۆلێتی بەستەزمان؟» هەستم کرد یووپم فره خۆشدەوێ.

تەلەفۆن زەنگی لێدا و ئارمەن که نەمزانی کەی زۆریابۆوە ژوورەکەی دەرپەڕیه دەرێ که «هەڵمگرت» پاشان هەتا چێشتخانه «ئاغا هولەندییەکه لەگەڵ پووره ئالیس.»

ئالیس دەستی لە ملی ئارمەن کرد و کوڵمەی راموسی. «یەکەم ئەوەکە سلاوت قووت داوە، دووهەم ئەوە کە ئاغای هوڵەندی یانی چی؟ لەوە پاش دەڵێی «ئاپۆ یووپ.» و بە پێکەنینەوە بەرەو دالان رۆیی. ئارمەن چەند جار گوتی «ئاپۆ یووپ.» پێکەنی و دایە گەورەی راموسی. دایکم کوڵمەی نەوەکەی لاواندەوە. «خۆزیا زەماوەندی تۆشم دیبا.»

# ٤٩

نینا لە زەماوەندی ئالیس دا یارمەتیەکی باشی دام. لە خۆوە لەوە دەترسام لە بابەت ویوڵێتەوە بدوێ. دوای گەڕانەوەی لە تاران تەنانەت وشەیەکیش باسی ویوڵێتی نەکردبوو.

شەوی بەر لە زەماوەند بوو و ئارتووش و گارنیك منداڵەکانیان بردبووە "ئەنێکس" ماسی بریشتە بکرن. لەتەك نینا لە پشت مێزی چێشتخانە دانیشتبووین و بەستە شیرنیاتی یادگاریمان بۆ میوانەکانی زەماوەند دروست دەکرد. شیرنیانە رەنگیەکانمان دەنێو ئەو تۆڕە چوار گۆشە چکۆلانە دەکرد کە دایکم گوڵچن کردبوون و سەری تۆڕەکانمان بە بەندی ساتێن گرێدەدا. لە سەرێکی بەندەکە نووسرابوو "ئالیس و یووپ" و لە سەرەکەی تر رێکەوتی زەماوەند چاپ کرابوو.

ئالیس گوتبووی «شەو زوو بخەوین هەتا سبەی بە دەماخ بین. ئەگەر بخەوم.» و دایکیشم یووپ گوتەنی کە هەموو پاژگەلی رێورەسمی زەماوەندی پێ بەرێوەچێ بوو بریار بوو "سوور و سەوز" بدرووی. دابی هەرمەنییەکانی جولفا بوو کە لە رێو رەسمی زەماوەند دا دوو نەواری پانی ساتێنی سوور و چەرموویان بەسەر شانی بووك و زاوا دادەدا و قەشە دوعای پیرۆزی دەخوێندەوە، برازاوا شوێنی نەوارەکانی چەند جار دەگۆڕی. نەواری سەوز نیشانەی بەختەوەری و نیعمەت بوو و نەواری سوور نیشانەی ئەوین. ئارتووش بە بێ هیچ پرتە و بۆڵەیەك رازی ببوو ببێتە برازاوای زەماوەندی ئالیس و یووپ.

نینا شەربەتی ئالوو باڵووی دەخوارد و گۆرانییەکی زەمزەمە دەکرد.

ئاخری تابم نەهێنا. «لە ویوڵێت چ باس؟»

جرتێکی راهێلاّ و شانی هەڵتەکاند. بەندی بەستەی شیرنیاتی قایم کرد و بەستەی دانایە نێو قولێنەیەکی کە گوڵی دەسکردمان بە چوار دەوریەوە لکاندبوو. شەربەتی لەبن هێنا و جەمەدەکانی دە شەربەکەدا هەڵسووڕاند. «هەتا زیندووی شت فێر دەبی. وەك هەمیشە هەرا هەرام دەست پێکردبوو و لە خۆڕا بە پەرۆش بووم.» شەربەی نایە سەر مێز و یەکێ لە تۆڕە چوار گۆشەکانی راکرد. «کە چووینە تاران دوو سێ رۆژ فرمێسکی هەڵوەراند و فەغفووریەکانی دایکی کلۆڵی شکاند هەتا براکەی هاوسێی نهۆمی سەرەوەی دی. سەر و کەلارەی کوڕەکە پەیدا بوو، ئەهوەن بۆوە و ئەیزەن بوویەوە هەمان ویوّلێت کە دەڵێن بەستەزمانەی چ پاك و بێگەرد و بێ تاوان. هەروەها تیگرانم ناردە خەوگەی زانستگا. مەترسی ماڵە پووریّ گیان فرە زۆرتر بوو لە مەترسی خەوگە، یەکێ لەو رووبانانەم پێ بدە.»

یەکێ لە رووبانەکانم پێدا و نینا گوتی «لەبیرتە گوتم ویوّلێت کەمێ شێوەی تۆ دەدا؟ دایکت گوتەنی، پێم بڵێ کەر.» و دایە پێکەنین.

بەستەی شیرنیاتم نایە نێو قولێنە و گوتم «نا، پێم بڵێ کەر.»

نینا رووبانەکەی لە دەوری بەستەکە گرێدا و لە پەنجەرە زیت بۆوە. پێنەدەکەنی. لەو شوێنەوە کە دانیشتبووین گوڵە نۆکەکان بە جوانی نەدەبینران. گوتی «وتەی دایکم وەدیهات. لات وابوو دوای رۆیشتنی ئالیس ـــــ »

روانیمە پەنجەرە. ئەم چەند حەوتووە هەوڵم دابوو بیر نەکەمەوە کە دوای رۆیشتنی ئالیس ـــــ بە رووبانی بەستەی نێو دەستمەوە خەریك بووم. «نازانم.»

نینا بەستەی شیرنیاتی نایە نێو قولێنە. «لەگەڵ دایکم نەئاخۆتی؟»

بەستەی شیرنیاتم نایە نێو قولێنە. «نا هێشتا.»

ئەیزەن لە گوڵە نۆکەکان راما. «باشە، رەنگبی دوای زەماوەند، ها؟»

چاوم لە بەستەکان کرد و سەرم بادا. «دوای زەماوەند.»

چەند رۆژ لە زەماوەندی ئالیس و یووپ و چوونیان بۆ هۆڵەندا تێدەپەڕی.

یووپ لەکاتی بەڕێکردنیاندا، لە فرودگا کوڵمەمی راموسی و گوتی «کلاریس ، بۆ ئەو زەحمەتانەی کێشاوتە سوپاست دەکەم. دڵنیابە ئالیس بەختەوەر دەکـەم. دایکـم و پوورم ویستوویانە ئالیس بەختەوەر کەم.» رۆژی زەماوەند، مەزنترین قولێنەی گوڵ لە لایەن دایکم و پووری یووپ پێشکەش کـرا، مێلاقـەی سـوور و چـەرمووی هولەنـدی، ئارتووش گوتی «لەم کوێرە دێیەوە ئەم گولانەیان چۆن ناردۆتە ئابادان؟»

لەتەك نیناوە لەسەر جولانە دانیشتبووین، ئارمەن لەبەر دەرگە بە دووچەرخەکەیەوە خەریك بوو. دووانە و سووفی خۆشارکێنێیان دەکرد، سووفی گوتی «لەپێشدا کـێ چـاوی بنووقێنێ؟ پشك بخەین.» هەرسێ لە هەمبەر یەکتر وێستان و سووفی لـە سـنگی هـەر سێکیانی دا و خوێندیەوە «ئان ـــ مان ـــ ناوارا ـــ دوو ـــ ئیسکاچی ـــ »

نینا گـوتی « ئـاخری نـەمزانی بـۆ وێنـە ئـەم شـیعرەی لـەکاتی پشـك خسـتن دا دەیخوێننەوە یانی چی؟» پاشـان هێمـای کـردە چێشـتخانە. «کـەوابوو لەتـەك دایکـم ئاخۆتی. وەنیە؟» قژی چەرمووی دایکم لە پەنجەرەی چێشتخانەوە دیار بوو. گوتم «ئا.»

کیژەکان رایانکردە لای حەوشەی پشتەوە. نینا لاقێکی لە جۆلانەدا و جوولاندیەوە. ئارتووش پرتەی نەهات؟» روانیمە دارە ئەرخەوان یا دارە بەن یا زمانەگای سێهەم کـە سەردەمێك بوو ناوی نەبوو. بە دوای هێرشی کوللەکان و چووقەرەدانی سەرلەنوێ، زۆر بە باشی رۆحی وەبەر هاتبووە و لە دارەکانی ئارمینە و ئارسینە زیاتر گوڵی کردبـوو. بە پێ لە جۆلانەمداو جوولایەوە. «بۆڵەی لێوە نەهات هیچ خۆشی پێشـنیاری کـرد.» نینا داهاتەوەلام. «بەڕاستی؟»

شەوی بەر لە زەماوەند هەتا ویستبووم وتەی دایکم و تەنیاییەکەی دوای رۆیشـتنی ئالیس بێنمە گۆڕێ، ئارتووش کە خەریکی هەڵواسینی شـاڵوارەکەی لـە دۆلاپ دابـوو گوتبووی «دایکم لە کەیەوە دێتەلامان؟»

نینا قاقا پێکەنی. «ئەمن کە سەرەدەرێم لە کاری شووەکەی تۆ دەرنەکرد. جارێـك ژەقنەمووت، جارێکیش بەم رادە ـــ » دەنگی فیکەی ماشێنی گارنیك لە شەقامەوە هات. نینا گوتی «تەنیا بە راڕایی و بۆڵە بۆڵەکانی دایکم ، خوا کۆمەکت بێ.» پاشان

قیژاندی «سووفی راکە، باوکت هات.» وێستاو بەرەو باریکە ڕێگەکە لەنگاندی. «وەی! پێم. دەخاوکەوت.» رووی دە پەنجەرەی چێشتخانە کرد. «خاتوون و سکانیان، ماڵ ئاوا.» ئەوجار زۆریاوە لای من و سەبرەکی گوتی «کەوچکێکی چای خۆری بۆڵە بۆڵ و راڕایی رەنگە خراپیش نەبێ، ها؟» لە جۆلانە دابەزیم و وەڕێکەوتم و گوتم «کەوچکێکی چایخۆری یا سەد ئەسکۆ؟»

دایکم سەری لە پەنجەرە کێشا دەرێ. نینا بۆ کوێ؟ لێرە بە. پلاوە سوورەم لێناوە.»

دووانەکان کە بە ئارەقەی سەرو چاویانەوە لە تەك سووفی لە حەوشەی پشتەوەڕا هاتبوونەوە هەڵبەز دابەزیان بوو. «سووفی لە لامان بمێنێتەوە.» پوورە نینا تۆخوا با سووفی لای ئێمە بمێنێتەوە.»

سووفی نقاندی «پلاوە سوورم فرە پێخۆشە.»

نینا دە منداڵەکان راما. پاشان چاوی لە من کرد کە گوتم «ئەتۆ بڕۆ بە شت کڕینەکەت رابگە.» نینا دیسان روانیەوە منداڵەکان. «لە دەس ئێوە منالە وردەکان. لە پێڕێ شەوەوە لەتەك یەکتر بوونە. بەس نییە؟» ئەوجار بە دایکمی گوت «دەبێ گەڵێ دیاری بۆ تاران بکڕم دەنا سوورە پلاوی ئێوە قسەی لەسەر نییە.» ئیستانبوڵی پلاو یا ئەرمەنیەکان گوتەنی "سوورەپلاو"ی دایکم بەراستی قسەی لەسەر نەبوو.

هەتا بەر دەرگە ئاسنیەکە لەتەك نینا چووم و دەستم بۆ گارنیك راوەشاند. ئارمەن کە هێشتا هەر خەریکی دووچەرخە بوو، گوتم «چنا نەبۆوە؟» سەری لەقاند. «دووچەرخەی سەردەمی بووق کەی بەم زوانە دروست دەبێتەوە؟» گوتم «سەردەمی بووق یانی ساڵی پارەکە؟» چاوی لێکردم. «ساڵی پار واتا سەردەمی بووق.» و پێکەنی. قژی بە نێو چاوانیدا هاتبووە خوار.

هەتا زۆریامە حەوشە سووفی و دووانە لە ماڵ وەدەر کەوتن. ئارمینە کتێبێکی بە دەستەوە بوو. «دایە، کۆتاییەکەی دەخوێنیەوە؟» ئارسینە گوتی «خۆت بەڵێنێت دا وەیخوێنی.» سووفی گوتی «پووری دوێنێ بەڵێنت دا. ئافرەتە و بەڵێنی.» هەرسێ پێکەنین و چوار قۆڵی خۆمان لە جۆلانەدا جێکردەوە.

دوایین لاپەڕەی لۆرد فۆنێتلرۆی بچکۆلەم خوێندەوە و کتێبەکەم وێکنا و سووفی گوتی «کوڕە چکۆڵەی فەقیرۆکە.»

ئارسینە گوتی «بۆ فەقیرۆکە؟»

ئارمینه گوتی «کۆتاییەکەی خۆش بوو.»

سووفی گوتی «ئا، بەڵام سەرەتاییەکانی زۆری چەرمەسەری کێشا.»

دەنگی تەلەفۆن لە دالانەوە هات. دووانە و سووفی چاویان دە ئارمەن بڕی و هەرکە بینیان نابیسێ، ئارمینە رابوو و رایکردە لای ماڵ. سووفی گوتی «راوەستە،» بە شوێن ئارمینە دا رایکرد. ئارسینە لە بەرگی کتێبەکەی نواری و گوتی «خۆزیا کۆتایی هەموو چیرۆکەکان بە خۆشی تەواو دەبوو.»

ئارمینە لەبەر دەرگەی ماڵەوە هاواری کرد «ئارمەن. تەلەفۆن، ژاسمەن.»

سووفی دووپاتی کردەوە «ئارمەن، تەلەفۆن. ژاسمەن.»

ئارمەن دووچەرخەکەی بەرداوە و بەرێگە باریکەکەدا رایکرد و چووە ژوور.

زۆریامە لای ئارسینە. «ژاسمەن؟»

ئارسینە جۆلانەی بە پێ جوولاندەوە، چاوی لێم کرد و پێکەنی. «لەبیرت نییە؟ سێندرێلا.» پاشان کتێبەکەی راکرد. لە جۆلانە دابەزی و رایکردە لای ئارمینە و سووفی کە لەبەر دەرگەی ماڵ هێمایان دەکردێ «وەرە.»

دەنگی دایکم لە دالانەوە هات. «دیسان بە پێڵاوی قوڕاوی هاتنە ژوور؟»

لەم بەرەی دەرگە تۆڕیەکەوە روانیمە قەڵافەتە لەڕو زەردەڵەکەی کە بە قژی چەرمووو جلە رەشەکەی دالانی گێسك دەدا. مانەوەی دایکم لە لامان بێشك یارمەتیەکی مەزن بوو. یارمەتیەکی مەزن بوو و بەم پێیە ـــ دایکم قالیچەکەی سەر عەردی دالانی هێنابووە دەرەوە و دەیتەکاند.

نەرمە بایەکی دەهات کە بۆ ئەو سەردەمی ساڵ لە ئابادان سەیر بوو. جۆلانەم بە پێ جوولاندەوە. خەریك بووم بیرم لەوە دەکردەوە بۆ سەفەری تاران چ جلگەلێك رابکەم و سەوقات چی بکڕم کە پەپوولەیەك بە بەرچاومدا تێپەڕی. پەولەیەکی خاڵخاڵی قاوەیی. تا هاتم بڵێم «پەپوولەیەکی چەند جوان و کەشخەیە،» یەکی دیکەم دی و پاشان یەکی تر و هەر حەوت هەشتیان چوون نیشتنە سەر گوڵە سوورەیەك.

گوتبووی «پەپوولەکانیش کۆچ دەکەن.» دە ئاسمان رامام. ئاسمانێکی شین و تەنانەت بێ هیچ پەڵە هەورێك.

# فەرهەنگۆك

**ئاوزوونە:** ئاغزوونە. سەگەك

**ئەستێرك:** کانی . حەوزێکە ئاوی کانی یان کارێزی تێدا کۆدەکرێتەوە.

**ئەسکەمل:** سەندەڵی

**ئەنبووژەنی:** مادی

**بانهەڵبان:** بالاّخانە

**بڕپەند:** کارتیخ. مۆرەت

**بڕووسك:** کەمێ. تۆزقاڵێ

**برینگەری:** جەڕاحی

**بڕۆکە:** کەمێك ، نەختێ

**بژار:** گیای خراپ لە ناو زرعات. دانەی بێگانە لە ناو دانەوێلە. وجین

**بۆینباخ:** کڕاوات

**بوورانەوە:** دڵ لەخۆ چوون

**بەدمەقاڵ هاتن:** بە کێشە هاتن

**بەرشێو:** بەرکۆڵ. عەسرانە

**بەزەك دان:** ئارایشت . رازانەوە. تیف تیفە دان

**بەندەوار:** ئاشق، ئەویندار

**بێرە:** جۆرە کلاّوێکە بێ لێوار کە لە پارچەی ئەستووری چێدەکەن.

**پاژی کردن:** توێکڵ لێکردنەوە. سپی کردن

**پاکار:** بەردەست ، شاگرد، نوچە

**پرتاندن:** بۆلاّندن. بۆڵە بۆڵ کردن

**پشکۆژ:** دوگمە

**پۆشناخ:** خۆش تیپ

**پۆنچیك:** چەشنێ شیرنیات

**پەڵك:** سپیدار. چنار

**پیتاك:** باج و خەراجی دەوڵەت.

**پێسیر:** یاخە. یەخە. بەرۆك.

**تەبەق:** مەجۆعمەی داری

**تەپلەك:** ژێر جگەرە

**تەتەڵە:** لەوح. پارچە تەختە یا بەردی پانکەڵە بۆ لەسەر نووسین.

**تەڕپۆش:** خۆش پۆش

**تەمراندن:** کوژاندنەوەی ئاور

**تێخوڕین:** گوڕاندنە سەر

**جاجك:** بنێشت.

**جەخت:** پێداگری. سوور بوون لەسەر کارێ

**جەرگە:** نێوەڕاست. ناوەند

**جەمەد:** سەهۆڵ.

**خورتی:** بە زۆری

**خەریتە:** نەخشە.

**خێسە کردن:** چەپ چەپ لێ ڕوانین ، بە گۆشەی چاو ڕوانین.

**خێواندن:** لێدان

**دۆدمام:** ئامۆزا، کچ مام

**دۆژە:** جەهەننەم

**دۆلاب:** گەنجە. ئیشکاف . کۆمێد

**دەژ:** دەکار نەکراو. دەس لێنەدراو. بێکر

**دەسکەلە:** بۆتڵی. شووشەی دەم تەنگ

**دەلال:** جوان و خوێن شیرین

**دەمەوەڕ:** زۆر وێژ

**دین:** شێت

**دیوارسمە:** شوێنی هەڵکەندراو لە دیوار بۆ دابەشینی سیمەکانی کارەبا، دارکوب.

**ڕاژە:** شی کردنەوە. مانا لێدانەوە.

**ڕیچ بوونەوە:** خۆ گرژ کردن ، مۆڕ بوونەوە.

**زەخت:** فشار

**ژاڵە:** لوورك ، خەر زەهرە

**ساپیتە:** میچ، سەقف

**ساکۆ:** رووپووس

**سەردڕ:** رووپۆش.

**شات شات مێرسی شات شات لاو:** هەرتك بە واتای زۆر زۆر سوپاس هاتووە.

**شامات:** دەشتی شۆرەکات. شۆرەزار

**شڵە:** سووری کاڵی پنۆك پنۆك. بەڵەکی سوور وسپی

**شڵەپەتە:** شل و شەوێق

**شەکرۆکە فرۆشی:** شیرینی فرۆشی

**شینیۆن:** چەشنێ رازاندنەوەی قژ. لوول دان و کرژ کردنی قژ

**عەجووزە:** پیرێژن.

**فەغفوور:** چینی

**فەقیانە:** ئەنگوچك. لەوەندی ، باسك ، ئاستین، کەلانکوچك

**فۆفێل:** دارێکە لە رەگەزی خورما لە شوێنی گەرمی وەك هیندوستان دەڕوێ.

**قازاخ:** پاك و خاوێن. زەریف. پەسند

**قوڵینە:** قەرتاڵە، تریان.

**قەرەوێڵە:** تەختی لەسەر نووستن.

**قەڕنیز:** هێڕە، ئەو دیوارەی لە سەرەوەی دەرگە و پەنجەرە وەك سابات دروستی دەکەن.

**قیڕات:** پاژێك لە شەش پاژی مسقاڵ

**کاردۆژە:** دارکۆڵین بە تیخە. کەندەکاری

**کرۆشتن:** کرۆتن. داکرۆشتن. کلوجیدن

**کڵاو کۆپی:** کڵاوی لێوار داری ماڵی سەفەر

**کۆلێت:** کۆڵە. کۆختە. هێلانە مریشك

**کەوگ:** شینی کراوە. ئاچغ — خۆڵەکەو

**کێش:** قورسایی . وەزن

**گاو گەردوون:** قوربانی، سەربڕینی ئاژەڵ بۆ پێشوازی لەپیاو ماقووڵ

**گووب:** بۆشایی لاشەوێلکە، ئاوساندنی گووپ بە پف

**گەردانە:** ملوانکە، گەردن بەند

**گەردن بەس:** فوکۆل

**گەردوونە:** عارەبانە

**گەمشۆ:** گێژ، حۆل، زۆرانباز

**گرێد:** پلە و پایە

**لاپیتە:** پێشکانی گیا کەندن. بێڵچەی گیاکەندن.

**لاجانگ:** نێوان رومەت و ئەستۆ

**لانەواز:** بەدبەخت ، بێ کەس و ناز شێواو

**لیتاو:** قوڕ و چڵپاو

**مانگی هەنگوین:** ماهی عەسەل

**مژوول:** خەریك بوون. سەرگەرمی کار

**مۆرتك:** دارە کۆنار. دەوەنێکی بۆنخۆشە.

**نك:** لە لا. لەکن

**نووکاندن:** بۆڵە بۆل کردن.

**نەینووك:** ئاوێنە

**وردئاژن:** پەیجوو، کۆڵەرەوە. بە شوێن کەر. کونجکاو

**وەردانەوە:** هەڵگەڕاندنەوەی گڵ، دووبارە کێڵانەوەی زەوی.

**هار و هاجی:** بزۆز و ئۆقرە نەگر. بازیگووش

**هۆرك بین:** گەردبین. زەرەبین

**هۆلا هۆپ:** چەشنێك لەیستۆکی منالآنە

**هەڵمات:** مەڕ مەڕ. تیلە. کەللا

**هەورەبان:** پلەکانی سەر داپۆشراو بۆچوونە سەربان. کۆماج. راپێللە.

**یۆیۆ:** چەشنێك لەیستۆکی منالآنە.